# یاخی

نووسینی: یەشار کەمال
وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ فارسی: حەمید ئارەش ئازاد
و: رەسووڵ سوڵتانی
دەرهێنانی هونەری : عەلی خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
نرخ: (٧٠٠٠) دینـار
تیراژ : (١٠٠٠) دانـە
شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٠٢)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێ دراوە.

**لە بلاوکراوەکانی:**

**خانەی ئاوێر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە**

**ژمارە (١٧١)**

# یاخی

نووسینی: یەشار کەمال

وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ فارسی: حەمید ئارەش ئازاد

و: رەسووڵ سوڵتانی

ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە:

ئەم هاوڕێیانەم:

عومەر باڵەکی

برایم چووکەڵی

سمایل بازیار

رزگار حەبیب زادە

سەلاح شەشە



"گروبانِ* حەسەن" دەتگوت دەنکە گەنمێکی درشتە و لە نێوەڕاستەوە لەتت کردووە. سمێڵە درێژەکەی، خەنەیی بوو. لەگەڵ پێنج سوار، وەك بای شەماڵ هاتنە نێو گوندی "ئاپاسورات"ـەوە. ئەسپەکان کەفیان بە لالغاویدا دەهاتە خوارێ و سەرشانیان شەڵاڵی ئارەقە و هەتا ئەژنۆشیان قوڕاوی بوو. گروبان حەسەن سەری ئەسپەکەی بەرەو ماڵی "ئەحمەدئەفە" وەرسووڕاند. هانکە هانکی بوو. "ئەفە" هەر گوێی لە زرمەی ناڵی ئەسپەکان بوو، هاتە دەرێ. کە چاوی بە گروبان کەوت، زەردەیەکی هاتێ. زۆری خۆش دەویست. گروبان حەسەنی بە پیاوێکی زیرەك و لێزان دەزانی. لە سەردەمی یاخیگەرییەکەیدا، (گروبان) گیانی خۆی لەسەر بەری دەستی دانابوو و

وەشوێنی کەوتبوو. هەر خۆی دەیزانی گرویان حەسەن چیی بەسەر هێناوە، بەڵام کە لە چیاکان هاتە خوارێ، وا بوونە برادەر، موویان لە بەینەوە نەدەچوو.

ئەو کات مەسەلێك لە نێو خەڵکیدا باو بوو کە دەیگوت: "عوسمانلی بۆ متمانەی نابن. " ئەحمەدئەفە ئەوەی دەزانی. ئەو مەسەلەیە درۆ نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ گرویان ببووە برادەر.

لەو کاتەوەی لە شاخ هاتبووە خوارێ، لەگەڵ گرویان حەسەن زۆر یاخییان راو نابوو. پێکەوە سینگی خۆیان بە گوللەوە نابوو. دۆست بوون. پەیمانی برایەتی و دۆستایەتیان لە نێواندا بوو.

ئەحمەدئەفە هەرای کرد:

- چۆنی گرویان؟

- شپرزەم. زۆر بەپەلەم.

بە پەلە دابەزی. باوەشیان بە یەکتریدا کرد.

- زۆر خەفەتبارم.

- چ بووە براله؟ چ قەوماوە؟ قەتم ئاوا شڵەژاو نەدیوی.

گرویان رەنگی بە رووەوە نەمابوو. دەتگوت دەستیشی دەلەرزن. وەك مەستان لەتری دەبرد و سەرەنگرێ دەبوو. وەژوور کەوت و دانیشت. ئارەقە لە بەری پێی دەچۆڕایەوە.

لەو کاتەدا لە ژوورەکەی دیکەوە دەنگی منداڵێك هات. گرویان رەنگێکی هێنا و برد و زەردیەك نیشتە سەر لێوی. گرویان دەستی لە گیرفانی

******* پاخر *******

یۆنیفۆرمەکەی نا. دراوێکی زیوی دەرهێنا و لە مستی منداڵەکەی نا. منداڵە پارەکەی وەرنەگرت. ئەحمەدئەفە گوتی:"

گروبان، کە مەمەدی ئێمەت دی، رەنگت گۆڕا. دەڵێی زۆرت خۆش دەوێ. مەمەدی منیش تۆی خۆش دەوێ. ئیشەڵا بۆخۆی دەبێتە شێرەکوڕێك.

گروبان وەڵامی داوە:

ـ دراوەکەش وەرناگرێ. بەو حاڵەشەوە زۆرم خۆش دەوێ.

ئەحمەدئەفە بە کوڕەکەی گوت:"

ـ مەمەد گیان، وەریگرە کوڕم. دەستی گروبان مەگێڕەوە، خۆ بێگانە نییە، مامی خۆتە.

کوڕە دیسان دراوەکەی وەرنەگرت. گروبان حەسەن دەستی گرت و لە تەنیشت خۆی داینیشاند و دەستی بەسەریدا هێنا. هەر جارێکی دەهات وای دەکرد.

لەو کاتەدا جەندرمەکان وەژوور کەوتن. ئەوان ئەسپەکانیان بردبووە گەوڕ و بەستبوویاننەوە. هەر کامەیان توورەکەیەکیان بە دەستەوە بوو. یەکێکیان توورەکەی ئەسپەکەی گروبانی هێنا و لە تەنیشتی داینا. گروبان حەسەن دەستی لە توورەکەکە نا و لەسەر خۆ جووتێ پێڵاوی هێنا دەرێ و کڵاوێکی چەرمیی لەسەر مەمەد نا. پێڵاوەکانی بە دەستی خۆی کردە پێی مەمەد.

ئەوجار پێکەنی و لە حاڵێکدا سڵاوی سەربازیی لە مەمەد دەکرد، گوتی:"

ـ مەمەد گیانی خۆم دەبێتە عەقید. چەندەشی لێ دەکاڵێتەوە. ماشەڵڵا.

## ******* پلخو ******

هەتا هاتبایە، دیارییەکی بۆ مەمەد دێنا. گروبان بەو یۆنیفۆرم و جزمە بریقەدارانەیەوە لە بەرچاوی مەمەد پاڵەوانێك بوو. لە هەموو پیاوان پاڵەوانتر.

شتی دیکەشی لە توورەکەکە دەرهێنا. کۆمەڵێك دیاری بوون ئەو ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکەی هێنابوو. کە دیارییەکانی دانا، کچۆڵەیەك هات و بە توورەکەکەوە هەڵیگرتن و بردنی.

هەر کاتێك گروبان حەسەن دەهات، مەمەدیش دەهات و لە تەنیشتی دادەنیشت و ورد ورد گوێی دەدایە قسەکانی گروبان و باوکی. نەك هەر گروبان، هەر میوانێك دەهات، حەسەنیش دەهات و لە نێوان میوانەکە و باوکی دادەنیشت. لەو کاتانەدا هیچ قسەی نەدەکرد. هەتا نیوەی شەوێ بێدەنگ دادەنیشت و هەر گوێی رادەگرت. ئەحمەدئەفە رووی کردە گروبان و گوتی:

ـ دەی براله. قسه بکه بزانم چت لێ قەوماوه. زۆر نیگەرانت کردم. گروبان ئارا و قارای نەبوو. دەتگوت ناتوانێ لە جێی خۆشی هەستێ. زاری کردەوە. قسەیەکی کرد: "ئەفەی من. " و بێدەنگ بوو.

ئەفه سەیرێکی نێو چاوە پەرۆشەکانی کرد.

ـ بلێم چی ئەفە. چۆنت تێگەیەنم. لەوەتەی شمەکم لەبەر کردووە، شتی وام بەسەر نەهاتووە. زۆر شەرم دەکەم بەکەسی بڵێم. هەر بەراستی شەرمەزارییە.

ـ دەی باشە. پێم بڵێ بزانم چ بووە. خۆ نابێ شەرم لە من بکەی.

## ******* پلخو *******

- وەڵڵاهی براله، بەیانی بوو کە هاتینە دەرێ. دەمەویست بێمە لات. گوتم با بچم و چاوێکم بە ئەحمەدی برام بکەوێ. هەر وا سەعاتێك دەبوو و نەدەبوو کەوتبووینە رێ. لە پڕێکدا چەند کەس لە پێشمانەوە وێکڕا تەقەیان لێ کردین. خراپ لە داو کەوتبووین. لە ترسی گولله کشاینەوە. پێم وایە یاخییە یونانییەکان بوون. نەمتوانی راویان بنێم. چونکە خەریك بوو دەهاتمە لای تۆ. نەمویست بڕیارەکەی پێشووم بگۆڕم. گوتم وا باشترە لە پێشدا بچم و چاوێکم بە ئەفە بکەوێ. دوایش پێکەوە دەگەڕێینەوە و مشوورێك لەو نامەردانە دەخۆین. شەرم دەکەم بە گیانی ئەفە. بەخۆمم گوت:"باشە حەسەن، ئەوە پیاوەتییە؟ ئەوەی تۆ کردت، نامەردی نییە؟ ئاگرم لە هەناوی بەربوو. بیر لەوە دەکەمەوە بگەڕێمەوە و وایان تەمبێ بکەم، تا عومریان هەیە گووی وا نەخۆن و پێیان لە بەڕەی خۆیان پتر رانەکێشن.

ئەفە پێکەنی.

- هێندە پیش مەخۆوە براله. مشووریان دەخۆین. جارێ تۆزێ بحەسێوە و شتێك بخۆ.

**گرویان:**

- ئاگرم لە دڵی بەربووە ئەفە. هیچم پێ ناخورێ. پێم وانییە پارووم لە گەرووی بچێتە خوارێ.

**ئەفە:**

- کوڕە یەك دوو پاروو هەر هیچ نییە نا... ئەرێ رۆڵە، شتێك بۆ گرویان حازر بکەن بیخوا. دەی خێرابن.

# ******* یاخو *******

هەندێ خواردنیان هێنا. گرویان دەستی بۆ نەبرد. ئەفە زۆری خولق کرد، بەلام گرویان دەمی لێ نەدا و گوتی:"

ـ خەریکە لە داخان دەمرم. لە داخان ئەفە.

جەندرمە نانیان خوارد. ئەحمەدئەفە هەستا و گوتی:

ـ هەقتە براکەم. وا باشترە بچینە سەروسۆراغی ئەو نامەردانە.

دەمانچەکەی لە قەدی بەست. ئەوەندەی یەك و دوو ئامادە بوون و کەوتنە رێ. ئەفە و گرویان لە پێشەوە و جەندرمەکانیش لە دواوەیان. وەك بای شەماڵ بە کۆلانەکانی ئاواییدا تێپەرین. ئەسپەکانیان ئەوەندە تاو دابوو، خەریك بوو بتۆپن. ئەسپ ئارەقەیان کردبوو و وەك کوورەی ئاسنگەران دەفیان دەدا.

خۆر وردە وردە بەرەو خوار دەچوو. سێبەر درێژ ببوونەوە. گەیشتنە دەم رووبارێك. ئەحمەدئەفە خەریك بوو سەیری ئاوەکەی دەکرد، کە گرویان دەرفەتی لێ هێنا و خۆی وەدوا دا. لە چاوترووکانێکدا شەش تفەنگ وێکرا تەقەیان کرد. ئەحمەدئەفە لەسەر ماڵی زین، تەکانێکی دا و بەسەر بەربۆوە عەرزی. مێشکی هەڵتەکابوو. لە مەودایەکی زۆر نزیکەوە سێ فیشەکی بەر مێشکی کەوتبوو. دەم ئاوەکە خوێناوی ببوو. ئیتر هەناسەی نەدەهات.

گرویان دابەزی. سەیرێکی جەستە بێ گیانەکەی کرد. ئەوجار داهاتەوە و دەمانچەکەی هەلگرت و وەك نە بای دیتبێ و نە بۆران، لەگەڵ پێنج جەندرمەکەی ملی رێگایان گرت و بەرەو ئاوایی "ئۆدەمیش" ئەسپیان لینگ دا.

## ******* یاخی *******

زۆربەی ئەو یاخی "ئەفە"انەی بەر لێبوردن کەوتبوون و لە چیا هاتبوونە خوارێ، ئەو ڕۆژە لە داو خران و کوژران. "یورۆك عوسمان ئەفە" لە ئەزمیر و "باکیرلی ئەفە" لە برگاما و "بارماق سیز عەرەب" لە ئایدین، هەر هەموو کوژران. ئەوانە ئەو کەسانە بوون، کە بەر لێبوردنی حوکمەت کەوتبوون و لە چیا هاتبوونە خوارێ و لە ژێر چاوەدێریی حوکمەتدا دەژیان. کوشتنی ئەحمەدئەفە بە نزیکترین برادەری خۆی واتە بە گروبان حەسەن ئەسپێردرابوو. ئەو کۆنەیاخییانەیان بۆیە دەکوشت، چونکە تەفەنگەکانیان نەدابووەوە بە حوکمەت و تفەنگچییەکانیشیان هێشتا بەدەورەوە مابوون. چەکیان هەر دانەنابوو و لەگەڵ تفەنگچییەکانیان لە گوندەکاندا دەژیان. پیتاکیان نەدەدا و کێشە و گۆلمەزیشیان دەنایەوە. لە راستیدا حوکمەتێکیان بۆخۆیان پێك هێنابوو و حوکمەتی مەرکەزییش(ناوەندیش) ئەوەی پێ قەبووڵ نەدەکرا. هەربۆیەش کوشتیانن.

پێش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە هەواڵێکی تاڵ گەیشتە ئاوایی. خەجێی هاوسەری ئەحمەدئەفە، لە حاڵێکدا بەکوڵ دەگریا و سەروقژی خۆی دەڕنییەو، بە پێخاوسی گەیشتە سەر تەرمەکە. تەرمە خوێناوییەکەی لە باوەش گرت و بەدەم گریانەوە گوتی:"

- کوڕە پێم نەگوتی ئەفە؟ نەمگوت عوسمانی بۆ متمانە نابن؟ نەمگوت ئەفە داماوەکەم؟

تەرمەکەیان هەڵگرت و بردیانەوە گوندی "ئایاسورات".

## ******* یاخی *******

لەو ڕۆژەوە خەجێ خۆشیی لەخۆی نەدی. هەموو ڕۆژێ قژی خۆی دەرنییەوە و بۆ ئەفە دەگریا.

مەمەد هەڵی دەدا و گەورە دەبوو. لە حاڵێکدا هەموو ڕۆژێ گوێی لەوە دەبۆوە کە چ غەدر و ناپیاوەتییەکیان لەگەڵ باوکی کردووە و هەموو ڕۆژێ ئەو نامەردییە ئازاری دەدا. چەند ساڵان بوو دەنگی شیوەنێك گوێی دەئاخنی. دەنگی دایکی کە دەگریا و دەیگوت:

- کوڕە نەمگوت، ئەفە داماوەکەم؟ نەمگوت عوسمانلی لەگەڵ کەس نابنە دۆست. بە نامەردی لێیاندای ئەفە. دەستی نامەردێك لە منی ئەستاندی.

مەمەد قۆناغی سەرەتایی تەواو کردبوو. یەك دوو ساڵیش لە گوندی ئۆدەمیش دەرسی خوێندبوو و وازی لە خوێندنێ هێنابوو.



# ٢

"حاجی یاخی" کابرایەکی رەشی وردیلە بوو. دەموچاوی درێژۆکە و پڕ چرچ و لۆچ بوو. پیر بوو. دۆستی هەرە نزیکی ئەحمەدئەفە بوو. پشت و پەنای بوو. گیانێك بوون لە دوو جەستەدا. کە گروبان حەسەن ئاوا ناجوامێرانە ئەحمەدئەفەی کوشت، حاجی یاخی باڵی بەسەر مەمەددا کێشا. وای کردبوو مەمەد بێ باوکیی پێوە دیار نەبوو. داغی ئەحمەدئەفە تەنیا لەسەر دڵی دوو کەس بوو. یەکەمیان خەجێی ژنی و دووەمیان حاجی یاخی. حاجی یاخی شێعرێکی هۆندبۆوە کە تێیدا باسی ئازایەتی و جوامێریی ئەحمەدئەفەی

******* پلخو *******

کردبوو و تووك و لەعنەتی لە بکوژە ناجوامێرەکەی کردبوو. شێعرەکە بۆسۆی لێ هەڵدەستا.

مەمەد تازە وازی لە خوێندن هێنابوو، کە رۆژێکیان حاجی ئەفە لە تەنیشت خۆی داینا و گوتی:

ـ تۆ بنیادەمێکی بچووك نیی، کورم. تۆ کوڕی "چاخیرجالی ئەحمەدئەفە"ی. رۆژگار پیاوێکی دیکەی وەك ئەحمەدئەفەی نەبووەتەوە. ئەگەر تاقە دەمارێکی پیاوەتیی ئەو پیاوە لەتۆدا هەبێ، تۆ لە هەموو پیاوانی دونیا پیاوتری. مێشەڵان و دارستان بەبێ پڵینگ نابێ. بێچووە شێر، ئاخری هەر دەبێتەوە شێر. رۆژێك نۆرەی تۆش دێ، کە بیسەلمێنێ کوڕی ئەو پیاوەی.

دوای ئەوە ئەسپ و تفەنگێکی "ماوزەر"ی دا بە مەمەد. مەمەدیش دەستی حاجی ئەفەی ماچ کرد و گوتی:"

ـ خودا راوەستاوت بکا مامە. تۆ پیاوێکی باشی. چەندی چەند ساڵان بابی منت لەبیر نەکرد و بۆ منیش بوویە باوك. ئەگەر ئەمرۆ باوکی خۆشم زیندوو بوایە هەر ئەوەی بۆ دەکردم. وا نییە؟

ـ وایە کورم. راست دەکەی. ئەوەی لە مشك بێ، هەنبانەی دەدڕێ و تەواو.

مەمەد سواری ئەسپ بوو و (تفەنگە)ماوزەرەکەشی هەڵگرت. ئەسپەکەی بێوێنە بوو و ماوزەرەکەشی بەلایەوە لە کچۆڵەیەکی دڵڕفێن خۆشەویستتر بوو. مەمەد ئەسپەکەی لینگ دا و وەك شێتان بە دەشتەکەی "ئۆدەمیش"دا تاوی دا. کە وەخۆ هاتەوە خۆر لە ئاوابوونێ بوو. لە نێوەڕاستی دەشتەکە سێرەی لە سنۆبەرێك گرت و پێنج فیشەکی پێوە نا. دەستی بە تفەنگەکەیدا هێنا و کەوتە بیرکردنەوە.

## ******* یلخو ******

بەخۆی گوت:"

ـ دەڵێن باوکم دەرزیی هەڵدەگرت*، کەچی من لەو دارە زلەم نەدا. باشە چۆن دەکرێ لە ئاسمانێ لە دەرزیی بدەی؟ هەر بە راستی سەیرە.

چاوێکی قووچاند و سێرەی لە چۆلەکەیەك گرت. دوای ئەوە کووپی سەر دار کارەباکەی کردە نیشانە، بەڵام تەقەی لە هیچ کامیان نەکرد. دیسان ئەسپەکەی لینگ دا و بەرەو ماڵەوە لێی خوڕی. هێشتا نەگەیشتبۆوە بەر دەرگا، دایکی دەرگای لێ کردەوە و زەردەیەکی بۆ کوڕەکەی هاتە سەر لێو. کوڕە دابەزی و دەستی لە ئەستۆی دایکی کرد. دایکی بە دەوری ئەسپەکەیدا هات و گوتی:

ـ ئیشەڵا خێری لێ دەبینی کوڕم. ئەسپێکی خۆشبەزە یان نا؟

ـ دەڵێی بای شەماڵە دایە*.

خەج تفەنگەکەی لێ وەرگرت. بارەوباری کرد و ورد لێی روانی.

ـ لە دەستان خۆشە. دەستت لەگەڵ راهێنا؟ تەقەت پێ کرد؟

ـ کردم دایە. نیشانەم لە دارێك گرت. پێنج فیشەکم پێوە نا. هەمووشیم لێ دا. تفەنگێکی خۆشدەستە.

خەجیج بزەیەکی هاتێ، بەڵام زۆری نەبرد، چاوی پڕ بوون لە ئاو. ئاخێکی هەڵکێشا و بە لەبزێکی گریاناوییەوە گوتی:

ــ بابت تەیری ئاسمان و مێرووی سەر زەویی دەئەنگاوت. تفەنگە سەدەفکوتەکەی باوکت بە دەست ئەو حەسەنە خوانەناسەوەیە... لە چاوی باڵندەی دەدا. . باوکت، باوکێکی ئاوا بوو... تفەنگە جوانەکەی باوکت بە

## ******* پلخو *******

دەست ئـەو نامـەردە جـەرگ سـووتاوەوەیە... تفەنگـە سـەدەفـنیشـانەکەی باوکت... "مارتینی" جوان...

مەمەد ئەسپەکەی بەسـتەوە و هاتـە ژووریّ. سـەری داخسـتبوو. کـە دایکـی دەکەوتە سەر باسی باوکی، ئیدی لێی نەدەبڕییەوە. .

ـ بابت هەڵۆی ئەو شاخانە بوو. جەندەرمە لە ڕۆژە ڕێیەکەوە زەندەقیان لێی دەچـوو. مەمەدەکـەم... کـوڕی شـیرینم... بابـت لەسـەر ئەسـپە عارەبییەکەی... زینی ئەسپەکەی زیوکفت بوو. لەبەر تـاویّ دەبریسـکایەوە. ئـەودەم، ئەگـەر کەسـێك لـە دەشـتیّ دیتبـای ئـەوە شـتێك دەبریسـکێتەوە، دەسبەجیّ دەهـات و مـنی ئاگـادار دەکردەوە: "خـەجیّ، ئەفـە هاتـەوە. کـە دەهات، ئەو دەشتەی ئۆدەمیش نوقمی نوور دەبـوو. کـە بابـت لـە شـاخەوە دادەگەڕا بۆ ئاوایی، خەڵك ئاهـەنگیان دەگێـڕا. ئەفـە کـە دەهاتـەوە، هـەموو خۆشحاڵ و بەکەیف دەبوون. جیازی بۆ کچە هەژاران دەکڕی. پارەی دەدایـە لاوەکـان، بـۆ ئـەوەی بتـوانن شـیربایی و مـارەیی بـدەن و ژن بێـنن. پـارەی داودەرمـانی بـە نەخۆشـان دەدا. دەسـتی هـەژار و نـەدارانی دەگـرت. بابـت جوامێر بوو. ئەفە هەر بۆخۆی ئەفە بوو، مەمەد گیان. ئەفەی من. دەمگوت: متمانە بە عوسمانلی مەکە، بەڵام ئەو کردی و عوسمانی نامەردییان دەرهـەق کرد. عوسمانیی بیّ دایك و باب.

دایکی دەیگوت و دەگریا. ئەوجاریش گریا:

ـ عوسمانلیی زاڵم. گروبانی بیّ دایك و باب.

## ******* یاخی *******

سبەی شەویٚ، پێنج ئەسپ سوار هاتنە لای مەمەد. توتنیان لە هەر پێنج ئەسپەکە بار کردبوو. خاوەن ئەسپەکان قاچاخچێتیی تووتنیان دەکرد. یەکێکیان گوتی:

- وەرە مەمەد. حاجی یاخی ئێمەی ناردووە. دەبیٚ تووتنەکان بگەیەنینە ئایدین.

مەمەد چاوەڕێیان بوو. پێشتر خۆی ئامادە کردبوو و بیٚ ئۆقرەی هاتنیان بوو. خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی. دایکی لە دواوە بانگی کرد:

- خێرت بێتە ریٚ کوڕم. خودا رسق و رۆزیت زیاد بکا. چاوی دوژمنت کوێر و داروبەرد گوێی کەڕ بیٚ. بابیشت ئاوا دەستی پیٚ کرد...

لە تاریکەشەوەکەدا ون بوو.

ڕێگا پڕ بوو لە پاسەوان. بەو دواییانە هەموو جێیەکیان پڕ کردبوو لە پاسەوان. باڵندە بە ڕێگا و چیاکاندا فڕیبایە، باڵیان دەوەراند.

یەکێك لە قاچاخچییەکان کە ناوی "وەلی عوسمان" بوو گوتی:

- ڕێگەکان زۆر خەتەرن. دەبیٚ بە شاخیدا بڕۆین. راستە ڕێی چیا ئەستەمە، بەڵام باشە.

مەمەد گوتی:"

- پێم وایە ئەگەر بە ڕێگا چەوڕێژەکەدا بڕۆین باشترە.

وەلی عوسمان وەڵامی داوە:

- ئەویٚ مەترسیدارە. باڵندە ناتوانیٚ بەسەریدا بفڕیٚ.

مەمەد:

## ******* يلخو *******

- هەموو کەس دەزانێ قاچاخچی بە ڕێگەی کێوپارەدا دەڕۆن. هەر بۆیەشە پیاوانی حوکمەت ڕێی شاخەکان دەگرن. هەر یەك دوو چەکداریان لە ڕێگا چەوڕێژەکە داناوە. زۆر ئاسانیش دەرەقەتی ئەوان دێین.

وەلی عوسمان قسەی نەدەسەلماند. قسەکەی مەمەدی قەبووڵ نەکرد:

- نەخێر. گوتم نابێ.

یەکێکی دی لە قاچاخچییەکان هەڵی دایە:

ئەو کوڕیژگەیە ڕاست دەکا، کاك عوسمان. چیاکان خەتەرن. لە پشت هەر گابەردێك داوێکیان ناوەتەوە. هەموو جەندرمە و سەربازەکانیان خزاندووەتە شاخەکانەوە. خەریکن یاخییەکان ڕاو دەکەن. ئەو کوڕیژگەیە ڕاست دەکا.

وەلی عوسمان هەڵچوو:

- قسە، قسەی منە. کە گوتم بە چیادا دەڕۆین، بەوێدا دەڕۆین و بڕایەوە.

ئەو قاچاخچییەی هەڵیدابوویە، ناوی حاجی مستەفا بوو. حاجی مستەفا لەبەری داینواند و لەسەری نەڕۆیشت. بەرەو چیا تێهەڵبوون.

حاجی مستەفا لە مەمەد چووە پێشێ و گوتی:

- کاك عوسمان قسەی یەکە. تۆ وەسەرخۆتی مەهێنە. تۆ ڕاست دەکەی، بەڵام خۆت تێك مەدە. من ناوم حاجی مستەفایە. یەکێکم لە برادەرەکانی باوکت. وەك دوو برا وابووین. ئای خوای لێ خۆش بێ، چ پیاوێك بوو. چ ڕۆژگارێکی خۆشمان پێکەوە ڕابوارد. کە ئەو مرد، پەرپۆم هەڵوەری و باڵم شکا.

## ******* پاشخوێ *******

شەوگار شەق ببوو. هەورازێکیان بڕیبوو و خەریک بوو بەرەو شیوەکە دادەگەڕان. لە نەکاو دیتیان کەوتوونەتە نێو ئاگر و تەقەیەکی خەستەوە. یەکێک لە هاوڕێکانیان ئەنگێورا.

حاجی مستەفا لە تەنیشت مەمەدەوە بوو، هاواری کرد:

ـ خۆت فڕێ دە. لە پشت بەردێک مات بە.

خۆشی خۆی فڕێ دا.

ـ لە جێیەکی خراپ تێکەوتووین. ڕێك لە نێوەڕاستیاندا.

دەستیان بە تەقە کرد. بە کەیفی مەمەد بوو. پەیتاپەیتا تەقەی دەکرد. بە حاجی مستەفای گوت:

ـ مامە حاجی، ئاخرییەکەی ئەو کارە چیی لێ دێتەوە؟

هیچی لێ شین نەدەبۆوە. لەوانەبوو بگیرێن یان گوللەیەکیان وێ کەوێ.

حاجی:

ـ ئاخرییەکەی، تۆ دەبییە پیاو. هێشتا گەنجی، ئەو گۆنگەلانە تۆ دەکەنە پیاوێکی پیاو.

مەمەد:

ـ یانی ئاوا.

ـ ئێستا بە سینەخشکێ خۆت بگەیەنە عوسمان. پێی بڵێ پیاو دەکرێ بە لای باشووردا خۆی بگەیەنێتە نێو باغەکان. ئێمە دەیانخافڵێنین. با ئەوان ئەسپەکان بەرن و خۆیان نەجات دەن. ئێمە ئاگامان لە چەکدارەکانی حوکمەتە.

ـ بەچاوان مامە.

## ******* يلخن *******

- دەی هونەری خۆت بنوێنە. کوڕی ئەحمەدئەفە...

مەمـــەد وەك مارێـــك، بەبێـــدەنگی خـــزی و خـــۆی گەیانـــدە عوسمـــان و راسپاردەکەی حاجیی گەیاندێ.

عوسمان:

- بڕۆ بە حاجی بڵێ، هەر دەبێ وا بکەین.

هـــەر واشـــیان کـــرد. هـــەمووان وێکـــڕا، دەســـڕێژیان لـــە لای باشـــوور کـــرد. قاچاخچییەکان خۆیـان گەیانـدە ئەسپەکان و لـە گۆلمـەز و کارەساتەکە دەرچـوون. هـەر مەمـەد و حـاجی مسـتەفا مانـەوە. پیاوەکـانی دەوڵـەت نەیاندەزانی چ بکەن. زۆر تووڕە بوون کە چەند کەسێك رایان کرد و چەند کەسێکی دیکـە ماونەتـەوە. ئـەوە یـانی ئەوانـەی ماونەتـەوە گیـان لەسـەر دەستن. تەقە خەستتر و توندتر بوو. هێندەی نیو سەعاتێك لـە هـەردوو لاوە گولله باران بوو. حاجی بە خشکە خۆی گەیاندە مەمەد و گوتی:

- مەمەد، لەو لا سەرووەوە، تەقەکـە کـەمترە. دەبـێ هەرچـۆنێك بـێ خۆمـان بگەیەنینە ئەوێ و لای سەروویان لـێ بگـرین و بەسـەریاندا زاڵ بـین. چـارمان نییە.

مەمەد شەلاڵی ئارەقە بوو. لە پێشدا هەم دڵی خۆش بوو و هەمیش دەترسا، بەڵام ئێستا ترسی لەبیر نەمابوو. بە سینگە خشکێ وەڕێ کەوتن. یـەکێکیان لـە پێشـەوە دەڕۆیـی و ئـەویتر ئاگـای لـێ دەبـوو. ئـەژنۆیان برینـدار بـوو و دەبـڕژاوە. ئاخرییەکـەی بازنـەی گەمارۆکـەیان شـکاند و لـە داوەکـە هاتنـە دەرێ.

## ******* يلخو *******

هێشتا بەیان نەببۆوە، کە گەیشتنە رەشماڵی عێلات. دەروانشین نانیان دانێ و مەڵحەمیان بۆ لەسەر برینان دانان. فیشەکیان لێ برابوو. هەندێ فیشەکیان لە دەورانشینەکان کڕی. خواردن و فیشەکیان لە کۆڵ نا و گەڕانەوە چیا.

- باشە بەو وەزعەوە بۆ کوێ دەچین مامە حاجی؟

- بەرەو چیا.

- یانی دەمانەوێ یاخی بین؟

حاجی مستەفا بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- لەوانەیە. وەك پیاوە مەزنەکە. وەك ئەفە.

حاجی مستەفا برۆی رەش و پان بوون. سمێڵی ئەستوور و درێژ و چاوی گەورە و رەش بوون. دەموچاوی هەندێ چرچ و لۆچی تێکەوتبوو. برۆی پڕ بوون و تێکەڵ ببوونەوە. بەژن و باڵایەکی مامناوەندی و گورج و تۆکمەی هەبوو. مووی ردێنی گرژ ببوونەوە، دەتگوت ژووشکە. دەوری چل ساڵان دیار بوو. چەند چڵە موویەکی شەویلگەی سپی ببوون.

مەمەد نیگەرانی داهاتووی بوو. پرسیی:

- ئەی دایکم دەڵێ چی؟

— هیچ ناڵێ. زۆریشی پێ خۆش دەبێ. دایکت ژنی چاخێرجالی ئەحمەدئەفەیە. زۆری پێخۆش دەبێ کوڕەکەی یاخی بێ.

- باشە خۆ ئێمە هیچمان نەکرد. هەر تێکهەڵچوونێك بوو لەگەڵ جەندرمان...

حاجی دیسان بزەیەکی هاتێ و گوتی:

## ******* پلخو *******

ـ مەمەد گیـان، بێـت و ئێسـتا بگەڕێینـەوە ئـاوایی، لێمـان دەکەونـە گومـان. لەوانەیە بشمانگرن. دەبێ چەند ڕۆژێك شوێنەونکەی بکەین. وا باشـترە لـەو شاخانە بمێنینەوە.

حـاجی مسـتەفا بۆچـی دەیەویسـت لـە شـاخ بمێنێتـەوە؟ ئەگـەر ویسـتبای دەیتوانی چەند ڕۆژێك لە ڕەشماڵی عێلاتدا بمێنێتـەوە. دیـارە شـتێکی لـەبن سەریدایە.

حاجی بە مشوور بوو. بەبێ ئەوەی سەیری مەمەد بکا، گوتی:

ـ بابت تۆی بەو جۆرە دیتبا، شاگەشکە دەبوو. ئای سەت خۆزگەی دەیـدیتی مەمەد.

بەرەبەری عەسریێ بوو. گەیشتنە شـوێنێك لـە نزیـك لووتکـەی چـیاکە. بۆنی سنۆبەر هەموو وڵاتـی داگرتبـوو. بـۆنی ئـاو و پنگـە و گـوڵ دەهـات. لەسـەر کانییەك دانیشتن. ئاوێکیان خـواردەوە و دەسـت و دەموچـاویان شووشـت و هەر کام لە لایەکەوە لێی درێژ بوون.

تاوێك دواتر حاجی هەستا و بەرەو خوار داگەڕا. هەندێ گـوڵی کـۆ کـردەوە و بازنەیەکی هێندەی ئاوێنەیەکی گیرفانی دروست کرد و لە دار سـنۆبەرێکی دا و گـەڕاوە. مەمـەد دانیشـتبوو و سـەیری کارەکـەی حـاجیی دەکـرد. حـاجی تفەنگەکەی هەڵگرت و سێرەی لێ گرت و گوتی:

ـ مەمەد بڕوانە.

پەلەپیتکەی کێشا. ڕێك لە نێوەڕاستی بازنەکەی دا. چەند فیشەکی دیکەشی پێوە نا. هەمووی لە شوێنێك دان. مەمەد پێی سەیر بوو. پرسیی:

ـ مامە حاجی، تۆ دەتوانی لە ئاسمانێ لە سکەی دراوی، بدەی؟

## ******* یاخی *******

- دراوێك هەڵاویێ، بزانە چیم پیێ دەكرێ.

مەمەد دەستی لە گیرفانی نا و سكەیەكی دەرهێنا و هەڵیهاویشت. حاجی تەقەی كرد. دراوەكە بەرنەبۆوە. حاجی گوتی:

- بابیشت وا بوو.

وەك ئاگریان بە رۆحی مەمەدەوە نابێ. لە داخان هەڵدەچۆقی.

حاجی گوتی:

- بۆ پیاوی یاخی یان قاچاخچی، ئەوە یەكەم هەنگاوە. ئەگەر نەزانی سێرە بگری، نە دەتوانی ببیە قاچاخچی و نە یاخییش. تەنانەت نابیتە پیاویش.

تفەنگەكەی دانا و جەغزێكی دیكەی، تۆزێك لەوی پێشوو گەورەتری دروست كرد و گوتی:

- هەستە بزانم شێرە كوڕ.

هەڵڵایەك بوو لە سینەی مەمەد دا. ئاگر بوو. تفەنگەكەی هەڵێنا. جوان سێرەی گرت و پەلەپیتكەی ترازاند. فیشەك لە دارەكە چەقی، بەڵام لە دەرەوەی بازنەكە. نەیتوانی تەنانەت لە لێواریشی بدا. حاجی هەرای كرد:

- نەبوو.

مەمەد تفەنگەكەی بە عەرزیدا دا و چوو لە دەم كانییەكە دانیشت و سەری خستە نێوان هەر دوو لەپی دەستییەوە.

حاجی بە لەبزێكی نەرم گوتی:

- دڵگران مەبە لاوە. ئەو كارە بە یەك دوو فیشەك ناكرێ. تفەنگەكەت هەڵگرە و تەقەی بكە. ئەوەندە تەقە بكە، هەتا لێی دەدەی.

مەمەد گوێی لە دەنگی حاجی نەدەبوو. وەك بەردێكی بێدەنگ دانیشتبوو.

## ******* پاخو *******

ـ ئەنگێوەیی و دەستڕاستی، لە زگی دایکتەوە نایهێنی. دەبێ دەستت لەگەڵی رابێ. نابێ بۆ تاقە ساتێکیش ئەو تفەنگە دابنێی. من خۆم ئەگەر مانگێك نیشانە دانەکەم و تەقە نەکەم، هەموو شتێکم لەبیر دەچێتەوە. ئەو یاخییانەی ماوەیەك دەست لە یاخیگەرێتی هەڵدەگرن و دوایی دیسان دەچنەوە شاخ، زۆر زوو دەکوژرێن. هەر لەبەر ئەوەشە کە تەمرین ناکەن. هیچ ناڕەحەت مەبە. خۆشت ئەزیەت مەکە. تۆ دەبییە تفەنگچییەکی باش. هێز و تین و گوڕیش مەرجە. تۆ وەك پۆڵا وای. تۆکمە و ساغی. خۆت ناڕەحەت مەکە. ئێستاش هانێ تفەنگەکەت و تەقە بکە. پەیتا پەیتا تەقە بکە.

حاجی هەر گوتی و گوتییەوە، ئاخرییەکەی ماندوو و بوو و بێدەنگ بوو، بەڵام مەمەد هەر نەجووڵا. هەر سەریشی هەڵنەهێنا کە سەیرێکی حاجی بکا. خۆر ئاوابوو و هەوا تاریك داهات. حاجی ئیتر پێی لەسەر دانەگرتەوە. دانیشت و پرێسکەکەی کردەوە. داوای لە مەمەدیش کرد بێ و نانی بخوا، بەڵام مەمەد گوێی نەدایێ. حاجی بەتەنێ نانەکەی خوارد و پرێسکەکەی خڕ کردەوە و بە مەمەدی گوت:

ـ دەمەوێ سەرخەوێك بشکێنم. تۆ کێشك بکێشە. لەوانەیە یەکێك بێ.

لە تەنیشت کانییەکە خۆی گرمۆڵە کرد و نوست.

شەو راشکابوو، کە بەخەبەر هات. مەمەد دانیشتبوو و تفەنگەکەی لە سەر ئەژنۆی دانابوو. حاجی باوێشکێکی دا. هەردوو مستی توند لە سینگی کوتا و بەدەم باوێکشانەوە گوتی:

ـ جا ئەو جار تۆ بنوو. نۆرە کێشکی منە.

## ******* یاخی *******

مەمەدی تفەنگەکەی لە باوەشــی نــا و خــەوت. لەگــەڵ تاوکــەوتنان بەخەبــەر هات. دەست و دەموچاوی شوشت و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەن، نان و چای بەیانییان خوارد. کە خۆیان کۆ کردەوە، حاجی نیشــانەکەی دوێنێــی نیشــان داوە و گوتی:

ـ دەی هەستە بزانم پاڵەوان.

مەمەد هەر وا بەبێدەنگی هەستا. تفەنگەکەی راست کردەوە. سێرەی گرت و پێوەی نا. فیشەك دەرچوو بەڵام تەنانەت دارەکەشی نەپێکا.

حاجی مستەفا دڵی دایەوە:

ـ خەمت نەبێ. هەر تەقە بکە. ئازاد بە. خۆت ئەزیەت مەکە. نیگــەرانی ئــەوە مەبــە نــەتپێکــاوە. وردە وردە دەســتت رادێ. هــەر راهاتنــە و هیچــی دی. ئاخرییەکەی فێری دەبی.

مەمەد دیسان قسەی نەکرد، بەڵام ئەمجارەیان ئیتر تفەنگەکــەی فــڕێ نــەدا. بــەبێ نیشــانە و ســێرەگرتن هــەر تەقــەی کــرد. هــیچ کــام لــە فیشــەکەکانی نەیــدەپێکا. قــەدی دارەکــە دابێژدابێــژ ببــوو، بــەڵام تاقــە فیشــەکێکیش نێــو بازنەکــەی نەئــەنگاوت. مەمــەد ددانــی چــیڕ کردنــەوە و فیشــەکەکانی بــەفیڕۆ دەدا. خوێنی جەرگی دەخواردەوە. دنیای لــەبیر کردبــوو. ســەری لەگێــژەوە دەهات. دار سنەوبەرەکە بە دەوری سەریدا دەخولایەوە. بەرەبــەری نیــوەڕۆ بوو، کە حاجی بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە هەرای کرد:

ـ هەی بژی، رێك ئەنگاوتت.

مەمەد هەر بیریشی لێ نەدەکردەوونە. لەسەر خۆ تفەنگەکەی دانا و لە دارەکە چووە پێشێ. سەیرێکی بازنە سپییەکەی کرد. لێی دابوو. تۆزێك ســەرووتری

## ****** یاخو ******

چەقی بازنەکە کون ببوو. پەنجەی لە کونەکە نا. ئەوجار هاتەوە لای حاجی.

حاجی بە کەیفخۆشییەوە زەردەی دەهاتێ. مەمەدیش بە شەکەتییەوە زەردەیەکی هاتێ.

لە تەنیشت کانییەکە دانیشت. مەمەد ئارەقەی کردبوو. دەست و دەموچاوی شوشت.

حاجی:

ـ هەر ئەنگاوتن و لێدان بەس نییە. دەبێ گورج و گۆلێش بی. دەبێ لە چاوترووکانێکدا خەنیمەکەت لە عەرزی بدەی. کات بەفیڕۆ بدەی، واتە مردووی. لە مەملەکەتی ئێمەدا تەڕدەستی و گورج و گۆلبوون لە ئەنگێوەیی گرنگترە.

حاجی کوڕی کێوپارە و کوێستانێ بوو. لە کەژ و کۆ گەورە ببوو. کوڕی یەکێ لە رەشماڵنشینە کوردەکان بوو. ئەو رەشماڵنشینانەی نیشتەجێ کرابوون.

مەمەد گوێی لە قسەی حاجی گرت. دیسان هەستا و تەقەی کردەوە. حاجی لەولاوە راوەستابوو و رێنوێنیی دەکرد:

ـ ئەها... ئەوەیە... نا... نا... ئەوە نەبوو. تفەنگەکەت مەبزێوە... توند رایگرە... ئەوجار باشە... بژی... ئەوەیان دنیایەك دێنێ.

هەتا ئێوارە هەر تەقەی کرد. حاجی شان و پیلیی داماڵی و هانی دا:

ـ ماندوو نەبی پاڵەوان. ئەوجار بووی بە پیاوێکی تەواو.

مەمەد گوتی:

ـ داناگەڕێین مامە حاجی؟

## ******* پلخر *******

- ئەو چیایە دەگەڕێین. ئەوە چیای باوکت بوو. حەشارگەی باوکت. دەمەوێ سەنگەرەکانی باوکتت پێشان بدەم. ئەو حەشارگانەی بە دەستی خۆی دروستی کردوون.

حەوتووەکی رەبەق لە شاخی مانەوە. ئاوی کانییەکانیان خواردەوە و لە بن گابەردان نوستن. هەموو حەشارگە و پەناگەکانی ئەحمەدئەفەیان بەسەر کردەوە. مەمەد دیسان تەقەی کردەوە. دەستی لەگەڵ تفەنگ راهاتبوو. سێرەگرتنەکەی باشتر ببوو. حاجی گوتی:

- هەر ئەوەندەی ئەستەم بوو. ئێستا ئیتر تۆ بوویەتە پیاوێکی تەواو. لەمەودوای ئاسانە.

دایکی دڵەدوای مەمەد بوو. دوو چاوی کردبوونە چوار چاو. مەمەد کە هاتەوە، دایکی شایی لەدڵی گەڕا:

- باوکی دەرزیی هەڵدەگرت و لە ئاسمانێ لە سکەی دەدا. ئیشەڵا وەك باوکی لێ دێ. جێی باوکی پڕ دەکاتەوە.

قاچاخچییەکان توانیبوویان بەساغی دەربچن. ئەسپەکەی مەمەدیشیان هێنابۆوە و دابوویانەوە بە دایکی.

هەر وا قاچاخچێتیی کرد و زۆر زوو توانیی جێی خۆی بکاتەوە و ناوبانگ دەربکا. ئازا و گورج و گۆڵ بوو. لە داو نەدەکەوت. ئەوەندەی قاچاخچێتیی کرد، بۆ جارێکیش چییە پێوە نەبوو. تاقە جارێکیان ناچار بوو، بەگژ جەندرماندا بێتەوە و دەست بکاتەوە، بەڵام دڵۆپێکیش خوێن چییە لە لووتی نەهات. زۆر بە سانایی دەرچووبوو. هەر بێکاریش دەبوو، لێی سواری ئەسپ دەبوو و ئەسپی تاو دەدا. شوێنێکی چۆلی دەدیتەوە و هەتا ئێوارێ هەر

## ******* یاخی *******

تەقەی دەکرد. لە خۆشییان شاگەشکە ببوو. ئیتر وا راهـاتبوو، فیشـەکی بـە فیڕۆ نەدەچوو.

یاخیگـــەری لـــەو ولاتـــە نـــەریتێکی کـــۆن و لەمێژینـــە بـــوو. لـــە پـــێش عوسمانلییەکانـەوە هـەبوو. تەنانـەت بـەر لـە بیزەنتیـۆمیش خـەڵکی ئـازا و شەڕکەری ئەو ولاتـە یـاخی دەبـوون و یاخیگـەرییان دەکـرد. دەکـرێ بڵێـی، لەوەتەی ئەو چیایانە، چیا بوون، یاخییـان لـێ نـەبڕابوو. کـاری قاچاخچـێتی وەك قوتابخانەیەك وابوو. قوتابخانەیـەك بـوو، کـە گەنجـەکانی وەردەگـرت و دەیکردنە یاخی. توورەکە و زینی ئەسپی زۆربەی ئەفەکان، بۆنی تووتنی لـێ دەهات.



# ٣



حاجی یاخی لەو کاتەوە یاخی ببوو، تەنانەت بۆ جارێکیش چییە پێ-نەکەنیبوو. نێوچاوانی هەمیشە گرژ بوو و دەتگوت قورگی پڕە لە گریان. لە گونددا، ئەوی نێوچاوانی گرژ بوایە، پێیان دەگوتـك حاجی یاخی. حاجی یاخی بەردەوام خەمبار بوو. هەر لە خۆوەش وا نەبوو. تیرێکی ژەهراوییان لە دڵی دابوو. بەڵایەکیان بەسەر هێنابوو تا مردن لەبیری نەدەچۆوە. لەمێژ ساڵ بوو، لەگەڵ کچۆڵەیەك زەماوەندی کردبوو. چەند ساڵێك پێکەوە ژیابوون، بەڵام ڕۆژێکیان، ژنەکەی حاجی دڵی دەچێتە سەر نۆکەرێکی

خۆیان. نۆکەرەکەش ژنەکەی حاجی هەڵدەگرێ و دەچن لە شوێنێکی دیکە دەژین.

لە گوندی "ئۆدەمیش" دەژیان. کچێکیشیان ببوو، کە ئەو کچە دواتر ببووە ژنی مەمەد. حاجی پیر بوو و نۆکەرەکیان لاو بوو. حاجی چەند جاران هەوڵی دابوو نۆکەرەکە و ژنەکەی بکوژێ، بەڵام نەیتوانیبوو. ئەگەر لە گوندەکەی خۆیان بوایە، شتێکی پێ دەکرا، بەڵام ئەوان لە ترسان پەنایان بردبووە گوندی ئۆدەمیش. حاجی یاخی، ساڵانی ساڵ، ئەو قینەی هەر لەدڵیدا راگرت.

رۆژێکیان بانگی مەمەدی کرد و گوتی:

- رۆڵە مەمەد. ئێستا ئیتر گەورە بووی و بۆخۆت پاڵەوانێکی. هەرچیم لە دەست دەهات بۆم کردی. لە هیچ شتێك دەستم نەگێڕاوە. جوامێری. تەیری ئاسمانێ لە دەستت دەرباز نابێ. دەتوانی لە ئاسمانێ چاوی دورنا بنگێوی. ئەگەر ئێستا نەتوانی چاکەیەکم لەگەڵ بکەی، ئەی کەنگێ دەیکەی؟ پێیەکم لەسەر لێوی گۆڕە. خەریکم دەمرم، بەڵام ئەو دڵە حیزەم دەردەدارە و پڕ ئازارە. تۆ کوڕی ئەحمەدئەفەی. ئەمڕۆ رۆژی هیمەت و قۆڵ هەڵماڵینە. مەهێڵە هەقی خوراوم بێ تۆڵە بمێنێتەوە. باشە من لەتۆ زیاتر کێم هەیە؟ پیاوەتی بکە و مەهێڵە بەدڵی شکاو و بریندارەوە سەر بنێمەوە. چەند ساڵە چاوەڕێی ئەمڕۆم. دەمگوت مەمەدم گەورە دەبێ و تۆڵەم دەستێنێتەوە. هەرچی هەمە و نیمە بۆ تۆ، ئەو مەزرا و باغەی خوارەوە هیی منە، دەیدەم بە تۆ.

## ******* یاخی *******

مەمەد سەری بەرداوە و وەڕێ کەوت. پێکەوە چوونە لای حاجی مستەفا و تەگبیرێکیان پێ کرد. حاجی مستەفا قایل بوو.

هاوڕێیەکی دیکەشیان هەڵگرت و چوونە گوندی ئۆدەمیش و ژن و مێردەیان لە سەر جێوبانەکەیان خنکاند و بەبێدەنگی و بەبێ ئەوەی کەس بیانبینێ، لە ماڵەکە هاتنە دەرێ.

مەمەد هاتەوە لای حاجی یاخی و گوتی:

ـ تەمەنی دوژمنت کورت بێ، مامە حاجی.

حاجی لە ناخی دڵەوە پێکەنی و وەك تۆفانی خۆشی و شادی بەهەموو گوندەکەدا گەڕا. وەك گەنجێکی پانزە ساڵانەی لێ هاتبۆوە. پێدەکەنی و گاڵتەی دەکرد. لە هیچ کوێ ئۆقرەی نەدەگرت. هەر دەتگوت حاجییە تووڕە و تۆسنەکەی جارانیش نییە.

کەس نەیدەزانی کێ ئەو ژن و مێردەی کوشتووە. لێکۆڵینەوەیان لەو رووداوە، بە گروبان حەسەن سپارد. هەر ئەو حەسەن گروبانەی باوکی مەمەدی کوشتبوو. حەسەن گروبان دوای چەند مانگ لێکۆڵینەوە، بۆی روون بۆوە، کاری مەمەدە. رۆژێکیان لە نەکاو مەمەد و هاوڕێکانی گرت و قۆڵبەستی کردن. چون دەیزانی لە ئەزمیر سزاکان توند و قورسن، هەر بۆیە بردنی بۆ زیندانەکەی ئەزمیر.

مەمەد لە زیندانێ وای هەڵسوکەوت دەکرد، وەك بڵێی پانزە ساڵە لە زیندانە و ئەزموونی کۆ کردووەتەوە. یەکەم رۆژەکان نە پێکەنی و نە قسەی لەگەڵ کەس کرد. هەر کەسیش دەهاتەلای و سەری قسەی دەکردەوە، دەیدی

## ******* یاخی *******

مەمەد سارد و سڕە و هیچی دەست نەدەکەوت. دانووی لەگەڵ کەس نەدەکولا و کەسی بە هەند نەدەگرت.

لەو سێ مانگەدا هەموو شتێك فێر بوو. شەڕانی و ملهوڕەکانی زیندانی ناسی و زانیی کێن و داهاتیان لە کوێوەیە. دوای ئەوە لەگەڵ "ئاغا سەید" بوو بە برادەر. ئاغا سەید، ئاغایەکی دەوڵەمەند بوو. چەند گوند و نیوەگوندی هەبوو. پیاوێکی باش بوو. زۆر بە ئەزموون بوو. سەد ساڵ و ڕۆژێکیان زیندان بۆ بڕیبۆوە. چوار کەسی بەدەست چووبوو. لەسەر مەسەلەیەکی نامووسی ئەوانەی کوشتبوو. هەمووان گران و سەنگینییەکەی ئەویان بەدڵ بوو. هەمیشە دەیگوت:

ـ ئەو کوڕە بۆ متمانە دەبێ. دەبێتە کەڵەپیاوێك.

ئاغا سەید کابرایەك بوو، لەکلّ هاتبووە دەرێ. قانوون زان بوو. هەرکەس دەهاتە بەندیخانە، حاجی ئاغا لە تەنیشت خۆی دایدەنا و ڕێنوێنیی دەکرد. بڕگەبڕگە قانوونی فێر دەکرد و دەیگوت چۆناوچۆن لەگەڵ لێکۆڵەر قسە بکا بۆ ئەوەی تێ نەکەوێ. هەموو بڕگەکانی قانوونی لەبەر بوو.

هەر لەو زیندانەدا، ئەفەیەکی ملهوڕی لێ بوو بە "عێلاتییە شێتە" بانگیان دەکردز پیاوێکی بەتین و گوڕ و ملهوڕ بوو. دە کەس لە زیندانییەکان خزمەتیان دەکرد. کابرایەکی زمان شڕ و جنێوفرۆش بوو. چاوی دەتگوت گۆمی خوێنن. ڕۆژ نەبوو بەربینگ بە چەند بەندییەك نەگرێ و لەگەڵیان بەشەڕ نەیە. باج و پیتاکی لە بەندییەکان وەردەگرت. هەرچی تازە دەهات، هەژار بوایە یان خوداپێداو، دەبوو باجی خۆی بدا. یەکەم ڕۆژەکان بەربینگی بە مەمەدیش گرتبوو، بەڵام هێشتا نەیتوانیبوو هیچی لێ بستێنێ. خۆی لێ

## ******* یاخی *******

خۆش کردبوو لە دەرفەتێکدا زەبرێکی گورچوبڕ لە مەمەد بدا. چەند جاران پیاوەکانی ناردبووە لای مەمەد، بەڵام ئەوان زەندەقیان لەو گەنجە بێدەنگە چوبوو. هەر بۆیە هیچیان پێ نەکرابوو. حاجی مستەفاش ئاگای لێ بوو.

عێلاتییە شێتە، کە دیتی ئاغا سەید و مەمەد بوونەتە برادەر، لە دین دەهەری بوو. بەندییەکان، گەورە و بچووك ئاغا سەیدیان خۆش دەویست و بە باوکی خۆیان دادەنا. رۆژێکیان عێلاتییە شێتە هاتە لای ئاغا سەید و وەك شێتان نەڕاندی:

- ئەتۆ هیچ شەرمێك لەو ردێنە سپییەت ناکەی؟ بۆچی بوویەتە برادەری منداڵێکی تازە هاتووەتە زیندان؟ بۆچی لەگەڵ هەتیوە قووندەیێکی لووسکە برادەرایەتی دەکەی و حەیای ئێمەش دەبەی؟ لەمەودوا نەبینم ئەو هەتیوە لووسکەیە بێتەوە لای تۆ.

مەمەدیش ئەو قسانەی بیستەوە. لە فکرەوە رۆچوو. بیری لە ئاقیبەتی کارەکە دەکردەوە. بە رواڵەت وەسەر خۆی نەدێنا، بەڵام ئیتر نەچۆوە لای ئاغا سەید. مەمەد لە پێش چاوی هەمووان کەوتبوو و لای بەندییەکان سووك ببوو. خەنیمەکەی زۆر بەهێز بوو. نیوەی بەندییەکانیش لایەنگری بوون. هەندێکیان کەیفیان بە عێلاتییە شێتە نەدەهات، بەڵام لێی دەترسان. عێلاتییە شێتە دەمانچە و چەقۆی پێ بوو. بە دەمانچەوە لە حەوشەی زینداندا دەخولایەوە و گاڵتەی بە مەمەد دەکرد. مەمەد تەنیا بیری لە یەك شت دەکردەوە. دەبوو دان بە جەرگیدا بگرێ و نەخشەیەك بکێشێ.

******* پلخو *******

مانگ و نیوێك هەموو سووكایەتی و تانە و تەشەر و پلارەكانی قەبووڵ كرد و متەقی نەكرد. لەو ماوەیەدا كە تووشی ئاغا سەید دەبوو، لای دەدا و خۆی لێ گێل دەكرد.

ئەو زیندانە چ شوێنێك بوو؟ هەندێ دەیانگوت پەناگەی شێرانە. لەوانەیە حەشارگەی ڕێوییش بێ. پیاوی ملهوڕ، ئەوانەی بێبەزەییانە خەڵكیان كوشتبوو، ئەوانە چەندی چەند ساڵان بە كێو و شاخەوە ببوون و گوندەكانیان تاڵان كردبوو، ئەو پیاوانەی چەكیان لە حوكمەت هەڵگرتبوو و چەند ساڵان دەمەلاسكێی دەسەڵاتیان كردبوو، لە بەردەم عێلاتییە شێتەدا دەستەونەزەر رادەوەستان و خزمەتیان دەكرد و ئاویان بە دەستیدا دەكرد و مەسینەیان بۆ پڕ دەكرد و بۆیان دەبردە ئاودەستێ. باشە بۆ؟

حاجی مستەفا بێكار نەبوو. بە دزییەوە نەخشەی دادەڕشت و خۆی ئامادە دەكرد. حاجی مستەفا كورد بوو. كوردەكانی نێو زیندان زۆر بوون. حاجی بە ڕۆژ بە زیندانێدا دەگەڕا و قسەی لەگەڵ ئەو كوردانە دەكرد، كە دوژمنی عێلاتییە شێتە بوون. شەوانەش بالیفەكەی لە تەنیشت بالیفی مەمەدەوە دادەنا و پێكەوە نەخشەیان دادەڕشت و باسی ئەو پیاوانەیان دەكرد كە دواندوویانن. شەوێكیان مەمەد گوتی:

ـ تەواوە حاجی. ئیتر دەبێ ئەمشەو لێ ڕاپەڕین. بەیانی كاتێ كابرا لە حەوشەی زیندانێ خەریكی تەزبێح گێڕانە، دەبێ خۆی پێدا بدەین. لە پێشدا دەمانچەكەی لێ دەستێنین. دواییش پێی دەڵێین پووتێك چەند كیلۆیە، بەڵام نا، دەبێ خۆم تێی هەڵدەم. هەر خۆم. تۆ و ئەوانی دیكە ئاگاتان لێ بێ برادەرەكانی نەیەنە پێشێ.

## ******* پلخو *******

یازده برادەر بوون. هەمووان هاوڕا بوون و زمانت دەرکێشابان قسەیان لە زمانی دەرنەدەکێشرا. یەکێکیان بەوانی دیکەی گوتبا بمرن، کەس نەیدەگوت نا. مەمەد و حاجی لەگەڵ کەسی ئاوا ببوونە دۆست.

ڕۆژ بۆوە. عێلاتییە شێتە لە حەوشەی زیندانێدا دەهات و دەچوو و تەزبێحی داویشت. کە ئەو لە حەوشە دەبوو، کەس نەیدەوێرا بچێتە حەوشە. کەسیش گونی ئەوەی نەبوو لە ئاستی وی تەزبێح بگێڕێ.

مەمەد وەك بیەوێ بچێ شتێك بکڕێ، وردە وردە لە عێلاتی نزیك بۆوە. عێلاتی مەمەدی بەهەند نەدەگرت. ئەوەش بە قازانجی مەمەد بوو. لەپڕێکدا ئامبازی عێلاتی بوو و لە عەرزی دا. مەمەد بەر لە هەموو شتێك دەمانچەکەی لێ ڕفاندبوو و بۆ حاجیی هاویشتبوو.

بوو بە شەڕ و لێکدانێك کەوچکی تێدا نەدەگەرا باشترە نییە. یەکتریان لەعەرزی دەدا و لە سەر و دەموچاوی یەکتریان دەدا. عێلاتی بەهەموو تینی خۆی دەیوەشاند، بەڵام بەهەموو هێزی خۆی دەرەقەتی مەمەد نەدەهات. دە ساڵ زیندان تین و هێزی لەبەردا نەهێشتبوو، بەڵام مەمەد گەنج بوو. پاڵەوان بوو. برادەری عێلاتی دەیانویست بێنە پێشێ و بیکەنە هەرا، بەڵام دیتیان دە پیاوی قورس و قایم پێشیان گرتوون. هەر بۆیە نەیانوێرا بێنە پێشێ و هیچیان پێ نەرکا. لە قەراغەوە ڕاوەستابوون و سەیریان دەکرد. ئیتر دەمانچەکەی عێلاتی بە حاجی بوو و لە برادەرەکانی عێلاتیی ڕاکێشابوو.

عێلاتییە شێتە دەینەڕاند و هاواری برادەرەکانی دەکرد:

ـ کوڕە ئەوە لەبن کێ دان؟ هەتیوانە، فریام کەون.

## ******* پلخو *******

بەڵام کەس نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە.

مەمەد بەزەیی پێیدا نەدەهاتەوە. عێلاتی شەلاڵی خوێن بوو. باشاری مەمەدی نەدەکرد. پاسەوانەکانیش زۆربەیان رقیان لە عێلاتی بوو و دەرگایان کردبۆوەو سەیریان دەکرد. کەس نەدەهاتە پێشێ لێکیان بکاتەوە. جەندرمە هەر سەیریان دەکرد. دوای چەند ساڵان، ئەمڕۆ دیمەنێکی خۆشیان دەدی و حەزیان لێ نەبوو ئەو بەرنامە خۆشە تەواو بێ. کە دیتیان عێلاتی نیوەنووزەی دێ، دەرگا کرانەوە و پاسەوان جەندەرمە هاتن و لێکیان کردنەوە. مەمەد و عێلاتییان لە کۆت و زنجیران کرد. عێلاتییە شێتە سەری هەڵنەدەهات و رووی نەبوو سەیری کەس بکا.

لەو رۆژە بە دواوە مەمەد ببووە کەڵی گون ڕەش. هەموو لێی دەسڵەمینەوە، بەڵام مەمەد کاری بەسەر کەسەوە نەبوو. کەسیشی ئەزیەت نەدەکرد.

ئەو کات دەنگۆیەك لە نێو بەندییەکاندا بڵاو دەبۆوە. دیار نەبوو کێ یەکەم جار ئەو قسەیەی کردووە، بەڵام بڵێی و نەڵێی زار بە زار دەگەڕا و هەموو بۆ یەکتریان دەگێڕاوە. دەنگۆ کە ئەوە بوو کە مەمەد دوای بەربوونی لە بەندیخانە دەچێتە شاخ و تۆڵەی باوکی دەستێنێتەوە. لەوانەیە حاجی لە زاری دەرپەڕیبێ. لەوانەشە بەندییەکان خۆیان هەقایەتیان هەڵبەستبێ. ئەوان راهاتبوون، هەر کەسیان خۆش بوێ، هەقایەتی بۆ دروست بکەن و سەری بگەیەننە ئاسمان.

بەندیخانە پڕ بوو لە سیخوڕ. حوکمەتیش دەنگۆکەی بیستبۆوە. دڵنیا بوون لەوەی مەمەد هەر لە زیندانێ بەربێ، یەکسەر دەچێتە چیا و یاخی دەبێ. گرویان حەسەن نیگەران بوو، چونکە نەیتوانیبوو بەڵگەی پێویست دژی

مەمەد کۆ بکاتەوە. نەیتوانیبوو بیسەلمێنێ کە مەمەد دەستی لەو کوشتنەدا هەبووە. هەر بۆیە دیار بوو مەمەد بەو زووانە بەر دەبێ.

دێهاتییەکی دیکەش لە بەندیخانەدا بوو، کە پازدە ساڵی بۆ بڕابۆوە. لە کابرایەکی گوندەکەی خۆیانی دابوو. ڕۆژێکیش لە گوندەکەیانەوە هەواڵێکی زۆر ناخۆش هات. ئەو هەواڵە شێتی کرد: "ژنەکەی مێردی بە براکەی کردبۆوە. "

کابرای بەندی کە گوێی لەو خەبەرە بوو، مات و کڕ بوو. حەفتەیەکی ڕەبەق دەمی لە هیچ نەدا و لەبزیشی لە لەبزی کەس نەگەڕا و کەسی نەدواند. دوایی وردە وردە دەستی کردەوە بە خواردن، بەڵام بنیادەمەکەی جاران نەبوو. بەردەوام پیاسەی دەکرد و بەملاولادا دەڕۆیشت. کە یەکێك دەیەویست پرسیارێکی لێ بکا، گوێی نەدەدایێ. کە گوێشی رادەگرت، وەڵامی نەدەداوە و وەك بێ ئەقڵان پێدەکەنی. هەر ئێسك و پرووسکی پێوە مابوو. سەر و قژی ئاڵۆز بوو. دوای ئەوە زۆر نەهامەتیی دیکەشی لێ دەرکەوتن. لە بەردەم ژوورەکەی رادەوەستا و سەری لە پەرژینە ئاسنەکان دەکوتا. شەو و ڕۆژ لەوێ رادەوەستا و نەدەبزووت. ئەوە ببووە خەم و ئازاری هەمووە بەندییەکان. هەموو خەفەتیان لێ دەخوارد. مەمەد لە هەمووان پتر خەمی بوو. خەمی بوو، بەڵام هیچیشی پێ نەدەکرا. چیی لەدەست نەدەهات. دەردی بەندییەکە بێدەرمان بوو.

جاروبارە فکر و خەیاڵ هەڵیدەگرت و دەیگوت:

- ورد بەوە حاجی. سەیر کە ئەو دونیایە چیها چارەڕەش و لێقەوماوی تێدایە و چییان بەسەر دێ. ئەو داماوە بەسەری زیندوویی دەمرێ. ئێستا لێی

## ******* پلخو *******

گەڕێن خاکی ئەو دێیە بە توورەکە دەکێشێ. ئەو ژنە و پیاوە زیناحکەرەکە ورد ورد دەئەنجنێ.

ئەو ڕۆژەی قەرار وابوو مەمەد ئازاد بکرێ، هەمووان خۆیان ئامادە کردبوو ماڵاوایی لێ بکەن. ئاغا سەید لە دوێنێ عەسریەوە، مەمەدی نسحەت دەکرد و هەوڵی دەدا مەمەد لە دونیا و بنیادەمان تێگەیەنێ.

ئەمری بەربوونەکەیان هات. دوانیوەڕۆ بوو. نوێنەکانیان خڕ کردبۆوە و بە کۆڵیاندا دابوو. کابرای بەندییش لە پشت پەرژینەکانەوە سەیری دەکرد و وای لێ هاتبوو فووت لێ کردبایە با دەیبرد. وەك منداڵان دەیڕوانی. لە ناکاو دەرگا کرایەوە. مەمەد دەیەویست بێتە دەرێ. ماڵاوایی لە بەندییەکە کرد. بەندییەکە نیگای ساردوسڕی لە مەمەد بڕی و جووڵەی نەکرد. دوای ئەوە لەپڕ بزووت. زۆر خێرا بەرۆکی مەمەدی گرت و دوای چەند مانگان زمانی گەڕا و قسەی کرد:

ـ ئەفەی خۆم، تۆ وا ئازاد دەبی. ئەفەی من... .

ئیتر وەك بڵێی پەشیمان بووبێتەوە، بەرۆکی مەمەدی بەر دا. دەتگوت دەستەکانی تینیان تێدا نەماوە. شۆڕ بوونەوە. مەمەد و بەندییەکە یەکتریان بەردا.



# ٤



که له زیندانیّ هاتنه دهریّ، نویّنهکانیان هـهلگرت و چـوونه کاروانسـهرایهك و ژووریّکیان گرت. برادهریّکی دیکهشیان پهیدا کردبوو و ناوی "حهمـه شـوان" بوو.

لهسـهر نویّنـهکانیان دانیشـتن. دهسـتیان کـرده کۆلهکـهی چـهناگهیان و ماوهیهکی دریّژ بیریان کردهوه.

چاخیرجالی گوتی:

ـ باشه، چ بکهین حاجی؟

ـ تۆ باشتر دهزانی کورِم.

ـ تۆ پیّت وایه سبهی ههوالیّکمان له "ئاغا کامیل"ـهوه بۆ بیّ؟

## ******* یاخی *******

- دیّ کورِم دیّ.

- چیی پیّ بلّیم مامه؟

- تۆ باشتر دەزانی.

- یانی هەموو ڕێگەکانمان لیّ گیراوە؟

- وا دیارە.

- چاوەڕیّ دەبین.

هاتن بنوون. حاجی چراکەی کوژاندەوە. چاخیرجالی خەوی لیّ نەدەکەوت. لە نوێنەکەیدا هەر تەنیشتاوتەنیشتی دەکرد. حاجی و شوانە دەمێك بوو نوستبوون. مەمەد بیری لە باوکی دەکردەوە. بیری لە ئەفەیی و دایکی و گرویان حەسەن دەکردەوە:

گۆزەی ئاو، هەر لە ڕێی کانی دەشکیّ. تا ئەمڕۆ نەبینراوە ئەفەیەك بە مەرگی ئاسایی خۆی و لە پێخەف و نوێنوباندا بمریّ. کیّ دیتوویەتی ئەفەیەك لە ماڵەکەی خۆی و لە نوێندا بمریّ؟ ئەفە چەندی زیرەك و ئازاش بیّ، ئاخریەکەی هەر ئاشکرا دەبیّ و ڕاو دەکریّ. فیشەکی وێدەکەویّ. ئەو چیایانە لەوەتەی چیان، زۆر ئەفەیان بەخۆوە دیتووە، بەڵام هیچکامیان ئاقیبەت بەخێر نەبوون. "چریتە گەورە"، "چریتە چووکە"، "بارماقسیز عەرەب"... و ئەدان ئەفەی دیکەش. ئەفە چەندی ئازا و زیرەکیش بیّ، چەندی پیاویش بیّ، ئاخرییەکەی دەکەوێتە بەرچنگی ئەو دێوە.

ئاوا هیچ ناکریّ و بە هیچ کویّ ناگەی. دەبیّ بیرێکی دیکەی لیّ بکەیەوە.

لە لایەکەوە دایکیی دەدی و لە لایەکی دیکەشەوە گرویان حەسەن. هەژاری و دەستکورتییش لە لایەکی دیکەوە. خۆ قاچاخچێتیی توتنیش داهاتێکی وای

******* ياخى ******

نەبوو. ئەویش ئاخرییەکەی هەر شەڕە تفەنگی بە دواوە بوو. ئەی خەڵك چییان دەگوت؟ "وەرنە سەیری کوڕەکەی ئەحمەدئەفە، ئەوە بکوژەکەی باوکی قیت قیت دەگەڕێ و ئەویش زیت زیت سەیری دەکا و هیچیش ناکا. تف لەو پیاوەتییەت... جا تۆخوا کوڕی ئەحمەدئەفەیش بنیادەمە؟" ئەی باشە حاجی یاخی دەڵێ چی؟ "من وام کرد ئاغا کامیل و خەلیل بەگ پشتی بگرن. ئەوانیش ویستیان کۆمەگیی بکەن، بەڵام ئەو هەیتوە نابێتە پیاو... ئاخ... ئەگەر ئەحمەدئەفە زیندوو بوایە. ئای ئەگەر ئێستا زیندوو دەبووی ئەفە! تۆ کوڕت لە پاش بەجێ نەماوە، کەروێشکێکی ترسنۆکت لەپاش بەجێ ماوە. بەردێکی رەشی بەکارنەهاتوو... " ئەرێوەڵڵا حاجییش هەر وا دەڵێ.

ئەی چۆن چاو لە چاوی دایکی بکا؟ هیچ دیارییەکی بۆ دایکی پێ نییە. پارەی نییە. ئەوەندەیان پارە نییە کرێی کاروانسەراکە بدەن.

یاخیگەری ئاخری و ئاقیبەتی نییە. ئاخرییەکەی فیشەکە...

زینــدانی و خەڵکەکەی دەرەوەی زینــدان دەڵــێن چــی؟ "راوەســتە بــا چاخیرجالی ئازاد بێ... با لە زیندانێ بێتە دەرێ... جا ئەو گروبان حەسەنە نامەرد خۆی دەبینێتەوە. یانی باوکی بکوژێ و بە ناهەق خۆیشی بخاتە بەندیخانەوە؟ راوەستە، مشووری ئەو نامەردە دەخوا. ئەگەر چاخیرجالی، هەر بەراستی چاخیرجالی بێ، ناهێڵێ خوێنی باوکی بە فیڕۆ بڕوا.

چیای بەرز... هەر بە ترس و دڵەخورپەوە... را بکە،... بکوژە... لێدە...

لە پڕ هەستا و چراکەی هەڵکرد. لە تەنیشت حاجی دانیشت و هەڵیستاند.

ـ چییە مەمەد؟

## ******* پلخو *******

- مامە حاجی، تۆبە لەو کارە.

- کام کار؟

- ئەفەیی.

- باشە بۆ؟

- ئاقیبەتەکەی...

حاجی بە خەواڵووییەوە بیری کردەوە و بە لەبزێکی خەواڵوو گوتی:

- پیاوی وەك تۆ ناتوانێ نەبێتە ئەفە. تۆ هەر ئێستاش ئەفەیەکی. ئەفەیی لە خوێنت دایە. ئەگەر ئێستا بچینەوە ئاوایی و دەست بدەینە گاسن و گا و جووت، هەر حەیامان دەچێ. سووك و چرووك دەبین. دەستمان لێ هەڵناگرن. ئیتر ئێمە دەستمان سوور بووە. وامان لێ دێ، دەبینە ژێرچەپۆکە و هەر داماندەپلۆسن. یاخی لێمان دەدەن. حوکمەت لێمان دەدا. دەبینە چەند گوندییەکی سووك و چرووك. هەر جارێك دەستمان کە بەخوێن سوور بوو، ئیتر تەواو، رێگەی گەڕانەوە نییە.

حاجی ئەو قسانەی کرد و خوت. چاخێرجالییش راکشا.

مەمەد تا بەیانی خەوی لێ نەکەوت. کە رۆژ بۆوە، هەستان. حاجی پرسیی:

- دەی دەڵێی چی؟ دانیشین و چاوەڕێی هەواڵی ئاغا کامیل بین؟

چاوی چاخێرجالی دەتگوت گۆمی خوێنن. بە بێ مەیلی وەڵامی دایەوە:

- جارێ با سەرێکی ئاوایی بدەین. دواییش خودا گەورەیە.

حاجی زەردەیەکی هاتێ.

- دەی باشە، وا دەکەین.

## ****** پلخر ******

حاجی دەیزانی چاخیرجالی قەت ناتوانێ لە ئاوایی بژیی. دەیزانی درەنگ یان زوو ناچار دەبێ روو بکاتە چاخ. جا ئەمڕۆش نەبێ، سبەی.

هاتنە وێستگەکە. شەمەندەفەر بەرەبەری عەسرێ وەڕێ دەکەوێ. گەڕانەوە بازاڕ. بەملاولادا سووڕانەوە. ئەو رۆژە نە حاجی باسی ئەفەیی کرد و نە مەمەدیش. حەمە شوانیش کە هەر قسەی نەدەکرد. هەر کەمدوو بوو. هەر کارێکی حاجی یان قاچاخچییەکانی دیکە پێیان دەسپارد، بەبێدەنگی رایدەپەڕاند.

***

لەو کاتەدا گروبان حەسەن لە گوندی ئۆدەمیش بیستبوویەوە کە چاخیرجالی لە زیندان بەربووە و پێی تێك چوبوو. ئەو دەیەویست بیانوویەکی پێ بگرێ و مەمەد قۆڵبەست بکا. دیارە بیانووشی دۆزیبۆوە. ئەو دزییەی چەند ساڵ لەوەپێش کرابوو، بە ئەستۆی مەمەدی داهێنابوو و هاتبووە ئاوایی بەو بوختانە قۆڵبەستی بکا.

چووە ماڵەکەیان، بەڵام چاخیرجالی لە ماڵەوە نەبوو. دایکی خەریکی تەشی رستن بوو. گروبان حەسەن تووڕە بوو. کە چاخیرجالیی نەدی، تووڕەتر بوو. دەستی کرد بە سووکایەتیکردن بە دایکی. سووکایەتی نەما پێی نەکا. هەرچۆنێك بێ دەبوو چاخیرجالی بدۆزێتەوە. بێوەژنە لێقەوماوەی جنێوباران کرد:

- ئەو تووتکە سەگە زۆڵەت ئەگەر بکەوێتە دەستم، لە باوکی خراپتر بەسەر دێنم. ئەو زۆڵەت لە کوێ هێنا؟ سەگباب وەك ئاوخواردنەوە پیاو دەکوژێ. لێرەتت دەرهێنا؟

## ****** یلخو ******

لوولەی تفەنگەکەی بۆ نێوگەڵی ژنەکە برد.

- باوکی وا سەگباب هەر زۆڵی ئاوای لێ دەکەوێتەوە. خێرا پێم بڵێ لە کوێیە؟

دوای ئەوە چەند خزمێکی چاخیرجالیی درێژ کرد و چەندی توانیی لێی دان، بەڵام نەیتوانی سووری بکاتەوە شوێنی مەمەد لە کوێیە و بۆ دۆزینەوەی لە گوندەکە چووە دەرێ.

خەجیج تاقەتی ئەو هەمووە سووکایەتییەی نەهێنا. لە خەفەتان نەخۆش کەوت. یەکێك لە گەنجەکانی خزمیانی بانگ کرد و گوتی:

ــ هەرۆ لە هەر شوێنێك بێ مەمەدم بدۆزەوە. پێی بڵێ، ئەو گروبان حەسەنەی باوکتی کوشت، ئاوای لە دایکشیت کرد. ئەوەی باوکتی کوشت، لە دایکشیتی دا و چیی قسەی ساردوسووکیش بوو پێی گوت. پێی بڵێ، تا ئەو گروبان حەسەنە نامەردە نەتۆپێنی، تا تۆڵەی بابتی لێ نەکەیەوە، نەیەوە ئاوایی. ئاوا نە من لە نێو خەڵکدا سەرم هەڵدێ و نە تۆش...

گەنجەکە رۆیشت و چاخیرجالیی دۆزیەوە. قسەکانی خەج چەندە بوون، ئەوەندەی دیکەشی پێوە نان و پێی گوت.

بەر لەوەی بگەنەوە ئاوایی، خۆزگەکانی حاجی وەدی هاتن. چاخیرجالیی سوور سوور هەڵگەڕابوو و وەخت بوو چاوی دەرپەڕن. هەر بەو حاڵەوە بە حاجیی گوت:

- وا دیارە چارەیەکی دیکەمان نییە مامە حاجی. خۆیان ناچارمان دەکەن، دەبێ یەکەوڕاست بچینە لای حاجییە یاخییەکەی خۆمان. لە ئاغا کامیل و

## ****** یاخی *******

خەلیل بەگیش راسپێرین تفاق و کەلوپەلمان بۆ دابین بکەن. دوژمنی ئەوان دوژمنی ئێمەشە.

بەر لەوەی بێنەوە گوندەکەی خۆیان، شەویٚ چوونە ئاواییەکەی حاجی یاخی. ئێستا ئیتر خۆیان بە یاخی دەزانی. دەیانزانی گوریان حەسەن بە شوێنیانەوەیە. کەوابوو بە دزییەوە هات و چۆیان دەکرد. حاجی یاخی هەر چاوی پێیان کەوت، گوتی:

ـ کورە من پێم وابوو لە چیای بێش بارماقن، بەلاّم ئێوە،... چاخیر جالی وەلامی دایەوە:

ـ تفاقمان بۆ دابین بکە مامە حاجی.

حاجی یاخی لە قوولایی دلّییەوە پیٚ کەنی:

ـ کورە بە سەر گلێنەی چاوم. رۆلّە گیان. گیا لەسەر پنجی خۆی شین دەبیٚ. هەموو شتێك تەیار و ئامادەیە. پیاوەکانی خەلیل بەگ چەندی لێتان گەڕابوون نەیاندۆزیبوونەوە. هەر بۆیەش هاتنەوە لای من. منیش قسەی خۆم بەوان گوت. ئێستاش تۆفیق بەگ ئاگادار دەکەمەوە. کامیل ئاغاش هەروەتر. دەلّێم پەنجا سکەی زێڕیش بنێریٚ.

حاجی یاخی خەریك بوو لە خۆشیان شاگەشکە دەبوو. دیسان دەبۆوە ئاغا و کوێخای ئاوایی. مەمەد کە بچێتە شاخ، گوندی لە حاجی یاخی دەترسێن. دەبنە عەبد و گوێلەمستی حاجی. دیسان دەورودووکان وەردەسووڕێتەوە. دیسان شیری حاجی مووی دەکرد. یەکی تفەنگێك و هەندیٚ فیشەکی دایە هەر کامەیان. دووربینێکیشی دایە مەمەد. ئەو شەوە دووعای بۆ کردن:

## ******* یاخو *******

- برۆن. ئیشەڵا ڕێگەتان بێ کۆسپ و شمشێرتان تیژ دەبێ. ڕسق و ڕۆزیتان هەر زۆر بێ و خدری زیندە پشت و پەناتان بێ.

دوایی لەو عێلاتییانەی ڕاسپارد کە هێشتا لە شاخ بوون و هەواڵی ناردە لای سەرۆك هۆزەکانیشیان:

- ئەوە کوڕەکانی ئێمە دێنەوە چیا. زۆر ئاگاتان لێیان بێ. چەندی بۆتان دەکرێ خزمەتیان بکەن.

هاتنە چیای بێش بارماق. ڕەشماڵ نشین بە گەرموگوڕی بەپیریانەوە چوون. "ئاغا وەلی" ئاغای عێلاتییەکان مەمەدی لە تەنیشت خۆی دانا و گوتی:

- حاجی سڵاو و پەیامی بۆ ناردووم و گوتوویەتی تۆ کوڕی ئەحمەدئەفەی. خەمت نەبێ. پێویستیت بە هەر شتێك بوو ئاگادارم بکەوە. ئەو ڕەشماڵە ماڵی خۆتە. هیچ مەترسە. خزم و کەسی دیکەشم ئاگادار کردووەتەوە. ڕۆڵە، تۆ هێشتا زۆر لاوی. من دەمێکە تۆ دەناسم. دەمزانی ئاخرییەکەی یاخی دەبی. کوڕی ئەحمەد ئەفە، هەر دەبێ ببێتە ئەفە، بەڵام با نسحەتێکت بکەم. جوان گوێ بدەیە. یاخی بەردەوام پێویستیی بە شوێنی حەوانەوە و حەشارگە هەیە. حەشارگە، گیانی یاخییە. یاخییەك، کە حەشارگەکەی ئاشکرا بێ، ئیتر تێدا دەچێ. ئێرە یەکەم حەشارگەتە، بەڵام نابێ ئیتر بە ئێرەدا بێیەوە.

چاخیرجالی نەیزانی مەبەستی بەگ چییە. هەر بۆیە پرسیی:

- ئەی بچمە کوێ؟

بەگ گوتی:

## ******* یاخی *******

باوکت ژیا و مرد و رۆیشت، بەڵام ئێستاشیێ لە گەڵ بێ کەس کەس نەیزانی لەگەڵ کێ برادەرە و لە کوێ دەنوێ. خودا نەبێ نابێ کەس بزانێ تۆ لە کوێ دەبی. دەبێ ئەوەندەت شوێنی حەوانەوە و حەشارگە هەبێ، کە پێیان وابێ، دووەمین، سێهەمین یان چوارەمین شوێنی حەوانەوەت، شوێنی نووستنی تۆیە. دەبێ سەر لە هەمووان بە تایبەتی لە حوکمەت بشێوێنی.

ئەو هۆبەیە ماڵی خۆتە. هەر تێگیراوییەکت هەبوو، ئێرە ئاگادار بکەوە. بڕوا و متمانە بەو هۆبەیە بکە. هیچ کات گومان لە دۆستایەتیمان مەکە. خۆ تێگەیشتی؟

چاخیرجالی سەری هەڵێنا و سەیری روخساری ئەو پیرە حەفتا ساڵەیەی کرد. بەژن و باڵای کەڵەگەت و ردێنیشی وەك بەفر سپی بوو. چاوە کەسکەکانی دەتگوت بەهارن.

ـ سێبەرت لەسەرمان کەم نەبێ ئاغا. تێگەیشتم.

ئاغا ئەمری کرد، مەڕێك بکوژنەوە. جا بە گەرموگوڕی میوانداریی کردن. چواردە رۆژان لەوێ مانەوە. بە رۆژ دەچوونە شاخ و شەوانە دەهاتنەوە رەشماڵ. زۆری نەبرد، ئاغا کامیل و تۆفیق بەگ و خەیلل بەگ پارەیان بۆ ناردن. خەلیل بەگ نامەیەکیشی ناردبوو و لە نامەکەیدا گوتبووی:

ـ ئەفە. هەتا ئێمە هەین، تۆ خەمی هیچت نەبێ. تا من و ئاغا کامیل و تۆفیق بەگت هەبێ، وەك ئەوەیە دەستێکت لە ئەزمیر و یەکت لە ئۆدەمیش و دەستێکی بەهێزیشت لە ئەستەمبۆڵ بە کۆشکی پادشادا هەیە.

خەلیل بەگ، دەرەبەگ بوو. باوکی هەتا زیندوو بوو، باج پیتاکی وەردەگرت. بنەماڵەشیان هەر لە کۆنەوە لەو ناوچەیەدا دەسەڵاتدار و دەستڕۆیشتوو

بوون. هەم لەبەر سەرووەت و سامانە زۆر و زەبەندەکەیان و هەمیش لەبەر ئەوەی چەند یاخییەك بە قسەیان دەکردن، لە نێو دەسەڵاتی ناوەندا دەستیان دەڕۆیشت. لەو کاتدا دەرەبەگ بە دوو شتەوە مابوون: یەکێکیان حکوومەتی ناوەند و ئەوی دیکە، یاخییەکان.

چاخیرجالی دەستی ئاغای عەشیرەتی ماچ کرد. ئاغا گوتی:

ـ خێوەت بە خێوەت بگەڕێ. رۆژێك بەکارت دێ. عەشیرەتە دوژمنەکانیشی پێ ناساند و ئاگاداری کردەوە متمانەیان پێ نەکا.

وەڕێ کەوتن و گەیشتنە لای کانییەك لە نزیك لووتکەی چیای بێش بارماق.

چاخیرجالی بە حاجیی گوت:

ـ ئەرێ حاجی، هیچ دەزانی سەرۆکی ئەو عەشیرەتە چیی پێ گوتم؟

ـ باش دەزانم.

ـ چووزانی؟

ـ دەزانم. بەتۆی گوت شوێنی خەو، بۆ یاخی، لە هەموو شتێك گرنگترە. یاخییەکی لە شوێنی خەوتن حەوانەوەی دڵنیا نەبێ، ناژیی.

چاخیرجالی بڕوای نەدەکرد، پرسیی:

ـ چما بەتۆشی گوت؟

ـ نا بەمنی نەگوت. یەکەم جار کە باوکت رووی کردە چیا، بەوی وا گوت. هەر یاخییەکی خۆش بوێ و بەهـ یی خۆی بزانێ، ئەو ئامۆژگارییەی دەکا. عێلاتی ئەگەر یاخییەکی برادەریان لە شاخ نەبێ، وەك ئەوەیە باڵێکیان شکابێ. عێلاتی یاخیی خۆی زۆر خۆش دەوێ. ئەگەر ئێمە نەبین، چەتە و ڕێگر دێن و رووتیان دەکەن.

## ****** یاخی *******

مەمەد بەخۆی گوت:

رووتیان دەکەن.

لە فکر و خەیاڵان رۆچوو.

گرویان حەسەنیش هەواڵی یاخیبوونی مەمەدی بیستبۆوە. جەندرمەکانی کۆ کردبوونەوە و لەگەڵ ملازم "حسەن ئەفەنی" دەستی کردبوو بە گەڕان بە شوێن مەمەددا. پەیتاپەیتا دەیگوتەوە:

- کوڕە وەرە سەیری ئەو هەتیوەی چاخیرجالی، تۆخواکەی. سەیری ئەو دایکەخۆگێیە. سەیری کە، لێمان بووەتە پیاو و چۆتە چیا. باوکی خۆی لەبیر نەماوە. وەك کەو راوی دەکەم. گەنجە. ئەزموونی نییە. هەر باش بوو زووی دەست پێ کرد. ئەگەر چەند ساڵێك راوەستابایە، فێری کەڵەك و کوڵەکی کارەکە دەبوو و ئەو کات هەر نەدەگیرا. برادەرەکانیشی کرچ و کاڵن. لە تێکهەڵچوونێکدا تێدا دەچن. وەك کەو راوی دەکەم.

گوند بە گوند و شاخ بە شاخی دەگەڕا، بەڵام نەیدەتوانی شوێن پێیەکی بدۆزێتەوە. هەفتەیەك، مانگێك و پتریش گەڕا و هەر نەیدۆزییەوە، بەڵام بێهیوا نەدەبوو.

***

حاجی:

ــ ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە. لە حاجی یاخیم راسپاردووە. قەول وابوو هەواڵێکی گرویان حەسەنمان بۆ بێنێ. کارێکی دیکەشمان هەیە.

بێدەنگ بوو و ماوەیەکی زۆر چوو لە بیرەوە.

## ******* یاخو *******

ئاوی کانییەکە لە لووساوکێکەوە دەڕژایە خوارێ. لووساوکەکە لە چێوی سنۆبەر دروست کرابوو. قەوزەی گرتبوو. ئاوەکە لەسەرخۆ شۆلاوگەی دەبەست و بەرەو خوار کێوەکە دەڕۆیشت. وەك ئەوەی هێلێکی زیوینیان کێشابێ. ئەمبەرەوبەری ئاوەکە چیمەنێکی تازەی لێ شین ببوو. لە دەم کانییەکە، پنگە و کلکە رێوی و گولّ شین ببوون. مێشەنگوین کردبوویانە هەللا و هەنگەمەیەك هەر مەپرسە. بن دار سنۆبەرەکان وەك دۆشەگێکی نەرم وابوو. هەموو شوێنێك، بۆنی بەهاری لێوە دەهات. بەرەبەری رۆژئاوابوونێ بوو و شنەیەکی بۆنخۆش هەڵیکردبوو. باڵندەیەك لە لکێکەوە فڕی بۆ سەر لکەکەی دی و بە دەنگێکی مەستانە خوێندی.

حەمە شوان لە حاڵێکدا تفەنگەکەی لەباوەشی گرتبوو، لەسەر زگ درێژ ببوو و سەیری ئاوەکەی دەکرد. بۆنێکی سەرخۆشکەر دەهات و پیاوی مەست دەکرد. بۆنی پنگە و قەوزە و ئاو و سنۆبەر هەموو وڵاتی داگرتبوو. شوانە گەنج بوو. بیست و شەشساڵی تەمەن بوو. کەڵەگەت و تۆکمە و بەخۆوە بوو. هەر قسەی نەدەکرد، بەڵام دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو. گۆرانیی خۆش خۆشی دەگوت. هەر قسەیەکی دەکرد:"بەچاوان ئەفە، چیی بفەرمووی. " لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە ببووە شوانی ماڵی ئاغا. ئاغا بەراتی نەدابوویە. هەر بە نانەزگی کاری پێ کردبوو. دوایی هاتە بەردەستی حاجی یاغی و بوو بە قاچاخچی. لە هەموو ئەو ساڵانەدا کە قاچاخچێتیی دەکرد، دوو شتی هەرگیز دانەدەنا، تفەنگەکەی و شمشاڵەکەی. حوکمەتی عوسمانلی باوکیی بەسەرباز گرتبوو و ناردبوویە یەمەن. باوکی نەگەڕابۆوە. کە شمشاڵی لێ دەدا و گۆرانیی دەگوت، بنیادەم لەگەڵی دەفڕی. چەنەوەڕیی نەدەکرد.

******* پلخو *******

دایکە لێقەوماوەکەی وای فێر کردبوو، کە پیاوی هەژار نابێ قسان بکا. ئاغاش هەر وای لەگوێ خوێندبوو. ئەنگێوە بوو. لە ئاسمانێ لە سکەی دراوی دەدا. کێوپارە لەوەتەی هەبوو نە دەنگخۆشی وای بەخۆوە دیبوو و نە چەکداری هێندە ئەنگێوە و دەستڕاست.

حاجی مستەفا سەری هەڵێنا و سەیرێکی شوانەی کرد. شوانە بەبێ جووڵە راکشابوو. دەتگوت نوستووە. بزەیەکی هاتێ و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ خودا نەکا ئەو سەگبابە کانییەك بدۆزێتەوە. یان ئاوا دەنوێ، یان شمشاڵ لێ دەدا یان تێی دەچریکێنێ.

شوانە پێکەنی و لەسەر خۆ هەستا. حاجی مستەفا گوتی:

ـ وەرە ئێرە شوانە. جارێ کارمان هەیە. دوایی کاتت دەبێ بنووی. ئاخر سەگباب، چما "خەو" دایکتە ئەوەندەت حەز لێیەتی و خۆشت دەوێ؟

شوانە هەر پێدەکەنی. هات و بەسەر حاجییەوە راوەستا. حاجی لەسەری رۆیشت:

ـ با بزانم تفەنگەکەت پڕە؟

شوانە هەروا بەدەم پێکەنینەوە سەری بۆ لەقاند. حاجی تفەنگەکەی شوانەی هەڵگرت و فیشەکەکانی دەرهێنا. تفەنگەکەی خۆشی بەتاڵ کرد. دیسان تفەنگیان پڕ کردەوە. چاخیرجالی ورد ورد سەیری دەکردن.

حاجی هەستا. چەند جاران دەستی بەسەر لوولە و قۆنداغی تفەنگەکەیدا هێنا. ئەوجار تفەنگەکەی هێنا و لە پێش چاخیرجالیی دانا. دەستی چاخیرجالیی گرت، ماچی کرد و لەسەر سەری خۆی دانا و لەسەرخۆ گوتی:

## ******* یاخی *******

- تۆ ئەفەی ئێمەی. خدری زیندە پشت و پەنات بێ. چاوی دوژمنت کوێر و دۆست و خۆشەویستت هەر بەهێز بن.

ئەوجار پاشەوپاش گەڕاوە. سەیری چاوی شوانەی کرد. شوانەش چووە لای چاخێرجالی. تفەنگەکەی لەبەردەمی دانا. ئەژنۆی دادا و دەستی چاخێرجالیی ماچ کرد و پاشەوپاش گەڕاوە.

چاخێرجالی چاوی پڕ بوون لە ئاو. هەستا و بەمشوورەوە گوتی:

ـ کەواتە شتەکە وەڕاست گەڕا حاجی. هەر بەراستی خەریکین دەست پێدەکەین.

حاجی سەری بۆ لەقاند. چاخێرجالی لەسەری ڕۆیشت:

- هەر بژین. خودا ڕووڕەشی لای دۆست و دوژمنمان نەکا.

لەمڕۆ بە دواوە دەبوو وەك یاخی بە نەریتی یاخیگەری هەڵسوکەوت بکەن. حاجی وازی لە کەیخودایەتی و دەمڕاستی دێنا و دەبووە تفەنگچی. بەپێی دابونەریتی یاخیگەری، تفەنگچی گوێلەمستی ئەفەیە. پرسیار ناکا. خۆی هیچ دەسەڵاتێکی نییە. قەت ناڵێ:"ئەوە دەکەم و دەچمە فلانە شوێن. ئاوا بوو یان واچوو. " تا ئەفە ئیزنی نەدا بۆی نییە قسان بکا. تفەنگچی قەت ناتوانێ جوابەجەنگێی ئەفەی خۆی بکا و بەقسەی نەکا. هەقی ناڕەزایەتی دەربڕینیشی نییە. ئەگەر تفەنگچی بەپێچەوانەی دابونەریت بجووڵێتەوە، یان بچووکترین ناڕەزایەتی دەربڕێ، تەنانەت هەقیشی بێ، دیسان سزاکەی هەر گوللەبارانە. دەستەی یاخییەکان یەك حاکمیان هەیە ئەویش ئەفەیە. کەس قسەی لە قسەیدا ناکاتەوە و بێ قسەیی ناکا.

حاجی تفەنگەکەی قیت کردەوە و گوتی:

## ******* یاخو *******

ـ ئەفەی خۆم، ئاخۆ وەك تفەنگچییەك قەبووڵم دەکەی؟

چاخیرجالی بە ئاماژەی چاو، قایل بوو.

حاجی پێنج فیشەکی بە لووتکەی چیاکەوە نا و بە لەبزێکی پاڕانەوە گوتی:

ـ ئەفەی من، تکایە شوانەش قەبووڵ بکە.

شوانەش پێنج فیشەکی بە لووتکەکەوە نا. چاخیرجالییش هەر وای کرد.

دەنگی تەقە لە چیاکە گەڕا.

چاخیرجالی سوور هەڵگەڕابوو. ئەو شەوە لە دەم کانییەکە نووستن. حاجی دەیەویست بچێتە لای رەشماڵان، بەڵام نەیتوانی. ئیتر بەدەست خۆی نەبوو. لەمەودوا تەنیا ئەفە بڕیاری دەدا و چیی بگوتبا هەر ئەوە بوو.

هێشتا رۆژ نەببۆوە، چاخیرجالی لەخەو هەستا. شوانە خەریکی ئێشکگرتن بوو. چاخیرجالی بانگی کرد:

ـ شوانە !

ـ فەرموو ئەفەی من.

ـ حاجی هەستێنە.

ـ بەچاوان ئەفە.

حاجی هەستا. لە دەم کانییەکە دانیشتن و نانی بەیانییان خوارد. لە سەر سفرە کەس قسەی نەکرد. کە لێ بوونەوە، چاخیرجالی گوتی:

ــ حاجی، ئیتر نابێ بچینە رەشماڵی عێلاتییەکان. زۆرم بیر لەوە کردووەتەوە. هیچ باش نییە. بچین چییان پێ بڵێین؟ بڵێین ئێمە یاخین؟ دەی باشە. خۆ هێشتا هیچمان نەکردووە. یاخی، لە پێشدا دەبێ شتێك بکا. دەبێ چەند شەڕێك بکا، بۆ ئەوەی لێزانی و ئازایەیی خۆی بسەلمێنێ، جا

## ******* یاخی *******

بەخۆی بڵێ یاخی. من پێم وایە هەتا شەڕێکی پیاوانە نەکەین، کەس بە پیاومان نازانێ.

چاخیرجالی ئیتر بە حاجیی نەدەگوت "مامە حاجی."

حاجی وەڵامی داوە:

- تۆ ڕاست دەکەی ئەفە. هەقتە تا خودا دەڵێ بەسە.

- دەبێ بۆسەیەك بۆ گروبان حەسەن دابنێینەوە، حاجی.

- بەچاوان ئەفە. دەبێ بۆی دابنێینەوە.

لەو قسانەدا بوون، گوێیان لە فیکەیەك بوو.

ئەفە گوتی:

- بڕۆ بزانە چ باسە حاجی.

حاجی هەستا و کەوتە ڕێ. بە فیکەیەك، جوابی فیکەکەی داوە. تاوێك دواتر لەگەڵ یەکێك هاتەوە. ئەوەی تازە هاتبوو، وەك شوانە وابوو. کڵاوێکی لبادی لەسەر و جووتێ کالەی لەپێدا بوو. شمەکەکانی شڕ بوون. کوڕێکی لەڕ و لاواز بوو. هەر ئێسك و پرووسکی مابۆوە.

- چاخیرجالی پرسیی:

- هەواڵی تازە، چیت پێیە؟

- خەریك بووم بە شوێن گروبان حەسەنەوە بووم ئەفە. دەچووە هەر شوێنێك وەك سێبەر بە شوێنییەوە بووم. لە گوندییەکان دەدا. شوێنی تۆیان لێ دەپرسی و لێیان دەدا. بە گونداندا دەگەڕێ و لە خەڵکەکە دەدا. من نۆکەری حاجی یاخیم. ئاغام ئەمری کرد، تۆ بدۆزمەوە و پێت بڵێم ئێستا باشترین هەل و دەرفەتە.

## ******* یاخی *******

چاخیرجالی گوتی:

- باشه کورم. تێگەیشتم. وەکیلی سڵاوم بە، بۆ حاجی یاخی.

ئەوجار بە حاجیی گوت:

- سەیرێکی سەروسەکتی ئەو کورە بکە حاجی. زۆر هەژارە. پێنج سکەی زێڕی مەجیدییەی بدەیە.

ئەوجار بە کورەی گوت:

- کورم. ئەو پارەیە وەرگرە و بیدە بە پێڵاو و جلوبەرگ.

حاجی پارەی دەرهێنا و دای بە کورە. کورە شەکەتی و ماندووییەکەی لەبیر نەما. چاوی بریسکانەوە و گەش بۆوە. بەدڵێکی خۆشەوە گوتی:

- ئیشەڵا چاوی دوژمنت کوێر دەبێ ئەفە. حەزرەتی خدری زیندە پشت و پەنات بێ. خدری ئەسپ خۆڵەمێشی. چاخیرجالی گوتی:

- هەواڵی گرویان حەسەنم بۆ بێنە. ئاگادار بە و ورد بزانە بۆ کوێ دەچێ و چ دەکا. بە حاجییش بڵێ، ئاگای لێ بێ.

کورە کەوتە ڕێ و ڕۆیشت.

چاخیرجالی گوتی:

ـ حاجی، دەبێ شوێنەکەمان بگۆڕین. دەچینە پشت ئەو بەرزاییەی رووبەڕوومان. شوانەش با بچێ و لە ڕەشماڵەکان بژێو و ئازوخە بکڕێ. پارەی بدەیە با بڕوا.

حاجی لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:

ئەو سەگبابە ئەفە نییە، بازرگانە. ئازوخە بە پارە دەکڕێ و پێنج سکەی زێڕ دەداتە هەتیوە بەرەڵڵایەك.

******* یاخی *******

بە بێمەیلی دەستی لە بەر پشتوێنەکەی نا و پارەی دەرهێنا و دایە شوانە.
چاخیرجالی زانیی حاجی پێی خۆش نییە. گوتی:
ـ ئەوە چییە حاجی؟ هەر دەڵێی ناڕەحەتی. خۆ هێشتا نەبووینەتە یاخی. ئەگەر بووینە یاخییەکی راستەقینە، ئەو کات ئەوانیش نانمان بە پارە نادەنێ و خۆشیان دەوێین و خۆیان بۆمان دێنن، بەڵام جارێ لە پشتەملێ خراپەمان دەڵێن. وەك دز و جەردە سەیرمان دەکەن.
ئەوجار ئاوڕی لە شوانە دایەوە و گوتی:
ـ ئەگەر پارەیان وەرنەگرت، بە زۆری بیاندەیە. پێیان بڵێ، چاخیرجالی بۆیە نەچووەتە شاخ، کە نانی هەژاران بە مفت و خۆڕایی لە چنگیان دەربێنێ، یان پارەیان لێ بستێنێ. لەبیرت نەچێ.
هاتەوە لای حاجی و دەستی لەسەر شانی دانا و گوتی:
ـ حاجی، خەریکە شتەکان باش سەردەگرن. ئێستا ئەگەر بمانەوێ، گروبان حەسەن لەبەر دەستمانە. دەتوانین وەك کەوێك بیگرین. وەك کەوێك، بەڵام وا باشە جارێ لێی گەڕێین. ماوەیەکیش با بژی و بۆ گرتنی من زوڵم لە خەڵکی بکا، بەڵام ئەو ماوەیە کە بێکارین، چ بکەین؟
حاجی:
ـ هەقتە ئەفە. لێی گەڕێ دیسان با هەر زوڵم و ناهەقی بکا. جا ئەو کات...
چاخیرجالی گوتی:
ـ بیرێکم لێ کردووەتەوە. ئاخۆ لەو دەوروبەرانە ئاغایەکی نامەردی لێ نییە کە زوڵم لە هەژاران بکا؟ کەسێك، کە خەڵك لە دەستی وەزاڵە هاتبێن؟
حاجی:

******* ياخى *******

ـ هەیە، بەڵام دەست پێی راناگا. ناوی "مستەفا ئاغا"یە. ماڵەکەی شوێنی حەوانەوەی "چریتە گەورە"یە. دوژمنی بابت بوو. چەند پاسەوان و تفەنگچی لەبەر دەرگاکەی ئێشکگرن. پیاوکوژ و چەتە دەباتە ماڵەکەی، بەڵام چیی هەژار و دەستکورتن، لێرەوە هەتا ئۆدەمیش و لە ئۆدەمیشەوە تا ئایدین بەخوێنی سەری تینوون. سووك و سانا لەگەڵ تۆ رێك ناکەوێ. ماڵ و زەوییەکەشی لە دەشتێیە.

چاخیرجالی تاوێك مات بوو و چاوی لە حاجی بڕی و ئاخرییەکەی گوتی:

یانی ئاوا. ئێستا باشترین دەرفەتە. دەچینە سەر ماڵی ئەفە ئاغا. لە دەرگای ماڵی دەدەین، ئەگەر پارەی نەداینێ، لەگەڵ خۆمان دەیهێنینە شاخ و داوای پارە لە خێزانەکەی دەکەین. ئەگەر نەیاندا دەیکوژین. تۆ شوانە بنێرە با بچێ و لە ئەگەڵ وەلی ئاغا قسە بکا و بزانێ ئاخۆ ئەفە ئاغا لە ماڵێیە یان نا.

حاجی:

ـ بۆخۆشم دوای شوانە دەچم و...

چاخیرجالی:

ـ لەشوانەی گەڕێ. من لە تەنیشت "گۆڕستانە خوێناوییەکە" چاوەڕێت دەبم. لە "بشیك جویز".

حاجی هەستا و رۆیشت. لە فکردا بوو و دەموچاوی رەش داگەڕابوو.



بارانێکی ورد دەباری. شەوێکی ئەنگوستەچاو بوو. چاوچاوی نەدەدی. وردەوردە دەهاتنە بەرەوە. لەسەر هەست بوون. دەترسان لە داو بکەون. تفەنگچییەکانی مچەئاغایان نەدەناسی. ترسی ئەوەیان بوو، یەکێك لە تفەنگچییەکان نامەردییەك بکا. شارەزای رێگەکە بوون، بەڵام دەیانویست لە رێیەکی دیکەوە لە زەوییەکەی ئاغا نزیك ببنەوە. حاجی لە پێشەوە بوو. سەد مەترێك لە پێشترەوە بوو. چاخێرجالی لە نێوەڕاستەوە و شوانەش لە پشتەوەیان دەهات. پەنجا مەترێکیان مابوو بگەنە مەزراکە، حاجی راوەستا. مەمەد شوانە هاتن و گەیشتنە لای.

چاخێرجالی:

******* يلخر *******

ئێوه بەر دەرگا بگرن با من بچمه ژووریّ. ئەگەر دەرگا داخرابوو، بە فیشەکێك دەیکەمەوه. گروبان حەسەنیش ئەگەر بیەویّ بیّ، رۆژێك دەخایەنیّ هەتا خۆی دەگەیەنێته ئێره. ئەگەر بوو بە تەقەش، زۆری گویّ مەدەیه حاجی، ئاوا باشتره.

- چما شتی وا دەبیّ ئەفەی من؟

- ئاوا باشتره حاجی.

خۆی له دیوارەکەوه فریّ دا. پێشتر فێری هەموو شتێك ببوو. دەیزانی ئاغا له کامه ژوور دادەنیشیّ. شەوانه کێی له تەنیشته. تەنانەت دەشیزانی ئاغا چەندی پاره هەیه. موو بە موو له هەموو ئەو شتانەی کۆڵیبۆوه. له دەرگای دا. له ژوورەوه پرسییان:

- کێیه؟ چ باسه؟

- مەمەدم. هاتووم ئاغا ببینم.

دەرگا کرایەوه. خۆی بەژووریّدا کرد. هەر ئەوەی که به پرسیارێکی ساده و ساکار دەرگایان کردەوه، دیاربوو مچەئاغا کابرایەکی ترسنۆك نییه. مەمەد هەر له بەر دەرگاوه رووی تفەنگەکەی له ئاغا کرد.

- مەبزوو ئاغا، ببزووی لێت دەدەم.

مستەفا ئاغا هەر نەبزووت. لەسەرخۆ هەستا و پرسیی:

- تۆ کێی کوڕم؟ چیت دەویّ.

- چاخیرجالی مەمەدم. تۆ ئێستا هەزار و سێسەد لیرەت پاره له ماڵیّ دایه. ئەگەر هەزار و دووسەتیم نەدەیەی گیانت...

ئاغا پێکەنی:

******* یاخی *******

ــ ئـەها. تـۆم ناسـییەوە. بیسـتوومە چـوویەتە چـیا. خۆشـم بـیرم لـێ دەکردییەوە. ئەو ڕۆژانە دەمویست یەکێك بنێرم و بانگهێشتت بکـەم. جـارێ وەرە دانیشت با ئاغای خۆت هەندێ ئامۆژگاریت بکا.

ـ ئەو قسە قۆڕانە بۆخۆت ئاغا. پارە دەدەیت، یان گیانت؟

ئاغا:

ـ چما تۆ نازانی کوڕم؟ چما نەتبیستووە هیچ کەس نـاتوانێ بـاج لـە مسـتەفا ئاغا وەرگرێ. تۆ ئەوەت نەزانیوە؟

ـ کوڕە بیبڕەوە کافر. لەوە پتری لێ مەڵێ. پارە لە کوێیە؟

چاوی مەمەد لە ژێللا هاتن. ئەوانی لە دەوری ئاغا بوون، ڕەنگیان بە ڕووەوە نەما.

مەمەد نەڕاندی:

سەیری ئەو کافرە بکە حاجی. دەڵێ مچەئاغا بـاج نـادا. وەرە و چـیی هەیـە لێی بستێنە دەی.

حاجی لە ئاغا چووە پێشێ:

ـ دەی پیرە سەگ. ئەگەر زووتر نەبزووی، بزانە مردووی.

ئاغا زانیی بۆ گاڵتە نابێ. دەستی کەوتنـە لـەرزین. دەیزانـی هـەر قسـە بکـا، دەکوژرێ. پێشتر زۆر یاخیی دیتبوو، بەڵام ئەوانە هاتبوون بیکوژن. دیار بوو بەر لەوەی بێن ساغ بوونەتەوە. نەخشەی خۆیان کێشاوە و بۆ هـەموو شـتێ ئامادەن. لەسەر خۆ هەستا و چووە ژوورەکەی تەنیشت. حـاجییش بەدوایـدا چوو. توورەکەیەك دراوی هەڵگرت و دای بـە حـاجی. حـاجی ئاغـای وەپـێش خۆی دا. هاتنەوە لای مەمەد. مەمەد گرماندی:

## ******* يلخو *******

ـ حاجی ئەو پارەیە هەڵڕێژە و بیژمێرە.

حاجی دراوەکەی هەڵڕشت. سکەی زێڕ لە بەر تیشکی چرا دەدرەوشانەوە.

بژاردنی. پێنجسەد سکە بوو.

مەمەد دیسان گرماندی:

ـ زۆرمان رامەگرە ئاغا.

ئاغا دیسان چۆوە ژوورەکەی تەنیشت. حاجییش بەدوایدا. ئەمجارەیان دوو تورەکەی هێنا.

مەمەد پرسیی:

ـ ئەوە هەموویەتی ئاغا؟

حاجی دیسان دراوەکەی هەڵڕشت و ژماردی. رێك هەزار و سێسەد لیرە بوو. هەر هەمووی لە تورەکەکان کردەوە.

مەمەد:

ـ حاجی، سەد لیرەی بدەوە بە ئاغا. نەکا پێویستی بە پارە بێ.

حاجی بە ناقایلی سکەکانی ژمارد و بۆی دانا و خۆی چووە دەرەوە.

مەمەد لە لای ئاغا مایەوە و بە لەبزێکی گاڵتەجاڕانەوە گوتی:

ـ ئاغا بیستبووم تۆ پیاوێکی ژیری. ئێستاش هەر دەبینم مێسکت کار دەکا. خۆزگە دۆستێکی وەك تۆم هەبوایە. خۆت بۆ پارە و ماڵی دونیا سەغڵەت مەکە. ئێمە تازە یاخی بووین. پارەمان پێویستە.

ئاغا وەك پەیکەرەیەك راوەستابوو و متەقی لێوە نەدەهات. مەمەد لەسەری رۆیشت:

ـ ماڵاوا ئاغا. لەبیرمان مەکە.

## ******* پلخو *******

ئەوەی گوت و وەدەر کەوت. حاجی لەودیو دەرگا چاوەڕێی بوو. لە دیواری حەوشەکەوە خۆیان فڕێ دا و گەیشتنە گۆڕستانەکە.

چاخیرجالی:

- دەبێ پەلەی بکەین. خۆمان بگەیەنینە ئاودڕەکە و لەوێ خۆ مات بکەین. لە نێو دەوەنەکاندا خۆمان مات دەکەین. دەڵێی چی حاجی؟

- ئەفەم باشتر دەزانێ.

چوونە نێو ئاودڕەکەوە. ماندوو بوون. بڕکەی بیبەر بە گوڵووکی وەنەوشەیی رازابوونەوە. بە هەزاران مێشەنگوین بە باڵی زەرد زەردەوە لە نێو گوڵەکاندا دەفڕین. لە بەرزایی و چیاکانەوە، بایەکی فێنك دەهات و بۆنی سنەوبەر و پووش و ئاو و بۆنی پاییزی لەگەڵ خۆی دێنا.

چاخیرجالی:

- ئەمڕۆ لێرە شەو دەکەینەوە.

حاجی وەلامی دایەوە:

- هیچ چارمان نییە.

لم و زیخی ئاودڕەکە دەبریسکانەوە. هەتاو هەموو ئاودڕەکەی پڕ کردبوو لە تیشك و ترووسکانەوە. دەوەن و دڕکەجاڕەکەیان بڕی و چوونە پێشتر. خۆیان گەیاندە دارێك و لە بنی دانیشتن.

چاخیرجالی:

- برسیمانە حاجی. وا نییە؟

حاجی: برسیمانە ئەفە.

## ******* پلخو *******

خواردنیان هێنا و لەسەرخۆ خواردیان. کە لەخواردن بوونەوە، شوانە پاڵی بە دارەکەوە دا و شمشاڵەکەی دەرهێنا و تێی تووراند. ئاگای لەخۆی نەمابوو. دەگوت هەر لە دونیاش نییە. حاجی و چاخیرجالییش بێدەنگ بوون. دیار نەبوو گوێیان لە شمشاڵەکە راگرتووە یان نا. چاخیرجالی تفەنگەکەی لەسەر ئەژنۆی دانابوو و وەك منداڵێك دەستی بە قۆنداغ و لوولەکەیدا دەکێشا و دەیلاواندەوە. حاجی جگەرەی دەکێشا.

شوانە هەتا ئێوارە هەر شمشاڵی لێ دا. هاورێکانی لە دەریای بیر و خەیاڵدا نوقم ببوون. پۆلە باڵندەیەك بەسەر سەریاندا تێپەرین. باڵندەکان رەش بوون و موویان لە بەینەوە نەدەچوو. مەمەد کتوپر هەستا. چاوی تروسکانەوە. شەپۆلێکی شادی لە گیانییەوە هەڵدەستا و هاورێکانیشی خۆشحاڵ کرد.

لە حاڵێکدا سەرکەوتووان بزەی دەهاتێ، گوتی:

- حاجی،... حاجی.

حاجی سەری هەڵێنا و نیگای پڕ لە پرسیاری لە ئەفە بری.

- حاجی هەزارودووسەت سکەی زێر...

حاجی:

- بەڵێ، وایە.

- پارەیەکی زۆر حاجی. سەروەت و سامانێکی باش...

- وایە ئەفەی من.

- حاجی، بۆ دە، پازدە گوندی داوێنی چیاکە...

- تێناگەم ئەفەی خۆم.

## ******* پلخر *******

- دوژمنێکی گەورەمان بۆ خۆمان دروست کرد. ئێستا دەبێ بیر لە دۆستێکی گەورە بکەینەوە. دۆستێکی زۆر گەورە. بەر لەوەی مشووری گروبان حەسەن بخۆین...

- تێناگەم مەبەستت چییە ئەفەم.

- کە خۆر ئاوا بوو، دەچینە ئەو گوندەی سەرەوە. هەر بەراستی حاجی ئەو گوندە ناوی چییە؟

- نازانم ئەفەی خۆم. قەت نەچوومەتە ئەوێ.

- لەمەودوا ئەو گوندانە، مەیدانی تەڕاتێنی ئێمەن حاجی.

کە خۆر ئاوا بوو، هەستان. خۆیان ئامادە کرد و کەوەتنە ڕێ. کە چوونە نێو ئاوایی، تووشی پیرەپیاوێك بوون. ڕاوەستان.

چاخیرجالی:

- من کوڕی چاخیرجالی ئەحمە ئەفەم. ناوم چاخیرجالی مەمەد ئەفەیە. ماڵی کوێخامان پێشان بدە.

پیرەپیاوەکە، هەر گوێی لە ناوی "چاخیرجالی" بوو، ڕاچڵەکی. وەپێشیان کەوت و بردنییە ماڵی کوێخا. کوێخا کە ئەوانی دی، سەری لێ شێوا.

- من چاخیرجالیم.

کوێخا بە جامەلۆسکێ گوتی:

- فەرموو ئەفەی من. بەخێر هاتی ئەفە گیان. کوڕەکەی ئەحمەد ئەفەی خۆمان... کە ئەفەی ئازیزمان کوژرا، نامەردان بوونە کەڵەگای مەیدان. ئاغا و یاخی و بەگ و ڕێگر بەربینگیان پێ گرتین. خەریك بوون خوێنمانیان

******* پلخو *******

دەمشت، کە بیستمانەوە تۆ رووت کردووەتە چیا، لە ناخی دڵەوە پێمان خۆش بوو...

بە دەم هێنانی دۆشەگچە و باڵنجەوە بۆ میوانەکان، قسەی دەکرد. دانیشتن. کوێخاش رووبەڕوویان دانیشت.

ـ شەڕانخێوی و ململانێت پیرۆز بێ ئەفەی خۆم. بیستوومە چیت بەسەر ئەو گاورە نامەردە هێناوە. هەموو گوندی کردیان ئاهەنگ و خۆشی. گوتمان راستە، ئەحمەد ئەفەمان رۆیشت، بەڵام شوکرانەبژێرین، جێی بەتاڵ نییە.

قاوە و خواردنیان هێنا. دوای خواردن دیسانیش قاوەیان هێنا.

کوێخا:

ـ ئەفەم، ئەمر و فەرمانێکی هەیە؟ پێویستیی بە شتێکە؟ منداڵم ناردوونەن دەرەوەی ئاوایی ئاگایان لە هەموو شتێك بێ. خەمی هیچتان نەبێ. بچووکترین خەبەرێك هەبێ، دێن و ئاگادارمان دەکەنەوە. ئەگەر ئەفەم ئەمرێکی دیکەی هەیە، بفەرموون.

چاخیرجالی دەستی بە قسان کرد:

ئەرێ کوێخا، لەو گوندەدا گەنجی واتان هەیە دەسگیراندار بێ و پارەی مارەیی و زەماوەندەکەی نەبێ؟ کچی واتان هەیە پارەی نەبێ جیازەکەی بکڕێ؟ ئەگەر کەسی واتان هەیە دەمەوێ زوو چاوم پێی بکەوێ.

کوێخا لە رادەبەدەر خۆشحاڵ بوو.

ـ بەچاوان ئەفەم. بەسەر چاوان ئەفەی من. هەر بژی ئەفەی من. ئەحمەد ئەفەشم هەر وا بوو.

یەکێك لە پیاوەکانی ئاوایی بە ژنەکەیەوە بانگ کرد:

******* پاخر *******

- وەرە "مەحموود" تۆش وەرە "خەجێ". کچەکەی "عەلییە زەرد" یەك. کچەکەی "عوسمان" دوو، وەلیی کوڕی "عەیشێ" یەك... کوڕەکەی "دورمووش" دوو... .

کوڕەکەی ئەفە شێتم لەبیر چوو. چما ئەو ماڵ و سامانی هەیە؟ بەڵێ ئەفەی من... لەبیرم کردبوو... چواردە کچە هەژارمان هەیە، حەوت کوڕی دەستکورتیش. لە هەژارییان هەروا بە رەبەنی ماونەتەوە و چاوەڕوانن. دەستت سووکە. .

چاخیرجالی:

- با هەمووان بێن.

هێشتا نیوسەعاتی پێنەچووبوو، چواردە کچ و حەوت کوڕ هاتن. چاخیرجالی داهاتەوە و سەبرێ بە حاجیی گوت:

- لەپێشدا کچەکان. هەر کامە و دە سکە.

دەستی حاجی دەلەرزین. هەستا. ئەفە سەری بەردابۆوە. بۆ جارێکیش چییە سەری هەڵنەهێنا سەیری ئەو کچانە بکا کە لە دەوری راوەستابوون. حاجی یەکێك لە توورەکەکانی نێو قەفی پشتوێنەکەی دەرهێنا و کردییەوە:

- کچانم، ئەو سکانە بۆ جیازی ئێوەیە. ئەفەم وای پێ باش بوو. ئەفە واتە باوك. چاخیرجالی لە جێی باوکتانە.

چواردە کچی ریز کرد و سکەکانی یەك بە یەك بە ژماردن، لە دەستیان نا. یەك، دوو، سێ، چوار...

ماوەیەك هەر زرینگەی سکە دەهات. کە لە ژماردن بۆوە، کچەکان رۆیشتن. ئەفە، رووی کردە حاجی و گوتی:

## ******* یلخو *******

- حاجی، بڵێ با کوڕەکان دانیشن. شەرم مەکەن. دیارییەکەی ئێمە شیاوی ئێوە نییە. شەرم مەکەن.

حاجی:

- ئەفەم داواتان لێ دەکا دانیشن.

ئەفە سەری بردە بن گوێی حاجی و گوتی:

- دوای ئەوەی دانیشتین و قسەمان کرد، هەر کامەیان پازدە سکەیان بدەیە. دیارە لەپێش چاوی من نا. لەوانەیە شەرم بکەن. کە چوونە دەرێ، لە گیرفانیانی بنێ، تێگەیشتی؟

- تێگەیشتم ئەفەم.

دەست کرا بە قسە. هەمووان ناڕازی بوون. لە حکوومەت، لە ماڵیات وەرگرەکان و لە جوندی. پرێسکەی دڵیان کردەوە و چییان کێشابوو هەڵیانڕشت. مەمەد بێدەنگ دانیشتبوو و گوێی دابوونێ. گوندی هاتن و پرێسکەی دڵیان کردەوە.

دوایی حاجی ئاماژەی بە لاوەکان کرد. هەمووان وەدەر کەوتن. حاجی بە بێدەنگی دراوەکانی لە گیرفانیان نا.

- ئیشەڵا بەختەوەر دەبن.

گوندەکە گیانێکی بە بەردا هاتبۆوە. لە هەموو ماڵەکانەوە دەنگی شادی و پێکەنین دەهات. دراوسێکان سەردانی ماڵی یەکتریان دەکرد و باسی ئەفەیان بۆ یەک دەکرد. ئەوانەی ئەفەیان دیتبوو، بۆ ئەوانی دیکەیان تاریف دەکرد. هەمووان حەزیان لێ بوو ئەفە ببینن. شتێکیان دەکردە بیانوو و دەهاتنە ماڵی کوێخا.

## ****** پلخر *******

ـ تەواو بوو حاجی؟

ـ بەڵێ ئەفەم.

ـ دەبێ دەسنوێژێ هەڵگرین و نوێژەکەمان بکەین.

حاجی پێی سەیر بوو. تا ئێستا نەیبیستبوو ئەفە باسی نوێـژ و تاعـەت بکـا. دوایی بیری کردەوە و تێ گەیشت. بەخۆی گوت:

ـ ئەی... چەندە زیرەکە ئەو هەتیوە. دەزانێ کوێ نیسکان دێنێ.

ئەوجار هەرای کرد:

ـ کورە دا مەسینەیەك بۆ ئەفەی من بێنن. خەریکە نوێژەکەی قەزا دەبێ.

چـاخێرجالی دەسـنوێژی هـەڵگرت و نوێـژی دابەسـت. حـاجی ورد ورد لێـی دەڕوانی. مەمـەد جـوانی نوێـژ دەکـرد و هـەموو دامودەسـتوورەکانی ڕەچـاو دەکرد. حاجی لە دڵی خۆیدا گوتی:

ـ هەی دایکەکەت... ئەو سەگبابە دەڵێ چل ساڵە نوێژان دەکـا. هـەر دەڵێـی بە ئیمانداری لە دایك بووە. وەك بڵێی چەند ساڵان پێشنوێژ بووە.

چاخێرجالی تەحیاتی خوێند و بە ڕاسـت و چـەپدا سـڵاوی دایـەوە. هەسـتا و خۆی ئامادە کرد. داهاتەوە و بە سرتەیەك گوتی:

ـ حاجی، شارەزایەك وەرگرە با وەپێشمان کەوێ بـۆ دێهاتـەکانی دەووبـەر. لە پێنج شەش ڕۆژاندا دەبێ کارەکانمان راپەڕێنین.

سەعاتێکی مابوو بۆ نیوەی شەوێ، کەوتنە رێ.

لە ماوەی شەش ڕۆژاندا دوازدە گونـد گـەڕان. پـارەی جیـاز و شـیربایی‌یان بـە گەنجە هـەژارەکان دا. پـووڵی داودەرمـانی نـەخۆش و خـواردن و جلوبـەرگی دەستکورت و برسییەکانیان دابین کرد.

## ******* پاخر *******

رۆژی حەوتەم هاتنەوە چیای بێش بارماق و لەو بەرزاییانەوە کە دەیانڕوانییە ئایدین، حەوانەوە.

ئەفە پرسیی:

ـ چەندی دیکە ماوە حاجی؟

ـ حەفتای دیکە ئەفەم. شتێکی وا نەماوە. باشە ئێستا دەبێ چ بکەین؟ چما بەو پارەیە دەژییێین؟

ـ خەمت نەبێ حاجی. ئاغامچەیەکی دیکە دەدۆزینەوە.

ـ لە کوێی دەدۆزینەوە ئەفەم؟

ـ کوڕە دونیا پڕە لە ئاغا...

ـ بەڵام زۆر ئەستەمە. خەتەرە. چەند ئاغایەکی دیکەش رووت دەکەین، بەڵام بەو تەخشان و پەخشانەی تۆ، هەر بێ پوول دەکەوینەوە. ئەوکات ئیتر دەرەقەتی دوژمنەکانمان نایەین.

چاخیرجالی بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ بەڵام لە بەرامبەر دوژمنایەتیی ئاغایەکدا، دۆستایەتیی دە گوندمان مسۆگەر کردووە. چما خراپە؟

حاجی ویستی بڵێ وا نییە، بەڵام چاخیرجالی مۆڕەیەکی لێ کردن حاجی قسەکەی لەبیر چۆوە. تێگەیشت زۆری لەسەر رۆیشتووە. هەر ئەوەندە گوتی:

ـ ئەفەم باشتر دەزانێ.

ئیتر بێدەنگ بوو.

## ******* پلخر *******

هەواڵی یارمەتییەکەی چاخیرجالی بە هەزاری دوازدە گوند وەك شنەی شادی گەیشتبووە هەموو جێیەك. لە ئایدین و ئۆدەمیش، هەر هەموویان باسی ئەوەیان دەکردز عێلاتیەکانیش لە کارینجالییەوە هەتا ئەزمیر ئەفسانە و هەقایەتیان بۆ هەڵبەست. دوای مەرگی ئەحمەد ئەفە ئەوە یەکەم ئەفەیەك بوو، جوامێری بنوێنێ و یارمەتیی هەتیو و بێوەژنان بدات. ئەفەکانی دیکە دارەدەستی ئاغاکان بوون.

ئەفە نوێژی دەکرد و سەیری کچانی نەدەکرد. کەوابوو وەلی بوو. گوللە نەیدەبڕی.

خەڵکی ساویلکە ، چەوساوەی دێهات، پاڵەوانەکەی خۆیانیان خۆش دەویست و گەلێك ئەفسانەیان بۆ ساز کردبوو.

بەڵام ئەوە بووە هۆی ئەوەی نۆ یاخیی "ئەلبانیایی" ناوی چاخیرجالی لەخۆیان بنێن و خەڵك تاڵان بکەن. تەنانەت دەستدرێژییان کردەبووە سەر ناموسی خەڵکییش. چاخیرجالی هەر هەموویانی گرت و لە سەر کڵی ئاگری خستن. ورد ورد ئاگای لە دەوروبەری خۆی هەبوو.

ڕۆژێکیان گوتی:

ـ حاجی، کارەکانمان چۆن بوون؟ هەتا ئێستا بە دڵت بووە؟

حاجی قاقا پێکەنی:

ـ ئەو چیایانە، ئەفەی وەك تۆیان بەخۆوە نەدیوە. خدری زیندە پشتیوانت بێ.

ـ تەواوە حاجی؟

ـ تەواوە ئەفەی من.

## ******* یاخر *******

- پێت وایە تۆرەی گروبان حەسەن هاتبێ؟

- بەڵێ ئەفەی من.

- وا باشە مشووری بخۆین. زۆر لەمێژە زوڵم دەکا. بەسیەتی. ناهەقییەکانی سنووریان بەزاندووە. زۆر دەمێکە فرمێسك بە خەڵکی هەڵدەڕێژێ. تەنانەت لێی حەرمامە هەناسەیەکی دیکەش هەڵکێشێ.



# ٦



گۆڕستانێك لە نێوان هەر دوو گوندەكەی ئۆدەمیش و "قایماقچی"دا هەیە. چاخیرجالی لەوێ بۆسەی ناوەتەوە. دوێ شەوێ گروبان حەسەن و چاخیرجالی لە یەك ماڵدا نووستوون. وا دەگێڕنەوە: چەندی چەند ڕۆژان چاخیرجالی بەشوێن گروبانەوە بووە. لەو لاشەوە گروبانیش هەر بەدوای ئەوەوە بووە.

چاخیرجالی لە ماڵەكەی كوێخا خەریك بووە پشوو بدا، هەواڵی پێ دەگا:

- گروبان حەسەن هاتە ئاوایی.

چاخیرجالی هەر گوێی لێ بوو، بە خاوەنماڵی گوت:

- كوێخا، بڕۆ گروبان بانگ بكە با ئەمشەو لێرە بمێنێتەوە.

## ******* پلخو *******

کوێخا سەری لێ شێوابوو. شتی وا چۆن دەکرێ؟ هەم چاخیرجالی و هەم گرووبان لە ماڵێکدا؟ دوو دوژمنی قەستەسەر... خۆی خستە سەر پێڵاوەکانی ئەفە:

ـ نەکەی ئەفە. کارێك نەکەی لە ماڵەکەی مندا خوێن برژێ.

چاخیرجالی:

ـ تۆ بانگی بکە کوێخا. کارم پێی نییە. من دەچمە نهۆمی خوراوە و تا بەیانی لەوێ دەبم. زۆریش مەمنوون دەبم. منداڵەکانیشت دەنێریتە لای من.

خاوەن ماڵ قایل بوو.

چاخیرجالی:

ـ بەیانی زوو زووش من وەرێ دەکەوم و دەڕۆم و دەچمە گۆڕستانەکەی سێ ڕێیانی "قایماچی". تۆ پێی دەڵێی چاخیرجالی چووە قایماقچی. ئەو کاتە گروبان بەدوام دەکەوێ. تێگەیشتی؟

ئەگەر تێشنەگەیشتبایە، دەیتوانی چ بکا؟ دەچێ و گروبان بانگهێشت دەکاتە ماڵەوە. گروبان دێ. گروبان حەسەن لە نهۆمی سەرەوە و چاخیرجالی لە خوارەوە. ئاوا شەوێ ڕۆژ دەکەنەوە.

کوێخا هەر نیگەرانی ئەوە بووە شتێك بقەومێ. لە ترسان خەوی لێ نەکەوت، بەڵام هیچ رووی نەدا.

هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو، کە چاخیرجالی وەدەر کەوت. چووە گۆڕستانەکە و بۆسەی نایەوە. گروبان ئەفسەرێکی گەنجیشی لەگەڵ بوو. ملازم "حەسەنی ئەفەنی"یان پێ دەگوت. گەنجێکی چاونەترس بوو. چەند ساڵان یاخیی راو نابوو و ئەزموونی کۆ کردبۆوە. دەگێڕنەوە ئەو ملازمە، لە قۆناغی

## ******* یاخی *******

سەرەتاییدا هاوپۆلی چاخێرجالی بووە. لە ڕاستیدا ئەو دووانە برادەری منداڵیی یەکتری بوون.

هەموو شتێك بە دڵی چاخێرجالی سووڕا. حەسەنی ئەفەنی و گروبان حەسەن لە پێشەوە و جەندەرمە بەدوایانەوە... هەر دووکیان بە سواری. تەواو گەیشتنە بەرسێرەی چاخێرجالی.

چاخێرجالی لە سەنگەرەکەیەوە نەڕاندی:

- هۆۆۆی گروبان، گروبان حەسەن. ئەو چاخێرجالییەی لێی دەگەڕێی منم. ئێستا تۆڵەم باوکم و ئەو سووکایەتییانەت لێ دەکەمەوە بە دایکمت کردوون... هەی ژن قەحپە... کافر.

چاخێرجالی تەقەی کرد. گروبان گلا و کەوتە بەرپێی ئەسپەکەی. حەسەنی ئەفەنی دەستی بۆ تفەنگ برد و تەقەی کرد. بە ئەسپەوە هێرشی بۆ چاخێرجالی برد:

- چاخێرجالی:

- مەیە پێش حەسەن ئەفەنی. تۆ بێتاوانی. بەزەییت بەخۆتا بێتەوە. من و تۆ نان و نمەکی یەکتریمان کردووە. مەیە پێشێ.

حەسەن ئەفەنی نەترسا و هاتە پێش.

ئەفە:

- چوانە، لە لاقی بدە.

شوانە سێرەی لێ گرت و پێوەی نا. فیشەکەکە ڕانی گروبانی سمی و گەیشتە زگی. حەسەن ئەفەنییش لە ئەسپەکەی بەربۆوە.

## ******* یاخی *******

تفەنگە سەدەف نیشانەکەی ئەحمەد ئەفە، باوکی چاخیرجالی بە گروبان حەسەن بوو. کە بە نامەردی ئەوی کوشت، تفەنگەکەی هەلگرتبوو. گەورەترین ئارەزووی مەمەد ئەوە بوو، گروبان بکوژێ و ئەو تفەنگە بۆ دایکی بەرێتەوە. ئێستا تفەنگەکە کەوتبووە لایەك و گروبانیش بەلایەکی دیکەدا، بەلام کەس نازانێ بۆ چاخیرجالی دانەهاتەوە بۆ تفەنگەکە و لێی دا رۆیشت. لەو رۆژە بەدواوە، ناوبانگی چاخیرجالی بەهەموو ولاتدا بلاو بۆوە. حکوومەت گرنگییەکی تایبەتی پێ دا و کامە جەندرمەی هەرە ئازای هەبوو، تەرخانی کرد و ناردییە شوێنی.

***

رۆژێکیان پیاوانی حکوومەت بیستیانەوە کە چاخیرجالی لە چیای بۆزداغە. چیی جەندەرمەیە کۆیان کردنەوە و بە فەرماندەیی "حافز ئیلهامی" ناردیانن بیگرن. چاخیرجالی بە یەك هێرش هەمووی سەکەت و قەلتوبڕ کردن. خەلکی ناوچەکە ئەوەندەی یەك و دوو، هەوالی ئەو سەرکەوتنەیان بیستەوە. چاخیرجالی رۆژ بە رۆژ گەورەتر و بەهێزتر دەبوو. خەلکی ئاساییش لێی دەترسان و زۆریشیان خۆش دەویست، بەلام جەندرمە هەر لێی تۆقیبوون و لێی دەترسان.

چاخیرجالی:

ـ حاجی!

ـ فەرمووو ئەفەی من.

ـ کورە ئاوا نابێ. هەموو رۆژێ شەڕ و تێکهەلچوونێك. ئاخری هاکا دیتت رۆژێك گوللە بەرەللایەك، فیشەکێکی وێل...

ـ راست دەکەی ئەفەی من.

## ******* يلخو *******

ـ دەبێ کارێکی وا بکەین، تووشی جەندرمان نەبین.

ـ جا چۆن ئەفەی من؟

ـ دەبێ رێیەك بدۆزینەوە. بیرێکی لێ بکەوە حاجی. ئاوا نابێ نا.

ئەو شەوە لە رەشماڵی عێلاتییەکاندا نە ئەفە خەوی لێ کەوت و نە حاجی.

کە رۆژ بۆوە، حاجی هاتە لای ئەفە.

ئەفە:

ـ قسە بکە حاجی.

ـ حاجی گەش بوو:

ـ با ئەفەم قسە بکا.

قەڵافەتی ئەفە شێلگیرانە بوو:

ـ دەبێ چەند دەستە چەکداری دیکە رێك بخەین. هەمووشیان ناو دەنێین دەستەی چاخیرجالی مەمەد. تێگەیشتی؟

ـ منیش هەر پێم وایە.

لەو کاتەدا، چەند پیاوی جێ متمانەی دیکەش هاتبوونە نێو دەستەکەیانەوە. هەر هەمووشیان پیاوی ئازا و چاونەترس بوون: "ئەحمەد"ی کوڕی "هارمانلی"، "قۆجە مەمەد"، "مەرجان عەرەب"، یەکێکیشیان "عەلییە رەش". عەلییە رەش یەکێك بوو لەو سەربازانەی لە یەمەن رای کردبوو و ئێستا قاچاخچێتیی دەکرد. دەستەکەیان تەواو قەرەباڵغ ببوو و چاخیرجالی دەستی کرد بە بەڕێوەبردنی نەخشەکەی خۆی. دەستەیەکی نوێی پێك هێنا و عەلییە رەشیشی کردە سەردەستەیان. دوای ئەو دەستەیەکی پشتیوانییشی دروست کرد. سەردەستەی ئەوانەش پیاوێك بوو بە ناوی "ئەفە گۆج". چەند گەنجێکی دیکەش، تاقمێکی دیکەیان رێك خستبوو، کە

## ******* یاخی *******

گەنجێك بەناوی "عوسمانە چكۆڵ" بەسەریان رادەگەیشت. ئێستا ئیتر چاخیرجالی تا رادەیەك باری سووك ببوو. دەستە چەكدارەكان دەگەیشتنە هەر جێیەك و هە چییەكیان دەكرد، ناوی چاخیرجالییان دێنا و بەناوی ئەوەوە دەیانكرد. بۆیە ئەمنییە پێیان وابوو چاخیرجالی لە هەموو شوێنێكە. لە راستیدا سەردەستە جێگرەوەكان، شوێنەونكەیەك بوون بۆ چاخیرجالی. ئیتر ئەمجار ئەسپیان بەرەو هەموو لایەك تاو دەدا.
بەلام بەو دواییانە سەرئێشەیەكی دیكەیان بۆ پەیدا ببوو. ئەودەمی حكوومەتی ناوەندی زۆر لاواز بوو و كەسانێكی دیكەش ئەو لاوازییەیان قۆستبۆوە و چووبوونە چیا، كەسی وەك "مەمەد كەمالی"، "چاملیجالی حوسێن"... و چەند تاقمی بچووكی دیكەش، ئەوانە هەر هەموویان بە خوێنی سەری چاخیرجالی تینوو بوون. چونكە دارەدەستی ئاغا كان بوون و بە ئەمری ئەوان هەڵیاندەكوتایە سەرماڵی وەرزێرە لێقەوماوەكان. لە خاوەن ماڵیان هەڵدەدا و ماڵەكەیان بەتالان دەبرد و هەرچی هەشیبوو دەیان-سووتاند. چاخیرجالی دژی ئەو كارانە بوو، هەر بۆیەش ئەوان بە خوێنی سەری چاخیرجالی تینوو بوون.
بەڵێ چاخیرجالی ناچار بوو، هاوكات لەگەڵ سێ هێزی ملۆزمی دیكەشدا بەشەڕ بێ. لە لایەكەوە ملی لەبەر ملی حكوومەت نابوو، لە لایەكی دیكەوە شەڕی ئاغاكانی دەكرد و یاخییە تازە پێگەیشتووەكانیش هەر بەراستی كێشە و سەرئێشە بوون.

***



دامودەزگا و ڕێکخستنی چاخیرجالی تەواو و کامڵ بوو. حەشارگەکانشیان لە شوێنی قایم و جێی دڵنیایی دروست کردبوو. لە هەموو لاوە پارەی بەسەردا دەباری. ئاغا و بەگزادان هەوڵیان دەدا بە پارەی زۆر چاخیر جالی بەرەو خۆیان راکێشن. چونکە هەر ئاغایەکی دەستەیەکی بەهێزتری لە شاخ هەبوایە، لە شاری باشتری ئاغایەتی پێ دەکرا.

لە رەشماڵێ دانیشتوون. چاخیرجالی بەهێزتر و چاونەترستر بووە. ئێستا ئیتر دەزانێ چەند بەهێزە و دەست بۆ کاری بچووک نابا.

ـ حاجی!

ـ فەرموو ئەفەی من.

## ******* یاخی *******

ـ ئیتر کاروبارەکان کەوتوونە گەڕ و حەشارگەش تەواو بوون. کاتی ئەوەی هاتووە ماوەیەك خۆ بشارینەوە.

ـ وایە ئەفەم.

ـ جارێ نابێ لەگەڵ جەندرمان تێك بگیرێین.

ـ راست دەکەی ئەفەم.

چەنەیان لە قسەکردنێ گەرمدا هاتبوو، کە تفەنگچیی ئێشکگر، شوانێکی ناردە لایان. شوانە شەلاڵی ئارەقە و ماندوو شەکەت بوو. هەر گەیشتێ، بە هانکەهانك گوتی:

ـ ئەفەم، دەستەکەی "ئەفە گۆج" لە لای بۆمچا لەگەڵ جەندرمە تێك هەڵچوون. خەریکن لێك دەدەن، بەلاّم لە جێیەکی زۆر ئەستەم و خراپ تێکەوتوون. چەند هاورێیەکت کوژراون... .

ئەفە:

ـ حاجی، ئەو شوانە خەلاّت بکە و هەستە با برۆین. دەبێ بەهانای کورەکان بگەین. لەوانەیە بگیرێن. پێت چۆنە؟

ـ ئەفەم باشتر دەزانێ.

ـ دەبێ بگەینە فریایان.

یەکێ لەو شتانەی چاخیرجالیی کردبووە ئەو چاخیرجالییە، گورجوگۆڵی و خێراییەکەی بوو. گەورەترین هۆکاری سەرکەوتنەکەشی هەر ئەو تەردەستی و گورجوگۆڵییەی بوو. تەنانەت زۆر زۆریش سەرقاڵ بوایە، دیسانیش هەر دەیتوانی بە چارەگێك، سەعاتە رێیەك ببڕێ.

## ******* پلخو *******

گەیشتنە شوێنی شەڕەکە. هەتا گەیشتنێ، چاخیرجالی هەموو شتێکی بۆ روون بۆوە و زانیی کوڕەکان کوژراون و عوسمانەچکۆڵ سەرەڕای ئەوەی هێشتا مێرمنداڵێك بوو، بەتاقی تەنێ لەبەر جەندرمەکان راوەستابوو و دەستی دەکردەوە. لە دوورەوە هەرای کرد:

- گەیشتمێ، عوسمان. دەست بەرنەدەیەوە.

لە پڕ پەلاماری جەندرمەی دا. ئەوەندەی یەك و دوو جەندرمەیەك بەزیندوویی نەما. هەموو تێدا چوون. فەرماندەکەیان ئەفسەرێك بوو بەناوی "مستەفا ئەفەنی". ملازم بوو. مستەفا ئەفەنی لەگەڵ دووی دیکە، بەرەو شیوەکە تێیان تەقاند بۆ ئەوەی خۆیان قوتار بکەن. بە رواڵەت توانیبوویان خۆیان رزگار بکەن، چونکە چاخیرجالی لەلای سەروو بوو، بەڵام لەپڕ بەسەر عوسمانەچکۆڵدا کەوتن، کە پێشی گرتبوون و سێرەی لێ گرتبوون:

- خۆ بەدەستەوە بدەن.

مستەفا ئەفەنی بەناچار خۆی بەدەستەوە دا. عوسمانەچکۆڵ هێنانییە لای ئەفە. چاخیرجالی دوژمنی قەستەسەری جەندرمان بوو. هەر دیتنی، ئەمری بە حاجی کرد:

- ئەوانە بکوژن.

ئەوجار رووی کردە مستەفا ئەفەنی و گوتی:

- هەی گەوادی بێناموس. چۆن دڵت هات تەقە لەو عەگیدانەی من بکەی؟ خۆت کەسی وات هەیە؟ زوو بە بڵێ بزان سەگباب، دایك سەگ، بڵێ.

مستەفا ئەفەنی جوابێکی لە مستی نا، هەمووان سەریان سووڕ ما:

- دایك سەگ بۆخۆتی.

## ******* پلخو *******

چـاخیرجالی چـاوەڕێی وەهـا وەڵامێـك نـەبوو. ڕاچـڵەکی و بەتووڕەییـەوە پرسیی:

- چیت گوت؟ دا دووپاتی بکەوە؟

- گوتم دایك سەگ خۆتی چاخیرجالی.

- هەی قوڕت بەسەری سەگباب.

- من پێم وابوو تۆ کابرایەکی جوامێری. هەندێ شتم لە بارەتـەوە بیتسـبوو و پـێم وابـوو، هــەر بەراسـتی ئەفـەی، بـەڵام ئێسـتا بـۆم ڕوون بـۆوە، ئـەتۆ چاخیرجالی نی. ئەفە نی. ئەفەیەکی ڕاستەقینە جنێـو بـە دیـل و یەخسـیری بەردەسـتی نـادا. یـان دەیکـوژێ یـان ئـازادی دەکـا. تێگەیشـتی زۆڵـی حەرامزادە؟

چـاخیرجالی تفەنگەکـەی لەسەرپێ بـوو، بـەڵام کـە گـوێی لـەو قسـانە بـوو، دەستی شل بۆوە. تفەنگەکەی دانواند.

- حاجی، مستەفا ئەفەنی ڕاست دەکا. پیاوێکی ئازایە. هەتا ئێستا نەمدیتبوو پیاوی حوکمەت ئەوەندە ئازا و نەترس بێ. ئەوە لێی خۆش بووم، بەڵام هەر دوو پاژنەی پێی سەقەت بکەن با ئیتر نەتوانێ بەدوامان بکەوێ.

مستەفا ئەفەنییان درێژ کرد. خەنجەرە تیژەکەیان دەرکێشا و دەستیان کـرد بە کەوڵکردنی پاژنەی پێی. ئەفـەنی نقـەی لێـوە نـەدەهات و مەردانـە خـۆی لەبـەر ئازارەکـە ڕادەگـرت. نـە هـاوارێکی دەکـرد و نـە دەشـپاڕاوە، بـەڵام ڕوخسـاری وەك مـردووان سـپی هەڵگـەڕابوو. پاژنـەی پێـی خـوێنی لەبـەر دەڕۆیشت. خوێنەکەی لە قووڵکەیەکدا کۆ ببۆوە و پڕی کردبوو.

چاخیر جالی سەیری دەکرد. لەپڕ سەری ڕاوەشاند و گوتی:

## ****** یلخو *******

- بەری دەن. مستەفا ئەفەنی بەردەن.

ئەوجار رووی کردە حاجی و بە نارەحەتییەوە گوتی:

- ئازا و بوێری چۆن هەڵدەکەون! ئەو مەملەکەتەی ئێمە، جوامێری چۆنی لێ هەڵدەکەوێ! پیاوی وەك مستەفا ئەفەنی زۆر بەکارمان دێن. ئێمە پێویستمان بە پیاوی ئاوایە، بەڵام حەیف بە دەست عوسمانلییەوەن... حەیف...

دەستەکەی ئەفە گۆج تێدا چووبوون. دەبوو پیاوی تازە بدۆزنەوە. لە لای عوسمانلی پیاوی وەك مستەفا ئەفەنی هەن. دەبێ قورس و قایم راوەستین.

***

لە چیا ئاگریان کردبۆوە. تیشکی ئاگرەکە دار سنۆبەرەکانی رووناك کردبۆوە و دارەکان جوانتر دەبینران. بەرخێکی قەڵەویان لەسەر ئاگرەکە دەخولاندەوە. چاخیرجالی شەکەت بوو. ئەوەندەی بیر کردبۆوە، ماندوو ببوو.

- بڵێ بزانم حاجی، چیت بە مێشکدا دێ؟ کێ جێی ئەفەگۆج پڕ دەکاتەوە؟

- کەسی وا ناناسم بەڵام...

- دەی بڵێ حاجی، بەڵام چی؟

- جارێ کەسێك دەناسم بەناوی "یۆسلۆ ئۆغلی مەمەد"، کە تازە لە زیندانێ بەر بووە و بە خۆی داروەدستەکەیەوە لە گوندێك دەژی.

- دەی؟

- ئەفەم دەڵێ چی؟

## ******* یاخی ******

- بیستوومه پیاوێکی ئازایه. تۆ دەڵێی چی؟ تۆ بڵێی قەبووڵمان بکا؟ بڵێی رەگەڵمان بکەوێ؟

- ئەگەر ئەفەم بیەوێ، دەچم و دەراوەکەی تاقی دەکەمەوە.

- دەبێ ببینم. هەر ئەمشەو دادەگەڕێین. دوو تفەنگچی بنێرە بەدووی پۆسلۆ ئۆغلێدا.

پۆسلۆ ئۆغلی بەر لەوەی بگیرێ، ئەفە بوو. گەنج و ئازا بوو. هەر جوامێرییەکەشی وای لێ کرد بە داوەوە بێ. بۆ ئەوەی هاوڕێ بریندارەکەی بەجێ نەهێڵێ، ناچار ببوو خۆی بدا بەدەست جەندرمەکانەوە. ئێستاش سێ ساڵ بوو لە زیندانێ بەردرابوو. بەسەرهاتەکەی ئاوا بوو: دەکەونە بۆسەی جەندرمانەوە. یەکەم ساتەکانی تێکهەڵچوونیان، دوو کەس لە تفەنگچییەکانی بریندار دەبن. پۆسلۆ ئۆغلی دەچێتە بن پیلی هاوڕێکانی و هاوکات دەستیش دەکاتەوە، بەڵام ئاخرییەکەی دەبینێ درەقەتیان نایە. ئەگەر برادەرەکانی بەجێ هێشتبایە، دەیتوانی را بکا. هاوڕێکانی دەڵێن:"تۆ رابکە و خۆت قوتار بکە. ئێمە تازە هەر تێدا دەچین. " بەڵام ئەو پێشنیارە بۆ پیاوێکی وەك پۆسلۆ دڵتەزێن و جەرگبڕ بوو. لە جوابیاندا دەڵێ:"ئەفە، ئەگەر ئەفە بێ، قەت لە رۆژە ئەستەم و رەشەکاندا هاوڕێی خۆی بەجێ ناهێڵێ و راناکا. ئەوە رێوشوێنی پیاوەتی نییە. ئەگەر هەر دمرین، با پێکەوە بمرین. " کە فیشەکی لێ دەبڕێ، ئیتر ناچار دەبێ خۆی بەدەستەوە بدا.

پۆسلۆ ئۆغلی پیاوێکی ئاوا بوو. تفەنگچییەکی لێهاتوو بوو و لە پیاوەتیشدا کەس تۆزی نەدەشکاند. چاخیرجالی هەموو ئەو شتانەی دەزانی. دەیزانی پۆسلۆ ئۆغلی بەم زووانە روو دەکاتە چیا. دەبوو تا زووە کارێکی وا بکا،

******* يلخو *******

بیهێنێتـه نێـو داروده‌سـته‌كه‌ی خـۆی. ئـه‌گینا له‌وانـه‌بوو، ببێتـه خـه‌نیمی. خه‌نیمێكی زۆر خه‌ته‌ریش.

تفه‌نگچییه‌كان هاتنه لای پۆسلۆ ئۆغڵی و گوتیان:

ـ ئه‌فه ناردووینی. كاری پێته. له سه‌ر گرده‌كه چاوه‌ڕێته.

پۆسلۆ ئۆغڵی چاوه‌ڕوانی ئه‌و بانگهێشتنه بوو. ده‌یزانـی چـاخێرجالی كـه‌یفی پێی نایه، به‌ڵام باشه ئه‌ی چۆن بوو بـانگی ده‌كاتـه لای خـۆی؟ نه‌یـده‌توانیٚ نه‌چـیٚ. لـه دونیـای ئه‌فه‌یه‌تیـدا ئـه‌و شـته سـه‌یر و سـه‌مه‌ره بـوو، ئه‌گـه‌ر نه‌چووبایه، ده‌یانگوت، ترسا و نه‌هات.

تفه‌نگچییه‌كان گوتیشیان:

ـ ئه‌فه گوتی هاوڕێكانیشت بێنه.

كه‌وابوو جێی تـرس نـه‌بوو. داوای لـیٚ نـه‌كردبوو بـه تـه‌نیٚ بچـیٚ. هاوڕێكـانی ئاگادار كردنه‌وه و هه‌موو كۆ بوونه‌وه و ته‌گبیر و رایان كـرد و سـاغ بوونـه‌وه بچن.

پۆسلۆ ئۆغڵی به تفه‌نگچییه‌كانی چاخێرجالیی گوت:

ـ ئێوه برۆن و به ئه‌فه بڵێن دێین.

ئه‌وه‌یكه پۆسلۆ ئـۆغڵی تفه‌نگچـییه‌كان له‌پێشـدا ده‌نێرێتـه‌وه و خـۆی دوایـی دیٚ، ده‌كرا له‌به‌ر دوو هۆ بیٚ. پۆسلۆ ئۆغڵی یان ده‌یه‌ویست بڵیٚ، متمانه‌ی به چاخێرجالی هه‌یه یان ده‌یه‌ویست بۆی بسه‌لمێنیٚ، لێی ناترسیٚ.

چاخێرجالی به روخسارێكی گه‌ش و لێو بـه‌بزه و زۆر دۆسـتانه پێشـوازیی لـه پۆسلۆ ئۆغڵی كـرد. دانیشـتن. پۆسـلۆ ئـۆغڵی لـه شـانی چـه‌پی چـاخێرجالی

******* پاخو *******

دانیشت. تفەنگەکەی لەسەر کۆشی دانابوو و لە حاڵێکدا رووی تفەنگەکەی لە چاخیرجالی بوو. چاخیرجالی کە ئەوەی دی گوتی:

ـ ئەوە یانی چی، پۆسلۆ ئۆغلی؟ من وەك هاورێیەك ئێوەم بانگهێشت کردووە. زۆر کار هەن کە ئێمە دەبێ بە هاوکاریی یەکتر رایانپەڕێنین، بەلام تۆ رووی تفەنگەکەت لە من کردووە. ئەو چاوەڕوانییەم لەتۆ نەبوو پۆسلۆ ئۆغلی.

پۆسلۆ ئۆغلی بە ئەنقەست وای کردبوو. بەپێی بنەما و رێسای ئەفایەتی، واتای ئەو کارە ئەوە بوو:"ئەگەر تۆ خۆت بەپیاو دەزانی، منیش پیاوم. هیچ لێت ناترسم. هیچیشیت پێ ناکرێ. لێت سوور بێ. "

بەلام لە رواڵەتدا گوتی:

ـ پێت ناخۆش نەبێ ئەفە. مەبەستێکی خراپم نەبوو.

ناخۆشییان کەوتە نێوان، بەلام چاخیرجالی پێناخۆشبوونەکەی وەسەر خۆی نەهێنا. هیچی نەگوت، بەلام لە دڵیدا زۆر نارەحەت بوو. ئای خۆزگە بانگی نەکردبا، بەلام چار چییە؟

هەر بەو لەبزە خۆمانەیەوە گوتی:

ـ دەی چ نییە. ئەو شتانە هەر دەبن دەی. من و تۆ کاری گەورەترمان لە پێشە. نابێ خۆمان بەو شتە بچووکانەوە بخافڵێنین. خەریکن زوڵم لە خەڵکی دەکەن ئەفە. هەر بۆیەشم بانگ کردی. ئەلبانیای و ئاغا و دەرەبگ زوڵم دەکەن. رۆمی و عوسمانلی زوڵم دەکەن. هەر بۆیەم بانگ کردی.

چەنەیان گەرمدا هاتبوو، کە چەند دێهاتییەك گەیشتنێ. هەرکام دونیایەك دەرد و داخیان لەدڵدا بوو. هاتن و سکالای خۆیان کرد.

## ******* پلخر *******

که دێهاتییەکان ڕۆیشتن، چاخیرجالی گوتی:

- لەبەر ئەوە بانگهێشتم کردی. دەی دەڵێی چی؟

پۆسۆ ئۆغڵی بیرێکی لێ کردەوە و گوتی:

- دەبێ یەك بگرین ئەفە.

بەوە نییەتپاکیی خۆی نیشان دا.

- ئەمن لەتۆ گەورەترم. بۆیە دەبێ ببیتە تفەنگچیی من.

- دەبم ئەفە. بە مەرجێك.

- چ مەرجێك؟

- هەر کاتێك و بۆ هەرجێیەکی پێم خۆش بوو، تفەنگچییەکانم هەڵگرم و بڕۆم.

- باشە ئەفە.

پۆسلۆ ئۆغڵی دەستی چاخیرجالیی ماچ کرد و بوو بە تفەنگچیی ئەو.

هەستان و کەوتنە ڕێ. ئەو شەوە چەند ئەلبانییەکیان لەوانەی گوندی لەدەستیان وەزاڵە هاتبوون، کوشت. زۆر شتیان لەو ڕۆژانە دەگێڕنەوە و ڕاستییەکەی زۆر روون نییە. هەندێ دەڵێن پۆسلۆ ئۆغڵی و چاخیرجالی لەو پەلامارەدا بیست ئەلبانیایی و سێ چەرکەزیان کوشتبوو، لە حاڵێکدا ناویان دەپرسین و لە هەڵسوکەوتیان ورد دەبوونەوە:

- کوڕە کێی؟

- شوانم.

- دەی؟

- کارم هەیە. دەمەوێ بچمە گوندی ئۆدەمیش. مێگەلەکەم لەوێ...

- ئەوە ئەلبانیاییە ئەفە...

## ******* پاخر *******

- بیکوژن.

بەو جۆرە نزیك بە چل کەسێك، بە رواڵەت بێتاوان کوژرابوون.

گەیشتنە مەزرایەك. خاوەن مەزراکە، وەك هەموو خاوەن مەزرایەکی دی، دۆست و هاوکاری چاخێرجالی بوو.

چاخێرجالی:

- ئاغا، ئەمڕۆ تفەنگچییەکانم زۆریان کار کردووە. ماندوون. ئەمشەو دەبێ سفرەیەکی باشیان بۆ براژێنییەوە. دەبێ ئەوەندەیان ئارەق بۆ تێکەی، تا هەموو مەست و کەلەلا دەکەون.

ئاغا:

- بەسەرچاو ئەفە.

شەوێکی ئەنگوستە چاو بوو. سفرە راخرا. خواردن و خواردنەوە بەپێی فیلان بوو. تفەنگچی بێ شەرمکردن دەیانخوارد و سازیان لێ دەدا و گۆرانییان دەگوت و مەستانە سەمایان دەکرد. چاخێرجالی نەیدەخواردەوە. کتوپڕ لە هەڵڵا و هەنگەمەکەدا هەلی بە دەرفەت زانی و هاتە دەرێ. حاجی لە دەرەوە بوو.

چاخێرجالی:

- حاجی بە شوانە بڵێ نەخواتەوە. من و تۆ لەگەڵ پۆسلۆئۆغلی لە ژوورێکدا دەنووین. تێگەیشتی حاجی؟ تا من تەفە نەکەم، کەس نابێ تەقە بکا.

- تێگەیشتم ئەفەی من.

وەژوور کەوت و نوێژەکەی کرد.

پۆسلۆ ئۆغلی و هاوڕێ و تفەنگچییەکانی هەموو سەرخۆش بوون.

## ******* پاخر *******

- با بنووین.

پۆسلۆ ئۆغلّی هەستا و لە حاڵێکدا بەلادا دەهات و لەتری دەدا، چووە جێوبانەکەیەوە و لێی نووست. تفەنگچییەکانیشی هەروا. چاخیرجالی و حاجی و حەمە شوانیش چوونە ئەو ژوورە. رووت بوونەوە و نووستن.

چاخیرجالی خەوی نەدەهات. خەیاڵێکی ناخۆشی لە سەریدا بوو: یانی پۆسلۆ ئۆغلّی دەبێ بکوژرێ؟ پیاوە. ئازایە. گەنجێکی جوان و زیکەڵەیە. دەڵێی خەڵفی چنارە..، بەڵام باشە ئەو تفەنگەی بۆ وا دانابوو؟ ئەگەر نەیکوژێ، دەتکوژێ. دڵنیابە دەتکوژێ. داماو.

گوێی هەڵخست. پۆسلۆ ئۆغلّی و تفەنگچییەکانی لە شیرین خەودا بوون و پرخەی خەویان دەهات. بە نابەدڵی هەستا و حاجی و شوانەشی هەستاند. ئەوانیش هەستان. لوولەی تفەنگەکەی لەسەر شەویلگەی پۆسلۆ ئۆغلّی دانا. پەلەپیتکەی ترازاند. برادەرەکانیشی هەر وایان کرد. بەرەبەری بەیانی بوو. چاخیرجالی لە تەنیشت تەرمەکەی پۆسلۆئۆغلّییەوە راەستابوو و پەیتا پەیتا جگەرەی دەکێشا. هەتا بەیانی ئاوا بێ جووڵە راوەستا. چاوی پڕ ببوون لە فرمێسك و گریان ئەوکی گرتبوو.

بە لەبزێکی بەژانەوە گوتی:

- حاجی، سەیرێکی ئەو بەژن باڵایەی پۆسلۆ ئۆغلّی بکە. دەتگوت خەڵفی چنارە. باشە چۆن دڵم هات ئەو گەنجە بکوژم. زۆر حەیف بوو، بەڵام چار نەبوو. نەمکوشتبا، ئەو منی دەکوشت.

## ******* پلخر *******

چاخیرجالیی دڵڕەق، چاخیرجالی ئەفە، ئێستا لەسەر تەرمی پۆسلۆ ئۆغڵی دانیشتبوو و دەگریا. ئەفەیەك لە بەردەم تفەنگچییەكانیدا وەك بێوەژنان دەگریا.

هەستا و دەموچاوی شوشت. دوای ئەوە دەسنوێژی هەڵگرت و نوێژەكەی دابەست، بەڵام نەیدەتوانی نوێژەكەی بەجوانی بكا. زاری هەڵنەدەپچڕدرا. كە لە نوێژ بۆوە، بانگی خاوەنماڵی كرد و بەحاجیی گوت:

ـ حاجی، سەد سكەی زێڕ بدە بە ئاغا.

ئەوجار رووی لە خانەخوێ كرد و گوتی:

ـ كۆڕێكی باشی پرسە بۆ پۆسلۆ ئۆغڵی دابنێ. مەلا و قورئانخوێنیشی بێنە سەری. هەژاران تێر بكە. كارێكی بێوێنە بكە. ئەو سەد لیرەیەش بۆ گۆڕەكەی خەرج بكە. گۆڕێكی جوان و بەشكۆی بۆ دروست بكە. كە لە مەزراكە هاتنە دەرێ، چاخیرجالی بێدەنگ بوو. ماوەیەكی زۆر قسەی نەكرد. خەمبار بوو. روخساری سپی داگەڕابوو. كە گەیشتنە سەر گردێك، ئاوڕێكی داوە و سەیرێكی دواوەی كرد. ئەوجار هەناسەیەكی ساردی هەڵكێشا و گوتی:

ـ حاجی، بریا، سەد بریا پۆسلۆ ئۆغڵی منی كوشتبا.





چاخیرجالی دەوڵەمەندانی رووت دەکرد. کارخانەی دەسووتاند و هەر کەسیش پێشی گرتبایە، دەیکوشت. دەتگوت حکوومەتی ناوەندی هەر نییە. کێ شەڕێکی کردبوو، هەر کەس ئاغا هەقیان خواردبوو، دەچووە لای چاخیرجالی. ئەو گەنجانەی کچیان هەڵگرتبوو و ئەو هەژارانەی قەرزبار کەوتبوونەوە، دەهاتنە لای چاخیرجالی. کەس حکوومەتی ناوەندی بەهیچ نەدەگرت. چاخیرجالی دادگا بوو. ئیدارەی دارایی بوو. پزیشک بوو. چاخیرجالی چاری هەموو ناچاران بوو.

## ******* پاخر *******

لەو کاتدا قایمەقامی ئەزمیر، کابرایەك بوو بەناوی "کامیل پاشا". کامیل پاشا کابرایەکی کارزان و لێهاتوو بوو. ئەو سەرچڵی و سەرەڕۆییەکانی چاخیرجالیی دەدی و دڵی زۆر لە دەستەوستانیی حکوومەتی ناوەندی پڕ دەبوو. پیاوە هەرە ئازاکانی وەشوێن چاخیرجالی دەخست، بەڵام ئەو راونانانە هیچیان لێ شین نەدەبۆوە. ئەو کەسانە، یان هەر تووشی چاخیرجالی نەدەبوون، یان جۆرێك تووشی دەبوون، کە هەموو شتێك بە دڵی چاخیرجالی دەبوو. گوتنی ناوی، هەر تێکهەڵچوونێکی بەدڵی چاخیرجالی دەبوو، براوەش هەر ئەو بوو. هەر کاتێك ویستبای، دەیتوانی هێزەکانی حکوومەت بشکێنێ و قەڵتوبڕیان بکا.

فێڵ و گزەی سەیر و سەمەرەی لێ دەکردن و هەزار و یەك فرت و فێڵی هەبوو. شتی سەیر و سەمەرەیان لێ دەگێڕاوە. دەیانگوت، "سەعید پاشا"، کوڕەکەی کامیل پاشا، چاخیرجالیی دیتووە و بەرتیلی لێ وەرگرتووە. تەنانەت باسی ئەوەشیان دەکرد کە چۆنیان یەکتر دیتووە و چاخیرجالی و سەعید پاشا چۆن یەکتریان ناسیوە.ز لەو کاتدا بنەماڵەیەکی بەریتانی بەناوی "ویتۆل" لە ئەزمیر دەژیان. بنەماڵەی ویتۆل یەکەم بیانی بوون کە لە تورکیادا سەرمایەگوزارییان دەکرد. ئەوانە لەگەڵ کاروبارە جۆراوجۆرەکانیان، بازرگانییان بە گوڵە پیازیشەوە دەکرد. پیازەکانیان لە چیا دێنا. کرێکارەکانی ویتۆل ناچار بوون بۆ کۆکردنەوەی پیاز بچنە کێوپارە و هەندێ دەڵێن چاخیرجالی و ویتۆلەکان لەوێوە بوونە ئاشنای یەك. یەکێك لە راستییەکانی ئەو کات، ناسرانی چاخیرجالی بوو لە ئەورووپا و لە هەمووان پتریش لە لەندەن. ڕۆژنامەکانی لەندەن و پەرلەمانی "عەوام"ی

## ****** یاخی ******

بەریتانیا کەیفیان بە چاخیرجالی هاتبوو. رۆژنامەکان باسی بەسەرهاتنەکانی ئەویان دەنووسییەوە. لە دوایین ساڵەکانی حکوومەتی عوسمانیدا، ئەو رووداوانە بە شتێکی ئاسایی دادەنرا.

ویتۆلەکان لە ئەزمیر پیاوی چاخیرجالی بن و دوایش رۆژنامەکانی ئینگلیز یاخییەکی تورکیایان خۆش بوێ. ئەو رووداوانە شیاوی ئەوەن لێیان بکۆڵرێتەوە.

مێژوونووسەکانی ئێمە دەتوانن و دەبێ ئەو رووداوانە باش و ورد بخوێننەوە و بزانن چۆن بوو لەو سەردەمدا ئینگلیز رۆژ بە رۆژ گەورەتر دەبۆوە، بەڵام ئیمپراتۆریی عوسمانی لەتوپەت دەبوو. بەڵێ دەبێ سیاسەتی ئینگلیز و دەستێوەردانەکانی لە رۆژهەڵاتی جیهاندا روون بکرێنەوە و بناسرێن.

چاخیرجالی یان هەروەك ئێمە دەیناسین، یاخییەکی ئاسایی بوو، یا داردەست و پیاوی ئیمپراتۆریی ئینگلیز. دەبێ ئەوەش روون بکرێتەوە. دەبێ مێژووی یاخیگەری و ئەفەگەرێتی لە ئاناتۆلی و ناوچەی ئێژەدا تاوتوێ بکرێت. دەبێ گرنگی بەو بابەتە بدرێ. ناکرێ بڵێی هەموو ئەفەکانی ئاناتۆلی یان مەرد و جوامێر بوون یان دارەدەستی دەرەبەگ و بەرپرسانی حکوومەتی ناوەندی. لەوانەیە هەندێکیان دارەدەستی بێگانانیش بووبێن.

هەرچۆنێك بێ، کامیل پاشا نارەحەت بوو. دەی چ دەکرا؟ ئەو پێی وابوو، ئەو فیتنەیە بە چەند جەندرمەیەك نابڕێتەوە. ئەگەر چاخیرجالی قایل بوایە، پاشا دەیتوانی ئەمری لێبووردنی بۆ وەرگرێ. ئەوە فکرێکی باش بوو. سەردانی ئێرە و ئەوێی کرد و دراوی بۆ خۆش کرد. هەموو کاروبارەکانی رێك

خست. چاخیرجالی بەر لێبوردن کەوت، بەڵام باشە ئەی چاخیرجالی خۆی دەیەوێ لێی ببوورن؟ دەبێ لەوەش تێبگەین.

هەموو ئەو ڕووداوانە، هەوڵەکانی کامیل پاشا بۆ لێبوردن لە چاخیرجالی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی، پەیتاپەیتا دەگەیشتنەوە ئەفە. چاخیرجالی یەکەم ڕۆژ حەزی لێ نەبوو یاخی بێت. ناچار کرابوو بچێتە چیا. ناچاریان کردبوو ئەو ڕێگەیە بگرێتە بەر. یەکەم ڕۆژ کە باسی لێبوردنەکەی بیستبۆوە، لە چیا بوو. لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو. هەرای کرد:

- پارەمان چەند هەیە حاجی؟

- چوار هەزار.

- دەبێ پتر بێ حاجی. وا نییە؟

حاجی لەچەر بوو. قایل نەبوو تاقە قرۆشێکی بەفیڕۆ بدا. تەنانەت دژی دابەشینی پارە بەسەر دێهاتییە هەژارەکانیشدا بوو. لە حاڵێکدا لێوی دەلەرزین، وەڵامی داوە:

- بەڵێ ئەفەم، پترە.

- حاجی زوو بە و بڕۆ دووهەزاری بەسەر گوندییە هەژارەکاندا دابەش بکە...

- حاجی ملی بادا:

- ئێمە وا خەریکین بەرەو خوار دادەگەڕێین، چما دەکرێ بەبێ پارە بژێین؟ دەکرێ ئەفەی من؟

چاخیرجالی تووڕە بوو:

- دەکرێ. تۆ هەقت نەبێ. بڕۆ خێرا دابەشی بکە و بگەڕێوە. بە یەك دوو پەلامار، جێی پڕ دەکەینەوە.

## ******* پلخر *******

لـه خۆشـييان بـه دەوری چـياکەدا دەخولايـەوە. دوای ئـەوەی بـوو بـه چاخيرجالی مەمەد ئەفە، چەندە باشە ئێستا لـه چيا بچێتە خـوارێ و بـه ئاسوودەيی بژی! ژيانێکی ئاسوودە؟ بـەلام شـتی وا دەبـێ؟ ئەگـەر کاميـل پاشا مەرجەکانی ئەفە قەبوول بکا، دەبێ. چەند باش دەبێ.

ئەو پياوەی هـەرگيز هەسـت و نييـەتی خـۆی ئاشـکرا نـەدەکرد، ئێسـتا وەك منداڵێك لەخۆشييان هەڵدەبەزی. رێك وەك منداڵێك.

[illegible]نگچی لايەنگری لێبوردن نبوون. هـەر پێيـان خـۆش نـەبوو لـه چـيا بچـنە [illegible] ئەوا[illegible] بە بياو دەزانێ؟ ئەی چۆن بژين؟ ديسان دەبێ [illegible] بەسـەر بـێ و ديسـان پيـاوی [illegible] نەياندەتوانی ئـاوا بـژين، بـەلام [illegible] ئيتر چار نييـه. چـيا بـەبێ ئەفـه بـۆ ئـەوان دەبـووە زيندان. تازە، ئەوانەی ملکەچيش نەبوايەن، لەوانەبوو ئەفە بيانکوژێ.

پياوەکانی "مستر ويتۆل"، چاخيرجالييان تێگەياند، کە لێبوردنەکـە قـەبووڵ بکا و بێتە خوارێ. چاخيرجالييش قەبوولّی کرد، وەفدێك بـۆ دانوسـتان بێنـه چيا. ئەو وەفدە دەبوو گوێيان لە مەرجەکانی چاخيرجالی بێ و بە حکومەتی ناوەندی رابگەيەنن.

حکوومەت وەفدەکەی هەڵبـژارد. وەفدەکـە بـريتی بـوون لـە مسـتێر ويتـۆل، قايمەقامی ئۆدەميش و لە دەرەبەگەکانيش "عارەفاغا"يان دياری کرد.

يەکەم مەرجی چاخيرجالی ئەوە بـوو، مسـتێر ويتـۆل بـە نوێنەرايـەتيی ئـەو، لەگەڵ حکوومەت دابنيشێ بۆ دانوستان. مستێر ويتـۆل قـەبوولّی کـرد ببێتـه بريکاری. جگە لە يەکەم مەرج، کۆمەڵێك مەرجی ديکەشی دانا، ئەو مەرجانـه

******* يلخر *******

شیاوی لێ وردبوونەوە: لێبوردنەکە نابێ تەنیا چاخیرجالی بگرێتەوە، بەڵکو دەبێ هەموو پیاوەکانی بگرێتەوە. بەهیچ جۆرێ و بەهیچ تۆمەتێك نابێ راوەدوو بنرێن. چاخیرجالی و پیاوەکانی وەك جاری جاران چەکەکانیان هەر پێ بێ و تفەنگچییەکان لە گوندی "ئاقچاوا"ی سەر بە ناحییەی "چینێ" نیشتەجێ دەبن. هیچ پیاوێکی حکوومەت، بەتایبەتی جەندرمە و پیتاك وەرگر نابێ بە لای ئەو گوندەدا بێن. چاخیرجالی خۆی پیتاك کۆ دەکاتەوە و دەینێرێ. هاتنەخوارەوە لە چیا دەبێ لە "بیرگی"یەوە بێ. پادشا خۆی لێبوردنەکە دەردەکا و ئەمرەکەشی خۆی ئیمزای دەکا. لە کۆتاییشدا، چاخیرجالی، جگە لەوە، هیچ شێوەیەکی دیکەی قەبووڵ نییە.

چاخیرجالی ماوەیەکی زۆر لەگەڵ وەفدەکەی حکوومەت وتووێژی کرد و مەرجەکانی خۆی ریز کردن و پێی دان. کامیل پاشاش لەگەڵ ئەستەمبوڵ قسەی کرد. پادشا خۆی فەرمانی لێبوردنی دەرکرد. هەموو مەرجەکانیشی قەبووڵ کرد و جگە لەوەش چاخیرجالی وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی ئەو ناوچەیە دیاری کرا. بۆ ئەوەش دەبوو هەر مانگەی سێ سکەی زێڕ وەك مووچە وەرگرێ. هەر پیاوێکیشی مانگانە سێ سکەی بۆ دیاری کرا.

رۆژێکیان چاخیرجالی لەگەڵ پیاوەکانی هاتنە بیرگی. ئەفە لە دەم رێگا و دەوری میوانخانە حکوومەتییەکە پاسەوانی دانابوو. پاسەوانەکانیش تفەنگچیی خۆی بوون. بەوپەڕی سەربەرزی و شانازییەوە هات و لە دیوەخانی حکوومەتدا میوان بوو. لەوێ حەسەن پاشا دەقی لێبوردنەکەی خوێندەوە. چاخیرجالی بە دڵێکی خۆش هاتە خوارێ. تفەنگچییەکانی هەڵگرت و لە بیرگی وەدەر کەوت.

## ******* پلخر *******

هەر بەراستی دیمەنێکی سەیر بوو. چاخێرجالی بە سواری ئەسپ لە پێشەوە و هەموو تفەنگچییەکانیشی بەدوویدا گۆرانییەکی شادیان دەچڕی و دەڕۆیشتن. جاروبارەش ئەسپیان لینگ دەدا و دەیانکردە کێبڕکێ.

شەوێ لە ئۆدەمیش مانەوە و بەیانی دیسان کەوتنەوە رێ. بەرەو "یەنی بازاڕ" دەهاتن.

چاخێرجالی هەر لە منداڵییەوە شارەزای یەنی بازاڕ بوو، بەڵام ئیتر لەو کاتەوە نەچووبۆوە ئەوێ. باشە بۆ دەهاتە یەنی بازاڕ؟ یانی دەیویست خۆی بنوێنێ؟ دەکرێ بڵێی نا. ئەفە پیاوی خۆنواندن و هەڕوگیف نەبوو. هەر لە خۆشییان نەیدەزانی چ بکا. دەیویست شار بە شاری هەموو ئەو هەرێمە بگەڕێ. پارێز و سڵکردنەوەی بەلاوە نابوو. حەزی لێ بوو هەموو جێیەك بچێ: ئەزمیر، ئایدین، بەرگاما، مانیسیا... هەر هەمووان بەسواری ئەسپ، لە حاڵێکدا تفەنگە زیونشانەکانیان لەسەر ئەژنۆیان داناوە، بە ئەزمیردا دەگەڕێن... خەڵك بۆ سەیرکردنیان لە هەردووبەری جادەکە ریز دەبەستن... لە شەقامەکان، دەرزی هەڵاوێی وەعەرزی ناکەوێ... رێك وەك ئەو کاتەی سەرکۆمار دێ، بەڵام سەرەڕای لێبووردنیش، حکوومەت لەوانەیە قەوڵ و بەڵێنەکانی بشکێنێ... . هەر وەك پێشتریش لە ئەزمیر و ئایدین نامەردیی لەگەڵ چەند ئەفەیەکی دیکەدا کردبوو و کوشتبوونی.

لە بیرگی و ئۆدەمیش، پێشوازییەکی بێوێنەیان لێ کرا. خەڵك بە پانەوە، بە ژن و پیاو و گەورە و بچووکەوە لە ماڵ هاتبوون دەرێ چاخێرجالی ببینن. تەنانەت گوندییەکانی دەوروبەر و رەشماڵ نشینەکانی چیا نزیکەکانیش لەوێ بوون.

## ******* پاخر *******

یەنی بازاڕ شوێنی پیاوە ئازاکان بوو. مەیدانی چارەوی و ئەسپان بوو. ئەفە زۆری چاکە لەگەڵ خەڵکی یەنی بازاڕ کردبوو. زۆری پارە بۆ ناردبوون. زۆربەی کچانی یەنی بازاڕ بە پارەی ئەفە جیازیان کڕیبوو و مێردیان کردبوو. ئەفە پتر لە هەموو شوێنێك، دەستی هەژارانی یەنی بازاڕی گرتبوو. هەر بۆیەش چاوەڕوانیی هەبوو، خەڵکی ئێرە لە هەموو جێیەك زیاتر بە پیلییەوە بێن. یەنی بازاڕییەکان دەیکەنە ئاهەنگ و خۆشی. ئەمڕۆ بۆ ئەوان ڕۆژێکی مەزنە، چونکە ئەفەیان دێ.

خەریك بوون لە یەنی بازاڕ نزیك دەبوونەوە، بەڵام کەس بە پیلیانەوە نەهاتبوو. هیچ دەنگێك نەبوو. چاخیرجالی سەری سووڕ ما. یانی چی؟ ئێستا دەبوو قیامەتێك بوایە ئەوسەری دیار نەبێ، بەڵام نا.

مەسەلەکە ئاوا بوو، کاتێ چاخیرجالی بەرەو یەنی بازاڕ دەهات، شوانێك دەیبینێ و بە هەڵەداوان لە چیاوە دادەگەڕێ و خۆی دەگەیەنێتەوە ئەوێ و بە خەڵکەکە دەڵێ:

" هەر ئێستا چاخیرجالیم دیت، بە پیاوەکانییەوە بەرەو ئێرە دەهاتن. هەمووشیان چەکدار و بە سواری دەهاتن. بێ و نەبێ شتێکی خراپی لەبن سەری دایە. "

ئەگەر چاخیرجالی مەبەستێکی خراپی هەبێ، دەبێ چ بکەن؟ پیاوێکی وەك چاخیرجالی ئەفە بە ڕۆژی ڕووناك بەو هەمووە تفەنگچییەوە دەهاتە بازاڕ، دەی دیارە نییەتێکی خراپی هەیە. خەڵك شڵەژان. لە پێشدا هەمووان لە گۆڕەپانی شارۆچکەکە و لە بەردەم بنکەی پۆلیس کۆ بوونەوە. دوایی کە دیتیان پۆلیس بۆوەی نابێ پشتی پێ ببەستن، بڵاوەیان کرد و هەر کەسە و

## ******* پاخر *******

چۆوه ماڵەکەی خۆی. دەرگای ماڵەکانیان داخست و کەڵەمێردیان هاویشتە پشتی. چەندەرمەش لە یەکێ لە ژوورەکانی بنکەکەیاندا کۆ بوونەوە دەرگاکەیان گاڵەدا. دەتگوت ئەزمیر یەنی بازاڕی ئاگادار نەکردبۆوە کە لە چاخیرجالی خۆش بوون.

کاتی نیوەڕۆژە بوو، کە چاخیرجالی گەیشتە یەنی بازاڕ. چی پتر دەچووە پێشێ، پتر سەری سووڕ دەما. هەست و خوست نەدەهات.

- حاجی ئەوە یانی چی؟ چ بەڵایەك بەسەر یەنی بازاڕییەکان هاتووە؟ لێرە ڕۆیشتوون؟

- نازانم ئەفەی من. منیش واقم وڕ ماوە.

- باشە پێت وایە چ قەوماوە؟

ـ چووزانم ئەفەی من. کەسیش دیار نییە لێی بپرسین. هەر دەڵێی شارۆچکەکە چۆل کراوە.

هاتنە گۆڕەپانەکە. لە ناوەندی شارۆچکە چۆلەکەدا سەرگەردان مانەوە. هەر دوو سەگیان دیت کە مڵومۆیان بوو و بە کۆلانێکدا سەروخواریان دەکرد. پشیلەیەکیشیان دیت لە دیواری حەوشەیەکەوە خۆی فڕێ دا و چووە نێو باخچەیەکەوە.

- چ قەوماوە؟

- وەڵڵاهی ئەقڵم نایبڕێ، نازانم.

- با بچینە بنکەی پۆلیس.

چوون. حەمە شوان دابەزی و لە دەرگای پۆلیسخانەکەی دا، بەڵام کەس وەڵامی نەداوە. چاوەڕوان بوو.

## ******* یاخو *******

- کەس لێرە نییە ئەفە.

هاتنە میوانخانە حکومییەکە. ئەوێش چۆل بوو. چاخێرجالی نیگەران بوو. تۆزێکیش ترسابوو. تا ئێستا شتی وای نەدیبوو، هەر بیریشی لێ نەکردبۆوە. خەڵکی شارۆچکەیەك لەنەکاو بزر ببوون.

ئەفە لە پێشەوە و تفەنگچی بە دوایدا چەند کۆڵانێك گەڕان، بەڵام کەسیان نەدی.

- کوڕە دە شتێك بڵێ حاجی!

- جا بڵێم چی ئەفە.

بە سەر ئەسپەوە، هەموو کڕ و بێدەنگ بوون. ئاخرییەکەی چاخێرجالی سەری هەڵێنا:

- بڕۆین حاجی؟

- با بڕۆین. ئەوە چ رۆژێك بوو رامانبرد ئەفەی من؟

دڕدۆنگ بوون بڕۆن یان نەڕۆن، کە لە دوورەوە "مستەفا عەلی" پەیدا بوو. ئەفە هەر چاوی بەو کەوت، گەش بۆوە. هەرای کرد:

- کوڕە وەرە ئێرە مستەفا عەلی. ئەوە چ باسە؟ یەنی بازاڕ چیی لێ قەوماوە؟

مستەفا عەلی هات و لەبەر دەم ئەفە راوەستا. رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو. زمانی شکابوو.

- شتێك قەوماوە مچە؟ شتێکی ناخۆش قەوماوە؟

******* یلخو *******

- نا، ئەفەم.

- ئەی ئەوە چییە؟

- تۆ ئەفە...

- قسە بکە کافر.

- تۆ... تۆ...

- کورە دە قسەیەك بکە سەگباب.

- کە خەڵك زانییان تۆ دێی، خۆیان شاردەوە. هەندێکیشیان رایان کردووە بەرەو چیا.

- ئەی خۆت لە کوێ بووی؟

- ئێمە کارمەندەکان لە یەکێك لە ژوورەکانی ئیدارەدا کۆ بووینەوە.

- ئەی جەندرمەکان؟

- ئەوانیش لە بنەکەیاندا خۆیان شاردەوە و لە ژوورەوە دەرگایان داخست.

ئەفە هەم پێی سەیر بوو، هەمیش پێی خۆش بوو.

- دیوتە حاجی؟ کاروباری ئێمەت دیوە؟

ئەفە گوتی:

- مستەفا، برۆ بە جەندەرمەکان بڵێ بێن. ئێمە میوانی ئێوەین. یانی لەلای ئێوە ئاوا میوانداری دەکەن؟

مستەفا چوو و هەمووی بۆ جەندەرمەکان گێڕایەوە. لە لایەکی دیکەوە لەو مەودایەدا سەرۆکی بنکەش لەگەڵ ئەزمیر قسەی کردبوو و بیستبوویەوە کە

## ******* پاشکۆ *******

چاخیرجالی بەر لێبوردن کەوتووە. هەر بۆیە جەندەرمە و خەڵك وێکڕا لە ماڵەکان هاتنە دەرێ و روویان کردە کۆڵانەکان. دوای ئەو ترسە گەرەیە، خۆشییەکی گەورە بەسەردا هات. سەعاتێکی نەبرد، یەنی بازاڕ پڕ بوو لە خەڵك. کۆڵانەکان هەر جمەیان دەهات.

چاخیرجالی ئەو شەوەی لە یەنی بازاڕ رۆژ کردەوە و بەیانییەکەی چۆوە ئاوایی.



# ٩



چاخێرحالی هەم ناوبانگی بەهەموو وڵاتدا بڵاو ببۆوە و هەم تۆڵەی باوکیشی کردبۆوە. دواییش توانیبووی واز لە یاخیگەرێتی بێنێ. خۆی لە بنێڕا ئەو هەر حەزی لە یاخیگەری نەبوو. هەلومەرجی ژیان و نامەردییەکانی حکوومەتی ناچاریان کردبوو دەست بداتە تفەنگ و بچێتە چیا.

بەڵام ئیتر ئێستا ئازاد بوو. ببووە سەرۆکی پاسەوانەکانی ناوچەکە و پیاوەکانیشی بەدەورییەوە بوون.

چاخێرجالی کابرایەکی تێکەیشتوو بوو. هەموو هەوڵی بۆ ئەوە بوو، کەس ئەزیەت نەدا و زیان بەکەس نەگەیەنێ. لەوەتەی لە شاخ هاتبووە خوارێ، کاری بە کاری کەسەوە نەبوو و وەك خەڵکی ئاسایی دەژیا. تەنیا وازی لە نیشانەداکردن نەدەهێنا.

## ******* یاخی *******

ئەوەندە لە نیشانەشکاندن و سێرگرتندا شارەزا ببوو، دەرزیی هەڵدەگرت، بەڵام حەزی لێ نەبوو ڕۆژێك لە ڕۆژان بچێتەوە شاخ، بەڵام ئەگەر ڕۆژێك ناچار بێ دیسان ملی چیا بگرێتەوە، بەڵێ، دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگرێ. کەوابوو پێویستە هەروا لە نیشانەشکاندن و تەقەکردنێ بەردەوام بێ. ئەو یاخییانەی لە شاخ هاتبوونە خوارێ و تفەنگیان وەلاوە نابوو، دوایی کە دەگەڕانەوە شاخ، زۆر زوو وەك کەو ڕاو دەکران. ڕاستە ئیتر حەزی لە شاخ نەمابوو، بەڵام هەرچۆنێك بێ نەدەبوو چەکەکەی دابنێ. کێ چووزانێ لە داهاتوودا چی بەسەر دێ. دەبێ بیر لە دوارۆژیش بکەیەوە.

مەزراکەی بەرامبەر ماڵەکەی خۆی کڕیبوو و دەیەویست بیکاتە باخچە. ژنی هێنابوو. "ئیزار"ی ژنی، باشترین ژنی ناوچەکە بوو. هەرچی خەڵکی گوندەکە بوو، بەو زەماوەندە دڵخۆش بوون. خەڵك دەیانگوت:

- هەر بەراستی ئیزاریش بۆخۆی ئەفەیەکی تەواوە. پیاوی وەك چاخیرجالی هەر دەبێ ژنێکی وەك ئیزاری هەبێ.

هەر بەراستی ئیزار وەك پیاو وابوو. ئەفەی خۆی بەدڵ خۆش دەویست. کاروباری باخ و ماڵەوەی هەموو دەکرد.

ئەفە، کاتێ هاتبووە خوارێ، کاری بە کاری کەسەوە نەبوو. نەیدەویست خۆ لە هیچ کارێك هەڵقوتێنێ، بەڵام خەڵك دەستیان لێ هەڵنەدەگرت. هەموو ڕۆژێ، سکاڵایان دێنایە ماڵەکەی:

- فلانە ئاغا زەوییەکەی لێ زەوت کردووم...

- هەژارم و ناتوانم کچەکەم بە مێرد بدەم...

- جەندەرمەی فلانە زوڵمیان لێ کردم...

## ******* پلخر *******

ـ من کابرایەکی هەژارم ئەفە. فلانەکەس، تاقانە کوڕەکەمی بە ناهەق کوشت. ماوەیەك هەر دانی بەجەرگیدا گرت. خۆی لە هیچ شتێ هەڵنەدەقورتاند، بەلام ئاخری رۆژێك وەخۆ هاتەوە و دیتی ناتوانێ ئەو زوڵم و زۆرە ببینێ و بێدەنگیش بێ. سەیری کرد، ئیتر ناتوانێ چاخیرجالی بێ.

ـ چما تۆ ئەفە نی؟ چما لە ئێمە نی؟ خەریکن زوڵم دەکەن ئەفە. زوڵم دەکەن. ئەفەش هەم لە چیا و هەم لە گوندیش دەبێ ئەفە بێ، بەلام تۆ...

ــ من بێوەژنێکم ئەفە. کوڕەکەم چووە یەمەنێ و نەگەڕاوە. چووبووە سەربازی و ئیتر ئەو سەرەی بردی نەیهێنایەوە. "خەلیل ئاغا" مەزراکەی لە چنگ دەرهێنام. خۆم و بووك و نەوەکانم برسی و سەرلێ شێواو ماوینەتەوە. چوومە پایتەخت و شکایەتم لێ کرد، بەلام ئەو ئاغایە و پارە و سامانی هەیە و دەوڵەمەندە. جا کێ باشاری دەکا؟ لە سەد دەرگام دا، دەستی حاکمانم راموسی ئەفە، پێیانم ماچ کرد. گریام. گوتم ئەو مەزرایە هیی چەند هەتیوە. چما ئێوە پیاوی دادگا نین؟ حوکمەت باوکیانی بردە یەمەن و بەکوشتی دا. چەند سالان بە دادگاکاندا سەرگەردان و سەرلێشێواو بووم ئەفە، بەلام هیچی لێ شین نەبۆوە. نالینم کاری لە بەرد کرد و کاری لە دڵەڕەقەکەی دادوەرەکان نەکرد. چاومان لە بستۆکە زەوییەك و پاروە نانێکە ئەفەم. هەموو چاوی هیوامان بڕیوەتە تۆ، ئەفەی من. ئەگەر تۆ فریامان نەکەوی، روو لە کوێ بکەین؟ بچینە قاپییەی کێ؟ ئەگەر هەقمان لە ئاغای نەستێنییەوە، بەردێك لە ملم دەبەستم و خۆم لە بیرێك دەهاوێم. خۆم دەکوژم و خۆم ئاسوودە دەکەم ئەفە. کوڕم لە یەمەنێ بمرێ و زەوی و زارم لە دەست بچێ و هەتیوم برسی و رووت بن، ئیتر چ هیوایەکم بە ژیان هەبێ

## ******* یلخو ******

ئەفە گیان؟ لەگەڵ تۆمە ئەفە... بۆچی بوویەتە ئەفە؟ چما ئەفە نابێ لە ڕێگەی پاراستن و ئەستاندنەوەی مافی مافخوراواندا تێ بکۆشێ؟ ئەفە واتە پشت و پەنای مافخوراوان. ئەفە واتە باوکی هەتیوان. ئاوایان بە ئێمە گوتووە ئەفە. سەبەینێ هەیتوەکانم دێنم و لە ماڵەکەی تۆ بەرەڵلایان دەکەم. ئەوەی ئەفەیە، دەبێ بزانێ بۆچی بووەتە ئەفە. مەزراکەمان لە خەلیل ئاغا بستێنەوە. یان مشوورێکمان لێ بخۆ. ئەگەر ئەفەی، ڕێوشوێنی ئەفەیی بزانە و ئەگەر ئەفەش نیی، دەرپێکەی ئیراز لەپێ بکە و کۆڵوانەکەی لەسەرت بئاڵێنە و وەك من خۆت بە بێوەژن بزانە... تێگەیشتی ئەفە؟

ئیتر ئەفە مەزراکە لە خەلیل خان دەستێنێتەوە و دەیداتەوە خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆی.

وردە وردە ئەفە جێگەی مەحکەمە دەگرێتەوە. حکوومەتیش ئەوە دەبیستێتەوە. حکوومەت وردە وردە ترسی لێ دەنیشێ. چما قەبووڵ دەکرێ یەکێك بۆخۆی حکوومەت دروست بکا و ببێتە ملۆزم لە ئاغاکان؟ دەبێ مشوورێکی بخورێ. دەبێ بیانوویەکی لێ بدۆزنەوە و بۆ تاهەتایە ئەفە بێدەنگ بکرێ.

کردەی ئەفە، ئاغاکانی ناڕەحەت دەکرد. ئاغا و دەرەبەگی ناوچە پێیانخۆش نەبوو کەس لەمپەریان بێ. چما مەملەکەتێك چەند حکوومەتی دەوێ؟ چما دەکرێ لە نێو هەناوی دەوڵەتدا، دەوڵەتێکی دیکەش دروست بکرێ؟ نابێ نا، بەڵام ئەی دەوڵەت چ دەکا؟

چاخیرجالی کە لە شاخ بوو، بەڵامی گیانی ئاغا و جەندرمان بوو. ئێستاش کە هاتووەتە خوارێ، کاری ئاوا دەکا. دەبێ ڕێیەك بدۆزنەوە. هەرچۆنێکی بێ،

## ******* یلخو *******

رۆژێک رێگاچارەیەك هەر دەدۆزرێتەوە. دەبێ چاخیرجالی و مەحکەمە سەربەخۆکەی لەناو بچن، بەلام دەبەرگ و ئاغا کە زیانیان پێگەیوە، راناوەستن. تاقەت ناهێنن. چەقۆیان گەیوەتە ئێسقان و دەبێ مشوورێکی بخورێ.

لە ئەفە کۆنەکان کێ ماوە؟ کام ئەفە دوژمنی چاخیرجالییە و چاوی پێی هەڵنایە؟ کێ دەتوانێ بەرەنگاری بێتەوە؟ کێ هەیە لە چاخیرجالی نەترسێ و دەرقەتی دێ؟

"چاملیجالی حوسێن"یان هەڵبژارد. چاملیجالی دوژمنی چاخیرجالی بوو. چەند کەس لەو یاخییانەش کە دوژمنی چاخیرجالی بوون، کۆی کردنەوە و چیای گرت. یەکەم شتێکی کردی، خوشك و کچەکەی چاخیرجالیی کوشت و ئەوجار لێی راسپارد:

- چێمە لە چیاین. ئەگەر خۆت بە پیاو دەزانی، وەرە و تۆڵەمان لێ بکەوە.

چاملیجالی حوسێن بەو کارەی، لە راستیدا بە تیرێك دوو کێلی شکاندبوو. یەکێکیان ئەوەی دوو کەسی چاخیرجالیی کوشتبوو، دووەم ئەوەی کە، دەیەویست چاخیرجالی ناچار بکا، وەشوێنی بکەوێ.

یەکێك لە گەورەترین هونەرەکانی ئەفایەتی، لەوانەشە ئەوی هەرە گەورەکەی ئەوە بوو، کە لەبەر دوژمن هەڵدەهاتن و دوژمنیان ناچار دەکرد، وەدوای کەون. جا ئەوجار خۆیان بە ئاسوودەیی لە بۆسەدا بۆی دادەنیشتن و کە دوژمن نزیك دەبۆوە، دەیانکوشت. هەر ئەوەی چاخیرجالییش بەسەر گروبان حەسەنی هێنابوو.

- رات چییە حاجی؟ دەبێ چ بکەین؟

******* پلخو *******

ـ جا بلێم چی ئەفە؟ هەر دەبێ لەسەر هەست بین. نابێ وەشوێن چاملیجالی بکەوین. چونکە بێت و برۆین، بە قازانجی ئەوە. بەچاوی بەستراوەوە لە داو دەکەوین. ئەوە روون و ئاشکرایە.

ـ ئەی خوشکەکەم؟ تۆڵەی خوشکم نەکەمەوە؟

ـ دەبێ وای لێ بکەین، ئەو بەدووماندا بێ. دەزانی زۆر هەڵیە یاخییەك راو بنێی. جا لەبەر هەر شتێك بێ. خۆت دەزانی چاملیجالی چ سەیەکی نامەردە. دەیەوێ لەناومان بەرێ و خۆشی بێ خەنیم بێ. نابێ بکەوینە داوی.

چاخیرجالی دڕدۆنگ بوو. نەیدەزانی چ بکا. هەمووان دەڵێ، کوڕە سەیری ئەو چاخیرجالییە نامەردە بکەن. چاملیجالی خوشك و کوڕی کوشت، داواشی لێ کرد لەگەڵی بەشەڕ بێ، بەڵام ئەو نەیتوانی بچێ... ئەگەر شتێکیشی کردبا، بەپێی خۆی لە داوی دەکەوت و دەکوژرا. ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوت.

بەیانییەکەی یەکی دی هەواڵی هێنا:

ـ ئێمە چاملیجالی حوسێن ناردووینی ئەفە. دەیگوت پێت بڵێین دوو رۆژە چاوەڕێتە. دەیگوت زۆر خۆت مەگنخێنە. ئەگەر ئەفەی، وەك ئەفەیەك بجووڵێوە. حەیای ئەفە مەبە.

چاخیرجالی کە ئەو هەواڵەی بیست، ئیتر دەهری بوو. لەداخان وەك مەست و سەرخۆشانی لێ هاتبوو. نەیدەزانی چ دەکا و چ دەڵێ. بانگی حاجیی کرد:

ـ تفەنگچییەکان ئامادە بکە حاجی. لەوەپتر خۆ راناگرم. هەر تەواو بێغیرەت بووم.

ـ بەڵام ئەفەی من...

## ******* پاخو *******

- گوێم لە هیچ قسەیەك نابێ حاجی. جەندرمەکانیش ئاگادار بکەوە. ئەوانیش دەبێ بێن.

- خۆت چۆنت پێ باشە با وابێ ئەفە.

یەکەم جار بوو ئەفە خۆی بە شەپۆلی کەفوکوڵەکانی دەسپارد. یەکەم جاری بوو دەیهێشت هەستی بەسەر ئەقڵیدا زاڵ بێ. لە ناخەوە رووخابوو. هەستێك لە ناخەوە هـانی دەدا، بـەبێ بیرلێکردنـەوە و شـەنوکەوکردن، بجووڵێتـەوە. دەترسا. دەیزانی بەپیر مەرگەوە دەچێ، بەڵام ناچار بوو مل بۆ ئـەو مەرگـە کەچ بکا.

تفەنگچی ئامادە بوون. جەندرمەش بە شـوێن چـاملیجالییەوە بـوون. شـەوێ کەوتنە رێ. چاخیرجالی پێی وابوو خەنیمەکەیان تەڵە و داوێکی بەربڵاوی بـۆ ناونەتـــەوە. هـــەر بۆیـــە جەندرمـــەکانی خســـتە پێشـــەوە. خـــۆی و تفەنگچییەکانیشـی بـە دوایانـدا وەرێ کـەوت، بـەڵام چـاملیجالی تەڵـەی نەنابۆوە. لە سەرووی شیوێکەوە، لە نێو رەوەزەکـان چـاوەڕێی دوژمنەکـەی بوو. پێی وابوو کاتێ چاخیرجالی دەگاتە نێو شیوەکە، ئیتر تەواو دەکەوێتـە بـەر دەسـتی. چـاخیرجالییش ئـەوەی دەزانـی هـەر بۆیـە جەندرکـەکانی خستبووە پێشەوە و خۆی چاوەڕێ بوو بزانێ چ دەقەومێ. لەو دەموسـاتەدا یەکێك لەو ئاغایانەی دۆستی چاخیرجالی بـوو بـەخۆی و سـی تفەنگچییەوە گەیشتێ و تەقە دەستی پێ کرد.

جەندرمە تەقەیان دەست پێ کرد. چاخیرجالییشیان لەگەڵ بـوو. چـاملیجالی نەیدەویست تەقە لە جەندرمەکان بکا. هەوڵی دەدا هـیچ جەندرمەیـەك خـوێن لە لووتی نەیـە. هـەردووك لا بـەگیان و دڵ شـەڕیان دەکـرد. هـەموان لێیـان

## ******* پلخر *******

سوور بوو هەر کەس تۆزێ خەمساردبێ، دەکوژرێ. هەوڵیان دەدا بەرامبەرەکەیان تووڕە بکەن و وای لێ بکەن گوێ نەداتێ و پارێز بەلاوە بنێ.

جنێویان بە یەکتری دەدا.

چاملیجالی حوسێن:

- هۆی چاخیرجالی، من پێم وابوو پیاوی. ئێستا بۆم دەرکەوت خۆت لە پشت جەندرمان شاردووەتەوە. واباشتر بوو ژنەکەتت هێنابایە.

چاخیرجالی:

ـ ئای لەو دەوروزەمانەیە، کابرایەکی دایکی حیز و بێ غیرەتی وەك چاملیجالییش دەیەوێ ببێتە ئەفە. دەیەوێ لێمان ببێتە پیاو. ئەگەر تۆزە غیرەتێکت هەیە خۆت دەرخە. بۆ لە پشت بەردان خۆت حەشارداوە دایك حیز. خۆت نیشان بدە.

لەو جۆرە شەڕانەدا، ئەو کەسە دەیبردەوە، کە پتر دانی بەخۆیدا گرتبایە. هەرکەس تووڕە بوایە و کارێکی کەرانەی کردبا، دەپێکرا.

دەمەدەمی ئێوارە بوو، کە دەستەیەك جەندەرمەی دیکەش گەیشتنێ. چاملیجالی گەمارۆ درا. گەمارۆکەی جار بە جار بەرتەسکتر دەبۆوە. چیی پتر بارنەکەیان لێ وێك دێنایەوە، جنێوەکانیش پیستر دەبوون.

لەو کاتەدا تفەنگچییەکی گەنج بەناوی عوسمانەچکۆل، خۆی پێ نەگیرا. گەنج بوو و کەفوکوڵ هەڵیگرتبوو. نەیتوانی جنێوەکان قەبووڵ بکا، هەستایە پێ و تەقەی لە چاملیجالی کرد. چاملیجالی زۆر ئەنگێوە بوو. دەیتوانی لە ئاسمانێ لە چاوی باڵندەی بدا. بە فیشەکێك عوسمانەچکۆلی بێدەنگ کرد.

حاجی:

## ******* یلخن *******

- پێم گوتی، ئەفە. نەمگوت؟

عوسمانەچکۆڵ سۆمای چاوی ئەفە بوو. لە هەموو تفەنگچییەکانی گەنجتر و ئازاتر بوو. ئەفە تێك چوو. ئاگری لە جەرگی بەربوو. قرچەی لە هەناوی هات و دەستی شل بوون. ئیتر تەقەی پێ نەدەکرا. لەوە پتر لە چاملیجالی نەچووە پێشێ. کە شەو داهات، چاملیجالی بۆی دەرچوو.

بەیانی نێردراوێکی دیکە هات:

- چاخێرجالی ئەفە، چاملیجالی لە فلانە شوێن چاوەڕێتە و دەڵێ ئەگەر پیاوی، بۆم وەرە، بەڵام لە پشت جەندرمانەوە نا. ئەگەر ئازای خۆت وەرە با لێکی دەرکەین.

حاجی مستەفا:

- مەڕۆ ئەفە. خۆ هەر تۆ نی بەتەنێ. کوڕە تفەنگچییەکانیشتت لەبەر چاو بێ.

ئەفە:

— با بڕۆینەوە حاجی. چارمان نییە. من بەسەهوو چووم. کوژرانی عوسمانەچکۆڵیش خەتای من بوو.





لەوەتەی چاخیرجالی لە چیا هاتبووە خواریّ، چیا پڕ ببووە لە وردە یاخی و کۆنەیاخی. سی چل دەستە تفەنگچی و سەد، سەدوپەنجا یاخییەك. هەر هەموو تفەنگچی و یاخییەکانیش بە خوێنی سەری یەکتری تینوو بوون، بەڵام چاملیجالی بەڵای لابەلا بوو. چاملیجالی لە بن باڵی "سادق بەگ"ی کوڕی "عەلی پاشا"دا بوو. لە لایەکی دیکەوە، ویتۆل و سەعیدپاشای کوڕی کامیل پاشاش پشتی چاخیرجالییان دەگرت.

کوڕانی کامیل پاشا رقێکی زۆریان لە حاجی عەلی پاشا بوو، چونکە لەسەر قازانجەکانی ئەو ناوچەیەك کێشەیان پێکەوە هەبوو. ئەو کێشەیەش وای کردبوو ئەوان رقیان لە چاملیجالی بێ.

## ******* یلخو *******

ئەگەر چاخیرجالی لە دەشت و گوند بێ، بەرەقەتی چاملیجالی نایە. دەبێ کارێکی وا بکەن، چاملیجالییش بێتە خوارێ. دەبێ ئەمری لێبوردن بۆ چاخیرجالی دەربکرێ و ئەویش وەك چاخیرجالی بکرێتە سەردەستی پاسەوانانی دەشتێ. ئەو کات بە میوانی حکومەت دادەنرێ و دەبێ بە گەرموگوڕی پێشوازیی لێ بکرێ.

چاخیرجالی ئاگای لە هەموو شتێك بوو. ئاگری رقێك لە دڵیدا بڵێسەی دەدا. ئەگەر جاری جاران لە رقی لە چیا بوو، یان لێی دەترسا، ئیتر ئەمجارە کێوی بە باشترین شوێن دەزانی. هیچ چاری نەبوو. بانگی حاجیی کرد.

- حاجی!

- فەرموو ئەفەم.

- دیسان ناچارمان دەکەن حاجی. ناچارمان دەکەن.

حاجی زۆری پێ خۆش بوو تفەنگچییەکان لەو بێکارییە وەگیان هاتوون. ئێستا دڵیان خۆشە، دیسان دەچنەوە پیاوکوشتن و تاڵانچێتی. دیسان ئاغا و دەرەبەگ و خواپێداوان وەگریان دەخەن. ئیتر نۆکەری بەگەکان نابن. سەریان قیت رادەگرن و سینگیان دەردەپەڕێنن و دەبنە شمشێرێکی تیژ بەسەر بەگەکانەوە.

- حاجی!

- ها، ئەفەم.

- سبەی چاملیجالی لە چیا دێتە خوارێ. میوانی حوکمەتە. دێتە ئایدین. دواییش دەبێ بچێتەوە گوندەکەی خۆیان. لە سەر رێگای بۆسەی بۆ

دەنێینەوە. دەکەوێتە داومان و دەیکوژین. لێگەڕێ با "عەلی پاشازادە"ش دڵی خۆش بێ.

- با دڵی خۆش بێ ئەفەم. سەرە بڕدراوەکەی چاملجالیی بە دیاری بۆ دەنێرین.

ڕێیان لێ گرت. ڕێك لەو شوێنەی دەیانویست خەنیمەکەیان لە داو بخەن، بۆسەیان بۆ دانا.

- حاجی مستەفا، ئەو کارە تەواو بەدڵی ئەوان دەچێ. چاملیجالیی ژن حیز...

حەمە شوان لەوەتەی بیستووی دیسان دەچنەوە شاخ، حەجمینی لێ بڕابوو. شمشاڵەکەی هەڵگرتبوو و بێ پسانەوە لێی دەدا و گۆرانیی دەگوت. شاگەشکە ببوو. ئەو شوانەی کە هێندەی چیاکان گران و سەنگین بوو، ئێستا وەك منداڵێکی حەوت ساڵانەی لێ هاتبۆوە. لە خۆشیان باڵی گرتبوو. قسەی نەدەکرد، بەڵام لە ڕوخسارییەوە دیار بوو چیی لە دڵ دایە.

ئەفە:

- جا لێگەڕێن با شوانە لە چاملیجالی بدا. شوانە نەبێ، کەس بۆی نییە تەقە لە چاملیجالی بکا.

حاجی تووڕە بوو:

- نابێ ئەفەم. ئەوە مافی هەموومانە. هەمووومان دەبێ وێکڕا تەقەی لێ بکەین.

ئەفە نەڕاندی:

- چیی من دەیلێم، دەبێ هەر ئەوە بکەن.

## ******* يلخو *******

ـ دەی باشە. ئەفەم چۆنی پێ باشە با وابێ.

شوانە لە سەنگەرەکەیدا بێ ئۆقرەیە. هەر دەڵێی منداڵە. حەجمینی نییە. هەر یاری بە قۆنداغی تفەنگەکەی دەکات.

چاملیجالی حوسێن و تفەنگچییەکانی بەدوویدا لە دوورەوە دەرکەوتن. ئەسپیان لینگ دەدا و تەپوتۆزیان دەکرد. هەناسەیان لەخۆیان بڕیبوو. هەموو چاوەڕێی شوانە بوون. لێی گەڕێ با پتر بێتە پێش و بێتە بەر لوولەی تفەنگەکەم. وەك هەرمێی کرمێ بەردەبێتەوە.

چاملیجالی جار بە جار نزیکتر دەبۆوە. شوانە خۆی پێ نەگیرا. زۆر زوو پەنجەی بە پەلەپیتکەدا هێنا. بەخۆیدا دەپەرموو. نەیئەنگاوت. چاملیجالی خۆی فڕێدایە خوارێ و لە قووڵکەیەکدا سەنگەری گرت و دەستی کرد بە تەقە.

حاجی نەڕاندی:

ـ یاخوا کوێر بێ هەی شوانە. بۆ پەلەت کرد؟

تفەنگچییەکانی چاخیرجالی سێ پیاوی چاملیجالییان کوشت. بوو بە تەقەیەکی بێ ئامان. شوانە خۆی سەرکۆنە دەکرد، بۆچی لێی نەدابوو. زۆر تێك چوبوو. خۆی پێ نەگیرا و لە سەنگەرەکەی دەرپەڕی و پەلاماری چاملیجالیی دا. ئیتر گوێی بەهیچ شتێك نەدەبزووت. دەیویست خۆی بگەیەنێتە چاملیجالی و بیگرێ. دەیویست بەدەستی خۆی قوڕگی ڕێك بگوشێ و بیخنکێنێ.

ـ کوڕە ڕاوەستە شوانە. خۆت بەعەرزیدا بدە.

شوانە بەدەم ڕاکردنەوە، لە نەکاو وەك وشکەڵەدارێك بەعەرزیدا کەوت.

## ******* پلخو *******

- وەی خوایەگیان. شوانەی داماو.

شەڕەکەیان زۆری خایاند. زۆربەی پیاوەکانی چاملیجالی کوژرا بوون و بریندار ببوون، بەڵام خۆی هەر دەستی دەکردەوە. کە شەو داهات، تاریکییەکەی کردە قەڵغان و خۆی قوتار کرد.

کوژرانی شوانە جەرگی چاخیرجالیی بەکوچکەوە دا. دوای ئەو رووداوە ناچار بوو، دیسان بچێتەوە شاخ. ئەمجارە بێبەزەییتر ببوو. ئاغا و دەرەبەگ لە دەستی وەزاڵە هاتبوون. ئەمجارەیان حکوومەت سەعید پاشای راسپارد وەشوێن چاخیرجالی بکەوێ.

سەعید پاشا سۆمای چاوی سوپا بوو. ئەفسەرێکی باوەڕپێکراویان بوو. هەر مەئموورییەتێکی وەریگرتبوو، لێهاتووانە رایپەڕاندبوو. لە کاتی هەرای ئەلبانیاییەکاندا، لێهاتوویی خۆی سەلماندبوو. کە سەعید پاشا هاتە ئەزمیر، حکوومەتی ناوەند، پێی وابوو ئیتر چاخیرجالی تێدادەچێ. سەعید پاشاش زۆر بەخۆی دەنازی. حکوومەت لەو پتر لە سەرکەوتنی دڵنیا بوو. سەعید پاشا دەستی ئاوەڵا بوو و لەگەڵ سوپا لێهاتووەکەی دەهات. جگە لە سوپاکەی خۆی، دەستەی راوەدوونانی ئەزمیریشی لەبەردەستدا بوو. جگە لە پیاوەکانی سەعید پاشا، ئەو یاخییانەی دوژمنی چاخیرجالییش بوون، قۆڵیان هەڵماڵیبوو. هەموو ناوچەکە پڕ بوو لە سەرباز و جەندەرمە. سەرەڕای هەموو ئەو شتانەش چاخیرجالییش دەستی لەسەر دەست دانەنابوو. لێرە ئاغایەکی دەکوشت و لەولاتر ماڵی دەرەبەگێکی تاڵان دەکرد. دەوڵەمەندانی دەڕفاند و دەیبردنە چیا و باجی لێ دەستاندن.

## ******* پلخر *******

سەعید پاشای لووتبەرز، کە دەبیستەوە چاخیرجالی چپی کردووە، دەهەری دەبوو. نەیدەتوانی لە شوێنێك بحەسێتەوە. ددانی چیڕ دەکردنەوە و بەسەر دەوروبەرییەکانی خۆیدا دەقیژاند:

- ئەو مەلعوونە بیستوویەتی ئێمە هاتووین؟ کوڕە چەندیش چاوقایمە. چما من ناناسێ؟ یانی ئاگای لێ نییە؟ مەحاڵە نەمناسێ. یاخییەکی وەك چاخیرجالی من نەناسی؟ مەحاڵە. پیاوی ئاوا هەر نابێ پێی بڵێی ئازا. ئەوە شێتە. شێتێکە ئاو نایپاڵێوێ.

بەڵام پاشا کابرایەکی سادە و ساکار نییە. لێزان و بەئەزموونە. تەنگ بە چاخیرجالی هەڵدەچنێ. راوی دەنێ، بەڵام چما چاخیرجالی دەگیرێ؟

ئەمرۆ لێرە شەڕێك دەکا. سەعید پاشا دەزانێتەوە و بەهەموو هێزەکەیەوە دێ، بەڵام چاخیرجالی کاری خۆی کردووە و بۆی دەرچووە. پاشا شوێنێکی دیکە گەمارۆ دەدا. چاخیرجالی بووەتە باڵندە و فڕیوە و پاشا هەر لەوێ دەبیستێتەوە، خەنیمەکەی لە شوێنێکی دیکە شتێکی دیکەی کردووە. گاڵتە بە سەرهەنگێکی بەناوبانگی وەك سەعید پاشا دەکا. سەعید پاشا ناترسێ. نە دەخەوێ و نە ماندووش دەبێ. هەر وا بەدوای دەکەوێ. چاخیرجالی ماندوو دەبێ لەو هەمووە راوەدوونانەی. وەگیان دێ. ئەو سەعید پاشایە لەوە کەللەرەقترە، کە باسیان دەکرد. شیاوی ئەوەیە لەوەی پتر تاریف بکەن و حکومەت لەوەش زیاتر پێوەی بنازێ. وردەوردە خەریکە لە چاخیرجالی تێدەگا. فرت و فێڵەکانی ئەوی بۆ روون دەبێتەوە و شوێنی هەڵدەگرێ. رۆژ بە رۆژ مکوڕتر لێی نزیکتر دەبێتەوە. ورده ورده چاخیرجالی ترسی لێ دەنیشێ:

## ******* پلخو *******

- کوڕە هەر دەڵێی لە چنگی ئەو کابرایە قوتار نابم. بەو جۆرەی بۆمان دێ، ئاخری ڕۆژێك دەمکوژێ. بەر لەوەی بتوانێ بمکوژێ، یان دەبێ لەناوی بەرم، یان لە چیا بڕۆمە خوارێ.

بە شوێن ڕێیەکەوەیە، بەشکم بتوانێ لە چیا بڕواتە خوار، بەڵام هەموو ڕێیەکانی لێ گیراوە. سەعید پاشا تەنگی پێ هەڵچنیوە. بۆ هەرکوێ بچێ بەشوێنییەوەیە.

دوای ئەو هەمووە ڕاوەدوونان و ماندووبوونە، ئاخری ڕۆژێك سەعید پاشا دەبیستێتەوە چاخیرجالی لە "چیای ئیکیز"ە. چیای ئیکیز چیایەکی زەرد و ما و ڕژد و ئەستەمە، بەڵام سەعید پاشا سەربازی زۆرن. دەتوانێ کێوەکە گەمارۆ بدا. دەتوانێ هەر لەو چیایە چاخیرجالی لە داو بخا. هۆردووەکەی دەباتە چیای ئیکیز. هەر بەراستی چاخیرجالی لە چیای ئێکیزە. ئەویشت هەواڵی هاتنی پاشای پێ گەیوە. هەتا پاشا دێ، زۆر باش دەتوانێ چیای ئێکیز بەجێ بێڵێ و بچێتە جێیەکی دڵنیاتر، بەڵام ناڕوا. هەر لەوێ دەمێنێتەوە و بیر لە گەورەترین ڕووداوی ژیانی خۆی دەکاتەوە.

- حاجی مستەفا.

- فەرمووی ئەفەی من.

- ئەو سەعید پاشایە لەوانیتر جوێیە. وا نییە؟

- هەر وایە ئەفەم.

- زۆر کەللە ڕەقە. لەوانەیە ڕۆژێك بمانخاتە تەنگانەوە.

- لەوانەشە بتوانێ ئەفەم.

- دەتوانێ لەناومان بەرێ حاجی. زۆر شێلگیرە. ناچارین بەرەنگاری بینەوە.

# ******* پلخو *******

- ناچارین ئەفە.

- کەواتە خۆتان ئامادە بکەن. لە شیوەکەی خوارەوە بۆسەی بۆ دەنێینەوە. ئەو دۆڵەی دەیانویست بۆسەی تێدا بنێنەوە، رژد و رەوەزێک بوو، مارمێلکەی پێ هەڵنەدەگەڕا. تەنانەت بزنەکێوییش نەیدەتوانی پێیدا بڕوا. لە تەنیشت هەڵدێرێکەوە بوو. دەتگوت بە کێرد بڕیویانە. ئەگەر پاشا ویستبای بچێتە چیای ئێکیز، دەبوو بێرەدا تێپەڕێ. رێی دیکەی نەبوو.

ئەفە:

- جوان گوێ راگرن بزانن دەڵێم چی. یەکەم تەقە خۆم دەیکەم. بەر لەمن کەس بۆی نییە تەقە بکا. تەنانەت ئەگەر پاشا هەمووشمان بداتە بەر دەسڕێژ و بمانکوژێ، دیسانیش کەس بۆی نییە بەر لەمن پەنجە لە پەلەپیتکە ببزێوێ. تێگەیشتی حاجی؟

- کەس بەر لە تۆ تەقە ناکا ئەفەی من.

ئەوجار ئەفە خۆی قۆڵ هەڵدەماڵێ و شوێنی یەك بە یەکی تفەنگچییەکان دیاری دەکا. شوێنەکان وا هەڵدەبژێرێ، تفەنگی پیاوەکانی پاشا نەیگرێتەوە. چەکوچۆڵ و تەقەمەنی زۆرە. لێرە دەتوانن سەعید پاشا و پیاوەکانی وەك کەو راو بکەن.

سەرباز لە دوورەوە دەردەکەون. لە هۆردوویەکی تەواو دەچن. سەروبنی دیار نییە. سەعید پاشا قیت و رەپ لەسەر خوانی زین دانیشتووە و ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نییە. چما هەر بەمێشکیشیدا دەهات چاخیرجالی بوێرێ بەرەنگاری بێتەوە؟ هەر ئەو چاخیرجالییەی مانگێکی رەبەق لەبەری

******* پلخو *******

هەڵاتووە، ئێستا بێ و لە سەر ڕێی ئەو هەمووە سەربازە بۆسە دابنێ؟ سەعید پاشای لەخۆبایی شتی وای هەر بە زەینیشدا نایە.

دێنە پێشێ. سەعید پاشا تەواو گەیوەتە بەر سێرەی چاخێرجالی. هەر پەلەپیتکە بترازێنێ، پاشا وەك هەرمێی گەیو بەردەبێتەوە. چاخێر جالی بیر دەکاتەوە. لەوانەیە بشترسێ. لەوانەشە بەزەیی پێیدا بێتەوە. هەرچۆنێك بێ تەقەکەی ناکا. پاشا لە دەربەندەکە تێدەپەڕێ و دەڕوا.

دوایی کە ئەفە جارێکی دیکە لە چیا هاتبۆوە خوارێ، ئاوای بۆ دەوروبەرییەکانی گێڕابۆوە:

- سەعیدپاشا لەبەر لوولەی تفەنگەکەم بوو. قیت قیت لەسەر ئەسپەکە دانیشتبوو. قەڵافەتێکی پیاوانە و دلگری هەبوو و جا چەندییش جوان بوو. هاتە پێشتر. دەتگوت نەمامە. ویستم لێی بدەم، بەڵام دەتگوت دەستم بە قسەم ناکا.

لەوانەیە راستیشی کردبێ، بەڵام پیاوێکی زیرەکی وەك چاخێرجالی، ئاخۆ نەیدەزانی ئەگەر لە سەعید پاشا بدا، ئیتر هەموو دەرگاکانی لەسەر دادەخرێ و ڕێگەی دەربازبوونی نامێنێ. قسەی تێدا نییە، ئەو هەموو شتێکی لێك داوەتەوە و لە کوشتنی پاشا پاشگەز بووەتەوە. هەرچۆنێك بێ سەعید پاشا و سەربازەکانی بە بەردەم چاخێرجالیدا تێدەپەڕن و دەڕۆن. چاخێرجالی شوێنەکەی ناگۆڕێ. جارێ جێیەکەی قایم و هێمنە. ئەگەر شوێنی بگۆڕێ، زۆر زوو دەکەوێتە چنگ پاشا. هەر ئەم دۆڵە دڵنیاترە بۆی.

## ****** پاخر ******

سەعید پاشا سەری چەند شوێنی دیکەش دەدا، بەڵام چاخیرجالی نادۆزێتەوە. بۆ دووەمین جار هەر بەو دۆڵەدا و بە بەر لوولەی تفەنگەکەی چاخیرجالیدا تێدەپەڕێ و دەڕوا.

چاخیرجالی بە تفەنگچییەکانی دەڵێ:

ئەو پاشایە ئەگەر پیاو بێ، ئەگەر جوامێر بێ، ئیتر شوێن من ناکەوێتەوە. نامەیەکی بۆ دەنووسم و هەموو شتێکی بۆ روون دەکەمەوە بۆ ئەوەی بزانێ دوو جار بە هاتووەتە بەر لوولەی تفەنگەکەم. هەر پەنجامەترێك و بگرە کەمتریش لێمەوە دوور بووە، بەڵام من لێم نەداوە. ئەگەر جوامێر بێ نایەتەوە، بەڵام بێت و بێتەوە. . ئێرەی، ئیتر باسی مەرگ و ژیان لە گۆڕێیە... ئەو کات ئیتر بیر لە ئاقیبەتی کارەکە ناکەمەوە و بە هەر نرخێك بێ مشوورێکی لێ دەخۆم.

هەر واش دەکا. نامەیەك بۆ سەعید پاشا دەنێرێ. لە نامەکەیدا باسی ئەو رۆژە و ئەو شوێنەی بۆ دەکا، کە لەوێ بۆسەی بۆ سەعید پاشا نابۆوە. بۆ سەلماندنی قسەکانیشی، وەبیر پاشای هێنایەوە کە چۆناوچۆن لەسەر ئەسپەکەی دانیشتبوو و چەند سەربازی پێ بووە و زۆر شتی دیکەش. جا بە پادشاش دەڵێ، ئەگەر ویستبای دەیتوانی زۆر بە سانایی بشیکوژێ. هەر ئەم دووجارەی دڵێ نەهاتبوو، بەڵام ئەگەر پادشا دەست لە راوەدوونانی هەڵنەگرێ، ئیتر ئەمجارەیان بەزەیی پێیدا نایەتەوە. هەموو ئەو شتانەی بۆ دەنووسێ و داوا لە پاشا دەکا دەست هەڵگرێ لە راوەدوونانی.

سەعید پاشا کە نامەکەی دەخوێنێتەوە، زۆر تووڕە دەبێ. تاوێك جنێو بە دار و بەرد دەدا، بەڵام تاوێك دواتر بیری لێ دەکاتەوە.

## ******* پاشکۆ *******

سەعید پاشا ماوەیەك هەر وا لەسەر راوەدوونانی بەردەوام دەبێ، بەڵام ئیتر رێك ناکەوێتەوە تووشی بێت و تێکهەڵچن. ئاخرییەکەی ماندوو دەبێ و لە حاڵێکدا زۆر زۆر توورە و نارەحەتە، واز لە فەرماندەیی گرووپی راوەدوونان دێنێت و دەست لەکار دەکێشێتەوە.





کێوپاره پڕ بووه له یاخی. "یانیق خه‌لیل ئیبراهیم"، "کامالی ئه‌فه" و به سه‌دان ئه‌فه‌ی تازه پێگه‌یشتوو. له لایه‌کی دیکه‌شه‌وه یاخییه ره‌سه‌ن یونانییه‌کان. ئه‌وان ئیتر هه‌ڵلایان نابۆوه. خه‌ڵکیان ده‌ڕفاند و دیانبرده چیا و پاره‌یان له بنه‌ماڵه‌کانیان ده‌ستاند. حکوومه‌تیش بێده‌سه‌ڵاته. هیچی له ده‌ست نایه. رفاندنی هۆڵه‌ندییه‌ك، له هه‌موو پیاوڕفاندنه‌کان سه‌یر و سه‌مه‌ره‌تر بوو. ده‌یڕفێنن و ده‌یبه‌نه شاخ و داوای پێنج هه‌زار سکه‌ی زێڕ ده‌که‌ن. حکوومه‌تی ناوه‌ندی ده‌که‌وێته هه‌وڵ. ئه‌زمیریش هه‌ڵپه‌یه‌تی... چونکه کابرا رفێنراوه‌که هۆڵه‌ندییه، ناچار ده‌بێ پێنج هه‌زار سکه‌که بدا. یاخییه‌کانیش، هه‌م یۆنانی و هه‌میش تورکه‌کان، به‌رده‌وام ده‌بن له‌سه‌ر

پیاورفاندن و پارەئەستاندن. هەندێك لەو دەوڵەمەندانەی هێناویاننەتە چیا، دۆست و پشتیوانی چاخیرجالی و چەند ئەفەیەکی دیکەن.

چاخیرجالی ناچار دەبێ دۆست و پشتیوانی یاخییە یونانییەکان بڕفێنێ و بیانهێنێتە چیا. حکوومەتیش جار بەجار پتر تەنگاویان دەکا و چەند دەستە تفەنگچیی یۆنانی تێدا دەچن.

چاخیرجالی لە کوشتنیان بەردەوام دەبێ. یانیق ئیبراهیم و دارودەستەکەی دەشکێنێ. چاخیرجالی گورگی چیا و کوێستانە. دەست ناپارێزی لە پیاوکوشتنێ. کە دێتەوە گوندەکەی خۆیان، پووری خۆی دەکوژێ و دەستنوێژ هەڵدەگرێ و نوێژ لەسەر تەرمەکەی دەکا. ئەلبانیاییەکان و چەرکەزەکانیش قەڵتوبڕ دەکا، بەڵام ئەو حکوومەتەی توانیوێتی، تفەنگچییە رەسەن یۆنانییەکان و ئەوانی دیکەش لەناو بەرێ، باشاری چاخیرجالی ناکا.

چاخیرجالی یاخییە یۆنانی و تورك و عێلاتییەکانی چاوترسێن کردووە. شوێنی خەو و حەشارگەکانیشی دوورن و کەس دەستی پێیان راناگا. خەڵکی هەژاری کۆمەڵگاش لێی دەترسن و خۆشیشیان دەوێ. چونکە ئەو تاقە ئەفەیەکە، یارمەتیی هەژاران دەدا.

زۆربەی هەرە زۆری خەڵکە هەژارەکەی گوندەکان ئامادەن خۆیانی بە قوربانی بکەن. چونکە ئەفەی خۆیان، جوامێرێکی راستەقینەیە. ئەفە وەك شمشێرێکی دوو سەر بەسەر ئاغاکانەوە وەستاوە و هیچ ئاغایەك لە ترسی ئەو ناوێرێ زوڵم لە گوندییە هەژارەکان بکا.

حکومەت تەواو تەنگاو بووە، بەڵام هیچیشی پێ ناکرێ. کام جەندرمەی شارەزای هەیە، دەینێرێ، کەچی دەست لە گونان درێژتر دەڕۆنەوە. ئەی

## ******* یلخی *******

چار چییە؟ دەبێ چ بکا؟ دەبێ جارێکی دیکەش لە چاخێرجالی خۆش بن؟ باشە قەبووڵ دەکا؟

بەڵام چاخێرجالییش ئاسوودە نییە. ئاشق بووە و نازانێ چ لەو ئەشقە تازەیەی بکا. ناچار دەبێ تەگبیرێك بە حاجی بکا.

ـ ئەرێ حاجی!

ـ قسە بکە ئەفەم.

ـ ئەگەر "ئێراز" بزانێتەوە، دەڵێ چی؟

ـ دەبێ بزانین دەڵێ چی، بەڵام تۆش کارێکی باش ناکەی. ئەو ژنە داماوە ئەو هەمووە کوێرەوەرییەی بۆ تۆ کێشاوە. ئەو هەمووە عەزاب و ئازارەی لەبەر تۆ چێشتووە... ئێستاش تۆ دەتەوێ...

ـ لەوانەشە بەرهەڵستم نەبێتەوە حاجی...

ـ ئەگەر من لەجێی تۆ بوایەم ئەو کارەم نەدەکرد.

ـ بۆ چما تۆ نامبینی حاجی؟ زۆر شێواوم. خۆزگە کابرایەکی رێکوپێکمان دەست کەوتبایە، ناردبامان قسەی لەگەڵ ئێراز کربایە و توانیبای دڵی نەرم بکا...

ـ ئەی ئەگەر بڵێ نا؟

ـ ئەو کات بیرێکی دیکەی لێ دەکەینەوە.

ـ دەی باشە، مادام وایە وا باشترە، "کوێخا هایم" بنێرین قسە لەگەڵ ئێراز بکا. ئەفە یەکێك دەنێرێتە شوێن کوێخا هایم. ماڵەکەی لە گوندی کیایایە. برۆ و ئێراز تێ بگەیەنە با بزانم دەڵێ چی.

******* پلخو *******

- من ناتوانم. ئەوە محاڵە. من قەت قەت ناتوانم شتی وا بە ئیراز خاتوون بڵێم هەر دەمکوژێ.

- جا نەشرۆی من دەتکوژم.

- دەیابەش، ناچارم بچم، بەڵام ئەگەر چووم و ئیراز خاتوونم رازی کرد، ئەو کات چیم دەدەیەی ئەفە؟

- یانی بەرتیلم لێ وەردەگری؟

- ئەوە بەرتیل نییە ئەفە.

- دەی باشە. ناوی مەنێ بەرتیل. جارێ ئەگەر توانیت ئەو کارە راست بێنی، سەت سکەت دەدەمێ، بەڵام بێت و نەتوانی، سەرت تێدا دەچێ.

هایم دڵی خۆش بوو و کەوتە رێ. رۆیشت و دوو رۆژ دواتر گەڕایەوە لای ئەفە.

- خێرابە سەد سکەکەم بدەیە ئەفە. ئیراز خاتوون قایل بوو. هەر زۆریشی پێ خۆش بوو.

- چۆنت قایل کرد کابرا؟

- گوتم، لە ئەفەیەك ناوەشێتەوە هەر تاقە ژنێکی هەبێ. ئەویش ئەفەی ئێمە کە هەر تاڵە موویەکی سەد ئەفە دێنێ. ئەفەیەکی ئاوا، هەر هیچ نەبێ، دەبێ دووو ژنی هەبێ.

- دەی ئیراز چیی گوت؟

- هیچ. هەر گوتی: "تۆ راست دەکەی هایم ئەفەنی. تا ئێستا بیرم لەوە نەکردبۆوە". دەی باشە ئەفە. زوو بە و سەت سکەکەم بدەیە دەی.

ئەفە خۆشحاڵ بوو و سەت سکەی دایە هایم.

## ******* یاخی *******

کامیل پاشا بڕیاری دا، بەر لەوەی چاخیرجالی بانگهێشت بکاتەوە بۆ لێخۆشبوون، دوایین شانسی خۆی بەتاقی بکاتەوە. یەکێك لە ئاغاکانی ئەو دەوروبەرە ناوی "ئاراباکی" بوو. پیر و کەنەفت بوو. تاقمە یاخییەکانی دوورگەی کرێت و زۆر یاخیی دیکەشی سەرکوت کردبوو. ئەو یاخییانەی کە تەنانەت حکوومەتیش باشاری نەدەکردن. پاشا بانگی ئاغا ئاراباکیی کرد:

- ئاغا ئاراباکی، حکوومەت دەیەوێ تۆ دوایین و گەورەترین خزمەتی خۆت بکەی. چاخیرجالیی لەتۆ دەوێ.

- بمبوورە پاشا. من ناتوانم جوامێرێکی ئاوا بکوژم. ئەوە نامەردییە. بە من ناکرێ. تکا دەکەم پێت ناخۆش نەبێ، بەڵام من ناتوانم.

کامیل پاشا کە دیتی ئاراباکی هاوکاریی ناکا، تووڕەتر بوو. باشترین ئەفسەر و ئازاترین سەربازەکانی وەشوێن چاخیرجالی خست، بەڵام چاخیرجالی دەتگوت لە لوولەی تفەنگی شەیتان هاتووتە دەرێ*. کەس نەیتوانی بیدۆزێتەوە.

چاخیرجالی، بیستبوویەوە. بیستبووی کامیل پاشا تەکلیفی لە ئاراباکی کردووە، بیکوژێ، بەڵام ئەو گورگە باران دیتووە، نەیویستبوو زەبر لە چاخیرجالی بدا. ئەمە زۆری پێ خۆش بوو. ئاراباکی هەر بەراستی جوامێر بوو و چاخیرجالی دەبوو دەستخۆشیی لێ بکا، بەڵام دەبوو چ بکا؟ حەزی دەکرد بچێتە ئەزمیر و دەستی ئاراباکی ماچ بکا و چەند رۆژێك میوانی بێ. حەزی لێ بوو کام دیاری هەرەگرانباییە، ئەوەی بۆ بەرێ، بەڵام حاجی ملی نەدا و مەترسییەکانی ئەو کارەی بۆ هێنایە بەرچاوی:

## ******* پاخر *******

- لەبری ئـەو کارانـە، وەرە خۆمـان ئاراباکی بانگێشت بکەینـە ئێرە و هـەر ئالێرە میوانداریيەکی باشی بکەین.

- یانی دەکرێ؟ کێشە نییە؟

- کێشەی چی ئەفە؟ پیاوی وەك ئاراباکی باش دەزانێ چەندە خەتـەرە ئێمـە بچینە ئەزمیر.

- راست دەکەی. نامەیەکی باشی بۆ دەنووسین و بانگهێشتی دەکەین.

نامەکـەی نووسـی و بـە تفەنگچـییەکیدا ناردییـە ئـەزمیر. کـابرا رۆیشـت و ئاراباکیی دۆزییەوە و نامەکەی دایـێ. ئارابـاکی نامەکـەی وەرگـرت و بـەدەم دەستخۆشیکردنەوە گوتی:

- بچۆ بە ئەفەت بڵێ، چاوەکانی ماچ دەکـەم و رێك ئـەو رۆژەی گوتوویـەتی، ئەو رۆژە لە گوندی ئۆدەمیش دەبم.

چاخیرجالی خـۆی بـۆ میوانـداریی ئارابـاکی حـازر کـرد. چـیی بـۆ میوانـداری پێویست بوو، لە چیا ئامادەیان کرد. خێوەتیان هەڵدا و کام خـواردن بـاش و خـۆش بـوو لەگـەڵ خوراردنـەوەی جۆراوجـۆر لـە ئـەزمیر کڕییـان و هێنایـان. بەڕەی عێلاتییان لە خێوەتەکاندا راخسـت. هـەموو دەورووبـەریان وەك بـاخی بەهەشت رازاندەوە.

لە رۆژی دیاریکراودا، شەمەندەفەرەکەی ئۆدەمیش لە وێستگەکەدا راوەستا. تفەنگچییەکانی چاخیرجالی لە حاڵێکدا جلوبەرگی شـوانانەیان لەبـەردا بـوو، هەموو دەوروپشتی وێستگەکەیان گرتبووە بەر چاوەدێرییەوە. ئەوانە هـەموو چـەکدار بـوون. چـەکەکانیان لـە بـن چـۆخەکەیاندا شـاردبۆوە. ئاسمـانی ئـۆدەمیش هەوروهـەڵلا بـوو. زۆری نـەبرد، وردەبـارانێکی نـەرم دای کـرد.

## ****** پلخو *******

رۆژێکی جوانی بەهاریێ بوو. هەواکەی خۆش بوو، نە گەرم بوو و نە سارد. چاخیرجالی ئاشقی ئەو جۆرە رۆژانە بوو. ئەو هەوا خۆشە شاگەشکەی دەکرد. بە قسەی یەکێك لە تفەنگچییەکان، چاخیرجالی لە رۆژە بارانییەکاندا قەت دەستی نەچووەتە خوێنی کەس. لەو رۆژانەدا لە خراپترین دوژمنەکەشی خۆش دەبێ.

کە ئاراباکیی پیر لە شەمەندەفەرەکە دابەزی، کابرایەکی بەژن مامناوەندی بە عابای مەلایانەی گوندییەوە هاتە پێشەوە:

ـ بەخێرهاتی ئاغا. من چاخیرجالی ناردوومی. ئەسپەکان ئامادەن.

هاتنە پشت وێستگەکە و سوار بوون و لە ئۆدەمیش وەدەرکەوتن. کە مەودای نیوسەعاتێك لە ئۆدەمیش دوور کەوتنەوە، ئەو پیاوەی جلوبەرگی مەلایانەی لەبەردا بوو، عابا و مەندیلی فڕێ دا و لە ئەسپەکەی دابەزی. چووە پێشێ و دەستی ئاراباکیی ماچ کرد و گوتی:

ـ من چاخیرجالیم ئاغا.

جا ئەوجار تفەنگەکەشی دیار بوو. ئارابکی زۆری پێ سەیر بوو و بەخۆی گوت:

ـ هەتیو، ئەو چاخیرجالییە چەندە پیاوە؟ چەندە رەشیدە؟

چوونە نێو خێوەتەکە. ئاراباکی سەری لە نێو رەشماڵەکە سوور ما. چیی لە ئەزمیر لەوانەبوو دەست بکەوێ، لێرەش هەبوو.

ـ کوڕم، خۆ تۆ ئەزمیرت هێناوەتە ئێرە.

ـ دەی بڵێم چی ئاغا. ئاوا نەبێ ناژیین.

## ******* یاخی ******

ئارابکی سێ ڕۆژان میوانی چاخێرجالی بوو. لەو سێ ڕۆژەدا، دەستیان ڕاگرت بەسەریدا بڕوا. ڕۆژی سێهەم ئیزنی لە چاخێرجالی وەرگرت بگەڕێتەوە. چاخێرجالی هیوای تەمەندرێژیی بۆ خواست و قایل بوو. پارەیەکی زۆریشی دایێ.

لەو ماوەیەدا کە چاخێرجالی بێ خەم و خەیاڵ لە خێوەتەکەیدا دانیشتبوو و قسەی لەگەڵ ئاراباکی دەکرد، هەموو چیاکە پڕ ببوو لە سەرباز. بەشوێن چاخێرجالیدا سەریان بە هەموو قوژبنێکدا دەکرد و نەیاندەدۆزییەوە.

عێلاتی و گوندییەدەشتەکیەکان و خەڵکی گوندەکانی بناری چیا هەر هەموو دەیانزانی چاخێرجالی لەکوێیە و تەنانەت دەیانزانی میوانداریی لە کێیش دەکا. تەنانەت بەشێك لە سەربازەکانیش ئاگادار بوون. گوندییەکان ئەوەندەی پێیان دەکرا، سەریان لە سەربازەکان دەشێواند. ئەو سەربازانەش کە شوێنی چاخێرجالییان دەزانی، هاوڕێکانی دیکەی خۆیانیان بەلارێدا دەبرد. جەندرمە و سەرباز لە گوندییەکانیان دەدا و ئازاریان دەدان، بەڵام کەس ئامادە نەبوو شوێنی چاخێرجالی ئاشکرا بکا. چاخێرجالی باش بوو. دەستی هەموانی دەگرت. گوندی خۆشیان دەویست و بە هیچ ئازار و ئەشکەنجەیەك شوێنەکەیان ئاشکرا نەدەکرد.

جەندرمە و سەرباز و ئاغا و یاخییە خەنیمەکان، هەر هەموو بەشوێن چاخێرجالییەوە بوون، بەڵام دەست لە گونان درێژتر دەگەڕانەوە. پیاوانی حکوومەت وەڕەز و ماندوو بوون و حکوومەتیش بێدەسەڵات. چارەسەرەکەی هەر یەك شت بوو: لێخۆشبوون.

## ******* پاخر *******

له نێو دۆست و ئاشناكانی چاخیرجالیدا وەفدێكیان دیاری كرد. حكوومەتی مەركەزی "ئیمپراتۆری مەزنی عوسمانی" ئەمجارەیان هەر بەراست لە حاند چاخیرجالیدا بەچۆكدا هات. چاخیرجالییش بیستبوویەوە. دەیزانی ئەمری لێخۆشبوونەكە راستەوخۆ لە كۆشكی حكوومەتەوە دەردەچێ. ئەوجار بیری لە مەرجەكانی لێبوردنەكە دەكردەوە.

چاخیرجالی بێخەم بوو. ئیتر لە هیچ كەس و هیچ شتێ نەدەترسا. تەگبیری بەحاجی دەكرد بۆ ئەوەی تا زووە خۆی مەرجەكان دابنێ.

بیری لەو ئەفانە دەكردەوە كە پێشتر لێیان خۆش ببوون. لەو نامەردییانەی حكوومەت دوای لێبوردنەكە لە هەقیاندا كردبووی. خاڵە لاوازەكانی هەڵدەسەنگاند و تاوتوێی دەكرد، بزانێ حكوومەت لە كوێوە دەتوانێ فێڵ و گزەی لێ بكا. هەمووی ورد ورد شەنوكەو دەكرد. بیری لە بچووكترین شتەكان دەكردەوە. دوای شەنوكەوێكی خەست و باش، مەرجەكانی خۆی نووسی. ئەگەر حكوومەت ئەو مەرجانە قەبووڵ بكا، ئەوە لە چیا دێنە خوارێ. ئەی ئەگەر نەیكا؟ چاخیرجالی خوداخودای بوو زوو بێتە خوارێ و لەگەڵ فاتێ زەماوەند بكا، بەڵام حاجی هیچ بەرنامەیەكی بۆ داهاتووی نەبوو. لەسەر خۆ لە هەموو شتێك ورد دەبۆوە:

- بڕوانە ئەفە، دەبێ فەرماندەكانی تاقمی راوەدوونان، لە گوندی ئۆدەمیش بچنە دەرێ و هەتا ئێمە لەوێ بین، بەلای ئەوێدا نەیەنەوە. هیچ جەندرمە و پیتاك وەرگر و پیاوێكی حكوومەت و بەگشتی هەرچی نانێكی حكوومەت دەخوا، نابێ بێتە گوندی ئایاسورات. دەبێ لە هەموو تفەنگچییەكانیش خۆش بن و حكوومەت مانگانەیان بۆ ببڕێتەوە. هەر شتێكیش لەو گوندەدا

******* یاخی *******

بقەومێ، تەنانەت ئەگەر شەڕێکیش بێ، نابێ هێزی حکوومەت خۆی تێهەڵقوتێنێ. هەر خۆت جڵەوی دەسەڵاتت بەدەستەوە دەبێ و حکوومەت تۆ دەناسێ. ئەو مەرجانە باشن؟

- زۆر باشن حاجی.

- چەکەکانیشمان دانانێین. بۆ هەرکوێیەکیش جەزمان لێ بوو، بە چەکەوە دەڕۆین.

- ئەوەش باشە حاجی، بەڵام پێم وانییە قەبووڵی بکەن. وەرە با ئەو مەرجەی ئاخری لابەین.

- ئەو مەرجەی ئاخری لابەرین، بۆ ئەوەی لە هەر قوژبن و پەسارێك، تووشمان بوون، دەرفەتمان لێ بێنن و بمانکوژن؟ هەر بەڵایەکی بەسەر ئەفەکانی پێشوو هاتووە، لە گەڕانی بێ چەکەوە بووە. حکوومەت نامەردی دەکا. چەکەکان وەردەگرێتەوە و نامەردانە لەناومان دەبا.

- ئەی ئەگەر قەبووڵیان نەکرد؟...

- ساویلکە مەبە ئەفە. حکوومەت خۆی بەسەر لاقماندا کێشاوە. لێی گەڕێ با ئێمە داوا بکەین و ئەوان قەبووڵی نەکەن. نابێ خۆمان بەکەم بگرین. دەبێ هاوڕێ بەندکراوەکانیشمان بەربدەن. تفەنگچییە دوورخراوەکانیشمان بێننەوە. تەنانەت مووچەشیان بۆ ببڕنەوە. بەڵێ ئەفەم، عوسمانی دەبێ ئەوە بکا.

- با بیکا حاجی.

- فکرێکی دیکەشم هەیە.

- چ فکرێك حاجی؟ چیی دیکە ماوە؟

## ******* یلخی *******

- هەرکات ویستمان بچینە گوندی ئۆدەمیش. هەرکاتیش رۆیشتین، دەبێ چیی جەندەرمەیە لەوێ بچنە دەرێ و تا ئێمە لەوێین، بەوێدا نەیەنەوە.

- باشە ئەوەمان بۆ چییە حاجی؟

- قازانجی هەیە ئەفە. تۆ ئەوەندەی دیکە بەنرختر دەبی. تا ئێستا هیچ ئەفەیەك ئەوەی نەکردووە.

- راست دەکەی حاجی.

زۆری نەبرد، وەفدێك لە ناوەندەوە هاتە لایان. لیستی مەرجەکانیان دا بە وەفدەکە و ناردیاننەوە. چەند رۆژێك دواتر هەواڵیان هێنا و گوتیان، حکوومەت مەرجەکانی قەبووڵ کردوون. ئەفە خەریك بوو بفڕێ لە خۆشیان. لە لایەکەوە لەبەر قەبووڵکردنی ئەو مەرجە سەیرانە و لە لایەکیشەوە لەبەر زەماوەند لەگەڵ فاتمە... . لەرادە بەدەر خۆشحاڵ بوو...

لە خودای دەویست هەرگیز شتێك نەقەومێ، کە دیسان ناچار بێ رووبکاتەوە شاخ. چاخیرجالی لە عێلاتییەکانی راسپارد. کام ئەسپی هەرە باشی ناوچەکە بوو، بۆیان هێنا. خۆی و پیاوەکانی باشترین جلوبەرگیان لەبەر کرد.

سەرلە بەیانیی رۆژێکیان، لێی سواری ئەسپ بوون و بەرەو ئۆدەمیش کەوتنە رێ. گوندی لەمبەرەوبەری جادەی راوەستابوون و سەیریان دەکردن. دەتگوت پادشا دێتە ئۆدەمیش.

ئەو رۆژە چیی رۆژنامەی ئەزمیر بوو، نووسیان:

بەزەیی و بەخشندەیی بێبڕانەوەی پاشایانە، بەردەوام هەموو رۆڵەیەکی میللەتی گرتووەتەوە و دەگرێتەوە. ئەمجارەش یەکێك لە رۆڵە تاوانبارەکانی

## ******* پاشکۆ *******

ئەم مەملەکەتە، پەنای هێناوەتە بەر قاپییەی پادشایەتی و داوای لێبوردنی کـردووە. لێخۆشـبوون و چاوپۆشـینی پادشـای خاوەنشـکۆمان ئەویشـی گرتۆتەوە و چاخیرجالی مەمەد ئەفە و هەموو هاورێکانیشی کەوتبوونەتە بەر سێبەری بێبڕانەوەی گەورەیی و بەخشندەیی بێسنووری پادشـایانە و زاتـی پـیرۆزی خاوەنشـکۆمان لەوانـە خـۆش بـووە، و میرزابنووسـی تایبـەتی خاوەنشـکۆ، "عیـزەت پاشـا" ئـەو شـانازییە پـێ بـڕاوە، رەحمـەت و بەخشـندەیی پادشـایانە بـە خـەڵك رابگەیـەنێ. دڵـی نـەرم و پـڕ بـەزەیی خاوەنشـکۆ، کـە تژییـە لـە بـەزەیی و میهرەبـانیی بـێ بڕانـەوە، قایـل نـابێ بەندەی پەشیمان و رووڕەش لە دەرگاکەی بڕەتێنێ، بەڵام هەر کەس بیـەوێ مەملەکەتەکـەمان بشـێوێنێ، خـراپ دەبـینێ و زۆر بـە تونـدی سـزا دەدرێ. کەوابوو ئەوەی گوترا، بە هەموو تاوانباران رادەگەیەنرێ، کە بە زووترین کات بێنەوە بەر دەرگای حەزرەتی خاوەنشکۆی دادپەروەر و هانای بۆ بێنێ و لـە کانیاوی میهرەبانیی پادشایانەی خۆی پاراو بکا.

والیی ئەزمیر ـ کامیل پاشا



# ١٢



ئەفە هاتەوە ئاوایی. چەند رۆژێك لە ژووریٚ نەهاتە دەریٚ. هەر پێی نەنایە دەریٚ. کەسیش نەچووە سەردانی. کەس نەیدەزانی خەریکی چییە. ئەفە حاڵەتێکی سەیروسەمەرەی هەبوو. هەمووان بۆی بەپەرۆش بوون. هەر حاجی ئاگای لە هەموو شتێك بوو، بەڵام ئەویش دەترسا بچێتە لای ئەفە.

رۆژێکیان ئەفە جلوبەرگی لەبەر کرد و هاتە دەریٚ. رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو. بەتاقی تەنیٚ لە ئاوایی چووە دەریٚ. لەو رۆژە بەدواوە، بەردەوام ئەوە کاری بوو. خەو و خۆراکی نەبوو. هەر بەتەنیا لە گوندی دەچووە دەریٚ و بە دەشتێدا دەگەڕا. لەخۆڕایی بەملاولادا دەسووڕاوە. جار جارێکیش لە دەم ئاوەکە دادەنیشت و سەری دەخستە نێوان هەر دوو لەپی دەستی و چەند سەعاتان ئاوا دەمایەوە.

## ******* پلخو *******

رۆژێکیان دایکی لێی توورە بوو:

ـ ئەوە بۆ وات لێ هاتووە مەمەد؟ هەتا ئێستا ئاوام نەدیتبووی. بەخۆتـدا وەرەوە. پیاو نابێ ئاوا بێ. ئەو ئەدا و ئەتوارانە چین لەخۆتەوە تووتکە سەگ؟ دا قسە بکە بزانم. وەك شێتانت لێ هاتووە...

لەو دەمەدا حاجی وەژوور کەوت:

ـ ئەفەی من.

ـ ئەسپەکەم بۆ بێنن.

ئەسپیان هێنا. ئەفە سوار بوو.

ـ کەس بەدوومدا نەیە. بە لینگدان رۆیشت و تازە رۆژ ببۆوە، گەیشتە گوندی "کایا. " چووە نێو دێ. ئەوانەی دیتیان، بەوانی دیکەشیان راگەیاند. خەڵکەکە زانییان چاخیرجالی هاتووە و لە دەوری کۆ بوونەوە. چاخیرجالی رۆیشت و چووە ماڵی کوێخا. دەمێك بوو یەکتریان دەناسی. یەکەم قسەی ئەوە بوو:

ـ کوێخا ئەفەنی، دەمەوێ ماڵەکەت بە کرێ لێ بگرم. قایل دەبی؟خۆشت دەچیتە خانووەکەی دیکە.

ـ کورە بەسەر چاوم ئەفە. چۆن قایل نابم؟ دەسبەجێ چۆلی دەکەین.

ـ تا دوو رۆژی دیکە چۆلی بکە.

ـ دڵنیا بە.

هەستان و دووبەدوو کەوتنە رێ. گەیشتنە سەر کانییەکە. کچانی گوند هاتبوون ئاو بەرن. فاتمەشیان لەگەڵ بوو. قژە پرەکەی کەزیی کردبوو و

## ****** یاخی ******

دەگەیشتە نێو قەدی. کچەکان ئەفەیان پێشانی یەکتری دا. چاخیرجالی وەك گەنجێکی هەژدە سالان هاتبووە سەر کانی.

لەپڕ وەخۆ هاتەوە. ئەفەیەك، بەو هەمووە ناو و ناوبانگەوە، لەسەر کانی راوەستاوە. خۆ کوێخاشی لەگەڵە. ئاوڕێکی داوە و ماڵاوایی لە کوێخا کرد:

ـ ماڵاوا کوێخا.

ـ خوات لەگەڵ ئەفە.

سواری ئەسپەکەی بوو و کەوتە رێ.

ئاگری ئەشق لە ناخیدا کلّپەی دەسەند. هەر چوار مانگێك دەبوو، کە بۆ یەکەم جار چاوی بە کچە کەوتبوو و ئاشقی ببوو. زۆر تینی بۆخۆی هێنابوو، بەلام هەر نەیتوانیبوو لەبیری بکا. هەرجارێکی دەیدی، هەموو گیانی دەکەوتە لەرزین و ئۆقرەی لێ هەڵدەگیرا. یەکەم جار بوو ئاشق دەبوو. شەرمی لەخۆی دەکرد. چەند رۆژێك لە ماڵەوە خۆی بەند کردبوو. گەلێ رۆژان بەتاقی تەنێ چوبووە دەشتێ و بیری کردبۆوە. کەچی هەر نەیتوانیبوو ئەو کچە لەبیر بکا. نەیدەتوانی ئەو بەلایە لەسەر خۆی دوور بکاتەوە.

ئەو یاخییە گەورەیەی دەیتوانی بێبەزەییانە پیاو بکوژێ، ئەو چاخیرجالییەی بە دڵرەقی ناوبانگی رۆیبوو، قایل نەدەبوو، دڵی ئیراز بێشێنێ. دڵی نەدەهات خەفەت بداتە ئیراز. ویژدانی لێی نەدەگەڕا هەوێ بەسەر ئەو ژنە بە ئەمەگەی بێنێ. ئیراز ژنی بوو. دۆستی بوو. زۆر فیداکار بوو. یەکەم ژنی بوو. چیی بەلا و نەهامەتی و کوێرەوەریی بوو لەسەر چاخیرجالی بەسەری هات و متەقیشی نەدەکرد.

هاتە حەوشە. خۆی لەسەر ئەسپەکەوە فڕێ دا و چووە لای ئیراز:

******* يلخو *******

- خۆت سەخڵەت مەکە ئیراز. من خەریك بوو کارێکی خراپم دەکرد. خەریك بووم نامەردیم لە هەقتدا دەکرد، بەڵام دڵم قایل نەبوو. من جگە لەتۆ کەسم ناوێ.

ئیراز:

- ئەو قسانە مەکە ئەفە. ئەفەیەکی وەك تۆ، نەك دوو ژن، چواریشی بۆ کەمە. خۆت ئازار مەدە. تۆ چیت پێ خۆش بێ، منیش پێم خۆشە. ئەگەر ئیزن بدەی هەر خۆم دەچم و ئەو کچەت بۆ دەخوازم.

— رووت سپی بێ ئیراز. خودا لە منت نەستێنێ. ماوەیەك نەمتوانی بەسەرخۆمدا زاڵ بم.

ئەو ئەفەیەی هەموو شتێکی لەدەست دەهات، ئەو ئەفەیەی وەك ئاوخواردنەوە مەحاڵەکانی دەشکاند، لێرە دەستەوستان کەوتبوو. هەر دەتگوت هێزی لەبەردا نییە. توانای هیچی نەبوو. شەرمی لە لاوازیی خۆی دەکرد. یەکێکی نارده لای هایم. هایم هات.

- وەرە هایم. هانێ ئەوە پارە. خانووەکەی کوێخای کایاکویم بەکرێ گرتووە. هەستە بچۆ ئەزمیر و کەلوپەلی ماڵێ بکڕە. دەبێ هەموو شتێك بکڕی. هەفتەیەکی دیکە دێم و سەیری دەکەم. دەبێ هەموو شتێ ئامادە بێ.

دوای هەفتەیەك لێی سواری ئەسپ بوو و وەك بای شەماڵ ڕۆیشت. گەیشتە گوندی کایا. هایم دارتاش و بەنناى هێنابوو. سەرقاڵی ئیش بوون.

- ماندوو نەبی هایماغا.

- خودا راوەستاوت بکا ئەفەم.

## ******* یاخی *******

ئەفە سەیری ژوورەکانی کرد. هایم دەسرەنگین بوو. خانووەکە رێك وەك ماڵی دەرەبەگەکانی ئەزمیری لێ هاتبوو.

ـ باشت سەیر کردن ئەفە؟ بەدڵت بوون؟ بەخوای ماڵی پاشایەکی وەك "نەقیب ئۆغڵی"یش ئەوەندە جوان نییە. هایم خۆش سەلیقەیە ئەفە. خۆش سەلیقە.

ئەفە پێکەنی:

ـ هەر بژی هایم. دەستت خۆ بن.

هاتەوە ئاوایی. ردێن سپییەکانی گوندەکەو چەند ئاغایەکی دێهاتەکانی دەوروبەری خڕ کردەوە و بۆ خوازبێنی ناردنییە لای باوکی فاتمە، بەڵام باوکی فاتمە کەیفی بەچاخیرجالی نەدەهات. چۆن دڵی دەهات کچەکەی بدا بە یاخییەك؟

ـ من بچووکتانم، ئاغا، بەڵام کچی نادەمێ. سوور بوون و پێیان داگرت. هەڕەشەیان لێ کرد، هەر بێ فایدە بوو. دەی باشە ئێستا چۆن بەچاخیرجالی بڵێن؟ لەوانەیە لەپڕ تووڕە بێ و زیندەوەر لە کایاکویدا نەهێڵێ و هەمووان بکوژێ و کچەش بە زۆری بەرێ.

ئەو قسانە بێ سوود بوون. باوکی کچە لێی سوور بوو، چاخیرجالی ئەگەر لە سۆی ئەو ئەشق بشمرێ، دەست بۆ کچەکەی نابا. ئەفە کابرایەك نەبوو بەزۆرەملی کچ لە خەڵك بستێنێ. چاخیرجالی زۆر پابەندی بنەماکانی جوامێرییە. باشترین بنەمای جوامێرییش ئەوەیانە، کە ئەفەیەك، هەرگیز دەست بۆ ناموسی کچ و ژنی خەڵك نابا. ئەفە، هەرگیز تەماح لە ناموسی کەس ناکا. تەنانەت ئەگەر تفەنگچییەکیشی کەرێتی بکا و دەست بۆ

## ******* یاخی *******

نامووسی خەڵك بەریّ، ئەفە دەیکوژیّ. چاخیرجالی خۆی پاسەوانی نامووسی خەڵك بوو. باوکی فاتمەش باش ئەوەی دەزانی.

چاخیرجالی کە زانییەوە باوکی کچە قایل نییە، وەك شێتی لیّ هات، بەڵام چیی پیّ دەکرا؟ چیی لە دەست دەهات؟ کابرا کچی خۆیەتی و نایدا. دانیشت و نامەیەکی تێرو تەسەلی بۆ باوکی فاتمە نووسی. هەڕەشەی ئەوەی لیّ کرد کە دەیکوژیّ و گوندەکەشیان دەسووتێنیّ و خاکی بە توورەکە دەکێشیّ.

هایم ئەفەنی نامەکەی برد و دایە باوکی کچە، بەڵام ئەو هەر گوێشی بە نامەکە نەبزووت. تەنیا ترسێکی لیّ نیشت و ئەو رۆژە گوندەکەی بەجیّ هێشت. لە پێشدا چووە "تیرە" و دوایی چووە ئەزمیر. پەیامێکیشی بۆ چاخیرجالی نارد:

- من لە ئەزمیرم. جا ئێستا ئەوە خۆت و گوند و کچەکەم. ئەگەر دەتوانی، برۆ بە زۆرەملی کچەکەم بەرە. چیت پیّ خۆشە بیکە. من ئەزمیر بەجیّ ناهێڵم و ناشگەڕێمەوە ماڵەکەم. ئەگەر دەتەویّ بە زۆرەملیّ زەماوەند لەگەڵ کچەکەم بکەی، کەیفی خۆتە بیکە، بەڵام من قایل نیم...

چاخیرجالی نەیدەزانی چ جوابێك بەو نامەیە بداتەوە. باوکی فاتمە کاری خۆی کردبوو. هەموو رێیەکانی لیّ گیرابوو و خۆی دەستەوستان لە کایاکوی مابۆوە. بڕوای نەدەکرد، رۆژێك ئاوا دەستی لە کووپە بگیریّ و غرووری شکابوو. چەند نامەیەکی ناردە ئەزمیر. پارەی نارد و هەڕەشەی کرد، بەڵام کابرا لە کەری شەیتان نەدەهاتە خواریّ.

## ******* یلخی *******

چاخیرجالی تەواو داما. وەك شێتانی لێ هات. چیی ردێن سپی و دەمڕاستی کایاکۆی هەیە، هەمووی خڕکردنەوە و لە ژوورێکدا بەندی کردن. زۆربەی هەرە زۆریشیان خزم و کەسی فاتمە بوون. پێی گوتن:

ـ لە ئاغا محەمەدی باوکی فاتمە راسپێرن، بێتەوە. هەتا نەیەتەوە بەرتان نادەم. هەموو رۆژێ هەندێ نان و قومێ ئاو نەبێ ناتاندەمێ. ئەگەر دڵنیاش بم نایەتەوە، هەمووتان دەکوژم و دەچمەوە چیا.

ردێن سپییە بەندکراوەکان، نامەی پڕ لە هەست و سۆزیان بۆ باوکی فاتمە نووسی. بەڵێن و گفتیان دایێ. لەبەری پاڕانەوە، بەڵام ئەو شتانە دڵە رەقەکەی ئەویان نەرم نەکردەوە. داوایان لێ کرد، نەهێڵێ لەبەر خاتری کچێك، ئەو هەمووە خەڵکە بکوژرێن و گوندەکە بسووتێنرێ، بەڵام کابرای کەللە رەق لە کەری شەیتانێ نەهاتە خوار.

ماوەیەك لە ئەزمیر مایەوە و دوایی هاتە تیرە. خەریك بوو پێی دەچەقاند. خۆی بەسەر چاخیرجالیدا هەڵدەکێشا و قەڵسەی لێ دەگێڕا. بە هاتنی بۆ تیرە، لە راستیدا بە چاخیرجالیی دەگوت:"هیچ لێت ناترسم. کچەکەشمت نادەمێ. جا چیت لە دەستت دێ، مەپرینگێوە. "

هەفتەیەکی خایاند و هەروا ساغ نەبوونەوە. ئیراز کە دەیدی، ئەفەکەی داماو و سەرلێ شێواوە، لە هەمووان پتر ئازاری دەچێشت. قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد و خۆی لە هیچ کارێك نەدەگەیاند. شێواوییەکەی ئەفە خەریك بوو دەیکوشت. کە بیستییەوە باوکی چکە هاتووەتە تیرە، ئیتر خۆی پێ نەگیرا. بەبێ ئەوەی کەس بدوێنێ، دەمانچەکەی لە قەدی دا و سواری ئەسپ بوو و راستەوڕێ بەرەو تیرە تاوی دا. لە رێگایە بەخۆی دەگوت:"دەچم و ردێنی

## ******* یاخی *******

ئەو کافرە بێدینە دەگرم و دەیکوژم. دەڵێم، نامەرد، تۆ لە ژیانتدا پیاوێکت دیتووە هێندەی چاخیرجالی مەرد بێ؟ من ژنی چاخیرجالیم. تۆ منت پێ چییە؟ پێت وایە منیش ژنێکم وەك کچەکەی خۆت؟ هەزاری وەك کچەکەی تۆ بە قوربانی تاڵەموویەکی سەری چاخیرجالی. باشە لەوەتی ئەو شاخانە شاخن، پیاوێکی وەك ئەفەی منیان بەخۆوە دیوە؟ لەبری ئەوەی خۆشحاڵ بی و بە دوو دەستان کچەکەتی پێشکەش بکەی، رادەکەی نامەردی رۆژگار؟ من ژنی چاخیرجالیم. تێگەیشتی بێدین؟"

زۆر باش دەزانم چۆنی بدوێنم ئەو نامەردە. پەلە مەکە با دەستم پێی رابگا بەو کافرە. جا دەزانم چیی بەسەر دێنم. "

چووە مالی ناسیارێکیان. ئەسپەکەی لەوێ بەجێ هێشت. لە تووڕەییان دەلەرزی. خاوەن ماڵ خولقی کرد:

ـ فەرموو ئیراز خاتوون. تاوێ بحەسێوە.

بەڵام ئیراز رانەوەستا. بە پەلە هاتە دەرێ. هەموو شوێنێك گەڕا. باوکی فاتمەی لە ماڵێك دۆزییەوە. بەرۆکی گرت و رایکێشا ژوورێك:

ـ جوان سەیرم بکە ئاغا. من ئیرازم. ژنی چاخیرجالی. جوان گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی. بیستوومە تۆ نامەردی دەکەی و کچەکەت نادەیە ئەفە. ناهێڵم ئەفە لە هەمبەر نامەردی وەك تۆدا دەستەوستان بێ. هەتا زووە بچۆوە گوندەکە و کچەکەت بدە بە چاخیرجالی. ئەگینا من و تۆ لێکی دەردەکەین و لەتوپەتت دەکەم. ئەفە ناتوانێ بتکوژێ، بەڵام من دەتکوژم. چیشت کردووە تا ئێستا، ئیتر بەسە. نە ئەفە ئاگادار و نە هیچ کەسیش دەزانێ من هاتوومە ئێرە. دەگەڕێیەوە کایاکۆی... تێگەیشتی؟ ئیتر نامەردی بەسە. بەکەسیش

******* پاخر *******

نـالێی منـت دیتـووه. مـن نـاهێڵم ئەفـە لای تـۆ بشـکێ و بچـووك بێتـەوه. تێگەیشتی ئاغا؟ ئەفە پێی شەرمە بێ و لەسەر کچێك تۆ بکوژێ. شـوورەییە بۆ وی، بەڵام مـن بتکـوژم، شـانازییە بۆم. جـا ئێسـتا پەلـە بکـە. زۆر خێـرا بچۆوه ئاوایی و بە دڵی خۆت کچەکەت بدە چاخێرجالی.

چـاوەڕێ نـەما وەڵام وەرگرێتـەوه. هاتـە دەرێ و بەپەلـە گـەڕاوه. سـواری ئەسپەکەی بوو و لینگی دا. خۆر ئاوا نەببوو کە گەیشتەوه ئاپاسۆرات.

بۆ سـبەینێکەی هـەموان دیتیـان بـاوکی فاتمـە هاتـەوه ئـاوایی و هـەمووانی ئاگادار کردەوه کە ئامادەیە کچەکەی بدات بە چاخێرجالی و بە گیان و دڵیش قایله بەو زەماوەندە. زیندانییەکان بەر بوون. بوو بە ئاهـەنگ و شـایی. ئاغـا محەمـەد لەگـەڵ چـاخێرجالی ئاشـت بـۆوه و گوتیشـی زۆری خـۆش دەوێ. ئاهەنگی زەماوەندەکەش خۆی گێڕای. شانازییشـی پێـوه دەکـرد، کچـەکەی داوەتە پیاوێکی وا. ئێرازییـش هـاتبۆوه شـاییەکە. هـەمووان سـەریان سـووڕ مابوو.

چاخێرجالی بوو بە زاوا.



# ١٣



ماڵەکەی چاخیرجالی ببووە میوانخانەی حکوومەتی. چاخیرجالی فەرمان دەردەکا. ناهێڵێ ناهەقی بکرێ و دەستی هەژاران دەگرێ. ئەگەر خۆشی لەدەستی نەیە، فەرمان دەدا دەوڵەمەندەکان کۆمەگی هەژاران بکەن. ماڵێکی تازەشی لە ئاپاسۆرات بۆ خۆی دروست کردووە. ماڵێکی گەورەی وەك ماڵی بەگەکان.

هەر لەو کاتەدا، چاخیرجالی چاوی بە ژەنەراڵێك و رۆژنامەوانێکی ئیتالیایی کەوت. ئەوان سەریان لە دیتنی سوور ما. ئاخۆ ئەوە هەر ئەو یاخییە سامناکەیە، وا لە هەموو ئەورووپادا باسی دەکەن؟ چاخیرجالی پیاوێکی بەژن و باڵا مامناوەندی و تۆزێ لاواز بوو. زۆریش بە ئەدەب بوو. لە حاڵێکدا

## ******* یاخی *******

ئـەوان چـاوەڕوانییەکی دیکـەیان هـەبوو. ئـەوان پێیـان وابـوو، بەسـەر دێوەزمەیەکدا دەکەون. کاتێ دیتیان ئەو کابرایەکی بەژن و باڵا مامناوەندی و بەئەدەبە، واقیان وڕ ما.

ڕۆژنامەوانە فەڕەنسی و بەریتانییـەکانیش هاتنـە سـەردانی. چاخیرجالییش بەو دیدارانە شاد دەبوو و بەخۆی دەنازی و پیاوەکـانی رادەسپارد، هـەواڵی ئەو چاوپێکەوتنانە بە هەموو ناوچەکەدا بڵاو بکەنەوە.

دەیەویست زەوییەکی کشتوکاڵیی گەورەش لە "میلاس" بکڕێ. قـەول وابـوو لە پێشـدا پارەکـەی بدا. نیگـەرانی دوارۆژ بـوو. نەیدەویسـت منداڵەکانیشـی تامی هەژاری بچێژن.

دوای ئەوەی چاخیرجالی لە چیا هاتە خوارێ، دیسان چیاکان پڕ بوونەوە لـە یاخی ورد و درشت. ئەودەمەی ئەو لە چیا بـوو، ئـەوان نەیانـدەوێرا تـوخنی چیا و کەژ بکەون. ئێستاش کە هاتووەتەوە دەشتێ، ئـەوان لـە دەشـتێ خـۆ رانـاگرن. ژمارەیـەکی زۆر لـەو یاخییانـە دوژمـنی قەستەسـەری چـاخیرجالی بوون. ئەو یاخییە ورد و گەورانـە، چەرمەسـەرییان تـووش دەکـرد. دۆسـت و هەڤاڵەکانیان ئەشکەنجە دەدا. ئەو ئاغایانەی لەگەڵی دۆست بـوو، ئەوانـەیان دەڕفاند و دەیانبردنە چیا و داوای پارەیان لێ دەکردن. لە راستیدا قەڵسەیان لە چـاخیرجالی دەگێـڕا، بـەڵام ئـەو هیچـی لەدەسـت نـەدەهات. نەیـدەتوانی راویان بنێ و بکەوێتە شوێنیان. لەبەر ئـەوەی راونـانی یاخییـە راکردووەکـان کارێکی بەجێ نـەبوو. لەوانـەبوو زۆر سـووك و سـانا بکەوێتـە بۆسـەیانەوە و بیکەن بە قوربانی فیشـەکێك. ئەمـە زۆر ناڕەحـەت بـوو، بـەڵام زۆری نـەبرد، ڕووداوێکی تـازە ئەوەنـدەی دیکـە ناڕەحـەتی کـرد. ڕۆژێکیـان لەگـەڵ چـەند

## ******* پلخر *******

دەرەبەگێکی ناوچەکە، چووبوونە لای ئاشی. خواردیان و خواردیانەوە و رایانبوارد. هەموو هاوڕێیەکانی نیشانەشکێنی باش و ئەنگێوە بوون. دایاننا بیکەنە کێبڕکێی نیشانەداکردن.

کێ دەبوو دەست پێ بکا؟ دەی خۆ دیارە. دیارە، چاخیرجالی دەبێ دەست پێ بکا. هێلکەمریشکێکیان بۆ داکرد. چاخیرجالی سێرەی لێ گرت. زۆر لەخۆی دڵنیا بوو. تەقەی کرد. فیشەکەکەی لە بن هێلکەکە دا و تەپوتۆزی هەستاند. چەند فیشەکێکی دیکەشی پێوەنا هەر نەیئەنگاوت. ئارەقەی کردبوو و سوور هەڵگەڕابوو.

یەکێك لە ئاغاکان گوتی:

- لەوانەیە دەمانچەکەت کۆنە بێ ئەفە.

- نەوەڵڵا زۆریش نوێیە.

- دەی دیارە دەمێکە تەمرینت نەکردووە.

- دوو مانگە دەستم بۆ چەك نەبردووە.

- کوڕە تاقە یەك ڕۆژ تەقە نەکەی، جێی خۆت ناگرییەوە. من خۆم هەموو ڕۆژێ چەند جاران تەمرین دەکەم.

ئاغا دەمانچەکەی هەڵکێشا و تەقەی کرد. هێلکەکە پەرش و بڵاو بوو.

ئەفە:

- ئای دەستخۆش ئاغا. قسەی تێدا نییە.

بەڵام ئاگرێك لەدڵیدا نێڵەی دەهات. کە ئەفە ئاوای بەسەر بێ، ئیتر مەرگ بەردەرگای پێ گرتووە. یانی دیسان ناچار دەبێ بچێتەوە شاخ؟ ئەو هەمووە حەسانەوە و هێمنییە... پارە، ناوبانگ... ژیانی بێ ترس... ژیانی

## ******* یاخی ******

مرۆڤانه... زۆر باشه، بەڵام پێگه راستەقینەکەی لەدەست دەکا. کەژ و کۆ دیاری دەکەن کێ پیاوە. ئەو جۆرە ژیانە بۆ ئەو مانای نەبوو، بەڵام زۆری کەیف بە چیا و کەژیش نەدەهات. زۆر تەمبەڵ و تەوەزەل ببوو.

شتێکی دیکەش ئەوی لە ژیان بێزار دەکرد. چیا پڕ ببوو لە یاخی، بەڵام یاخیی چۆن؟ هەر هەموو جەردە و دز بوون. هیچ کامیان وەك چاخێرجالی نەبوون. کار و پیشەیان ئەوە بوو، پارە لە ئاغاکان وەرگرن و بە ئەمری ئەوان هەژاران تاڵان بکەن و ئازاریان بدەن. زۆربەشیان پیاوێکی بەشەرەف نەبوون.

خەڵکی ئۆدەمیش تۆمارێکیان ئیمزا کۆکردەوە. خەڵك لە دەست یاخییەکان وەزاڵە هاتبوون. وەزگیان دابوو. خەڵك ئیسحەتیان لێ هەڵگیرابوو. دەهاتن و سکاڵایان دەکرد و لەبەر ناوەند دەپاڕانەوە دیسان تاقمی راوەدوونان پێك بێننەوە و "قەرەسەعید پاشا"ش بکەنەوە فەرماندەیان. سەعید پاشای لەخۆبایی کە پێشتر هیچی لە راوەدوونانی چاخێرجالی وەگیر نەکەوتبوو و بەچۆکدا هاتبوو و پۆرتی شکابوو، هەر ئەو شکانەش وای لێ کردبوو هەست بکا سووکایەتیی پێ کراوە، ئەو ئەسپاردەیەی قەبووڵ کرد و هاتە ئەزمیر.

بە لێبوردن دەستی پێ کرد: هەموو یاخییەکان دەتوانن لە ماوەی دە رۆژاندا دەتوانن خۆیان بەدەستەوە بدەن و لێخۆشبوون بیانگرێتەوە. ئەگینا حکوومەت دەتوانێ قۆڵبەستیان بکا.

هەر واش بوو. ژمارەیەکی زۆر لەو یاخییانە هاتنەوە و خۆیان بەدەستەوە دا. ئەو خۆبەدەستەوەدانە وای لە سەعید پاشا بکا، پتر بەخۆی بنازێ و متمانەبەخۆی بکاتەوە.

## ******* پاشکۆ *******

چاخیرجالی لەوەتەی لێی خۆش ببوون، چەکەکەی هەر راگرتبوو. دۆست و هەڤاڵەکانیشی هەر چەکدار بوون. بۆ خۆی حکوومەتێکی جودای پێك هێنابوو. ئەو کارە بۆ قەبووڵکردنێ نەدەبوو. ئەویش دەبوو وەك هەموو هاونیشتمانییەکی دیکە، بەبێ چەك بێ و بچێ. خۆشی دەبێ ئەوە قەبووڵ بکا.

بەپێی لێکۆڵینەوەکانی سەعیدپاشا، چاخیرجالی ناچار بوو پێ مل بێ. ژنی هێناوە. ژنەکەی زۆر خۆش دەوێ. ماڵێکی تازەی دروست کردووە. خەریکە زەویی کشتوکاڵی دەکڕێ. ئیتر ئەستەمە دەست لەو ژیانە ئاسوودە و هێمنە بەربدا و بچێتەوە شاخ.

بەپێی ئەو بیر و فکرانەی خۆی، نامەیەکی بۆ چاخیرجالی نووسی:

جارێکی دیکە بەرپرسیارەتیی راوەدوونانی یاخییەکان بەمن ئەسپێردراوەتەوە. پادشای دادپەروەرمان وای ویستووە، کۆتایی بە یاخیگەری و سەرەڕۆییەکان بێنین و هەموو میللەت لە هێمنی و ئاسایشدا بژین. لەو بارەیەوە هەموو تەگبیرێك کراوە و ئەمری پادشایەتییش دەرچووە. ئیتر ئیزن نادرێ ژمارەیەك خەڵك، ژیان لە مەملەکەت تاڵ و حەرام بکەن. جا لەبەر ئەوەی فەرمانی چەککردنی شەلات و تێکدەران پادشا خۆی دەریکردووە، کەوابوو داوا لە جەنابت و خەڵکەکەی دیکەش دەکەین، چەکەکانیان بێننەوە و رادەستمانی بکەنەوە و وەك جاری جاران بەر لێخۆشبوون و بەزەیی پادشایانە بکەونەوە.

فەرماندەی تاقمی راوەدوونانی تێکدەران

سەرهەنگ سەعید

## ******* یاخی *******

چــاخێرجالی کــه نامەکــەی خوێنــدەوە، هــەر زۆری پــێ ســەیر بــوو. تفەنگچییەکانی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە. جارێکی دیکەش دەقی نامەکەی بۆیان خوێندەوە و ئەوجار گوتی:

- چەکەکانمان نادەینەوە حوکمەت.

- نایدەینەوە ئەفە.

- هەر سبەینێ دەچینەوە چیا.

دەچینەوە ئەفە.

لە نێوان ددانە چیڕکردووەکانییەوە، تفێکی کرد و گوتی:

- هەر ئەوێ ڕۆژێ دەبوو ئەو نامەردە بکوژم. هەرچۆنێك بوایە دەبوو بیکوژم.

- عوسمانی بابیشت بێ، نابێ متمانەی پێ بکەی. بتمێنێ جەنابی سەعید پاشا. دیسان یەکتر دەبینەوە.

جا ئەو نامەیەی بۆ نووسی:

"پیاو ئەگەر پیاو بێ، قەت چەکەکەی دانانێ. ئەگەر پیاوی وەرە و لێمی بستێنە. "

چاخێرجالی مەمەد

کەڕەی بەیانی بوو. تاو خەریك بوو لە پشت چیای بێش بارماقەوە دەهاتە دەر. ئەستێرە یەك لەدوای یەك بزر دەبوون. پەڵە هەورێکی سپی لەبەر تیرێژی خۆر دەدرەوشایەوە. لە ئاوایی هاتنە دەرێ. ئەفە سەری دانواندبوو. قسەی نەدەکرد. دڵی پڕ بوو. باشە بۆ دەستیان لە بەرۆکی بەرنەدەدا؟

******* پلخی *******

چەندی پێی کرابوو، دەستی هەژارانی گرتبوو. زاڵم و ملهۆڕانی کوشتبوو. چییان لە گیانی دەویست؟ بە لەبزێکی تاڵەوە گوتی:

ـ قەرزێکمان لەسەرە حاجی. لەبیرتە؟

ـ نەخێر ئەفەم. لەبیرم نییە قەرزباری کەسێك بین.

ـ لەسەرمانە حاجی. قەرزباری یەکێکین.

ـ کام قەرز ئەفە؟

ـ کە لە زینـدانێ بـووین، لـەوێ کابرایـەك بیسـتبوویەوە، ژنەکـەی مێـردی بـە براکـەی کـردووە. هـەر ئـەو کابرایـەی شـێت بـوو و قسـەی لەگـەڵ کـەس نەدەکرد... تا ئەمڕۆ سەرقاڵ بووین و هـیچ بیرمـان لـەو کابرایـە نـەکردبۆوە. ئێمە قەرزباری ئەو پیاوەین و دەبێ قەرزەکەی بدەینەوە.

ـ بەڵێ ئەفەم. دەبێ بیدەینەوە.

ـ حاجی!

ـ فەرموو ئەفەم.

ـ باشە ئەگەر ئێستا من ئـەو بێناموسـە ورد ورد بئـەنجنم، کـارێکی خـراپ و نادادپەروەرانەم کردووە؟

ـ نەخێر ئەفەم. ئەوە ئەوپەڕی دادپەروەرییە.

ـ ژنی بەندییەك... ژنی مەلێکی دیلی قەفەز... زیناحێ دەکا حاجی. ئـەویش لەگەڵ کێ؟ لەگەڵ برا نامەردەکەی مێردەکەی. دەبـێ کـارێکی خێـر بکـەین. بەر لەوەی بچینەوە شاخ، دەبێ ئـەو کـارە خێـرە بکـەین. خـۆ گوندەکـەیان دەزانی حاجی؟ ناوی ئەو ژنە و کەڵەگا نامەردەکەشی دەزانی؟ ئەگەر نـازانی خێرابە و فێریان بە.

## ****** یاخی *******

- دەزانم ئەفە. چما دەکرێ ئەو جۆرە شتانە لەبیر بکەی؟

- رێك دەچینە سەریان حاجی.

سیوادی بەیانیی سبەینێ، گەیشتنە گوندی گۆرین. هەڵیانکوتایە سەر ماڵی کابرا زیندانیکراوەکە و براکەی و ژنەکەیان گرت.

ئەفە ئەمری کرد:

- کۆتەرە دارێکی گەورە بێنن و لەو نێوەڕاستەی دابنێن.

هێنایان. ژنە و کابرا زەندەقیان چوبوو و وەك مێژۆکە دەلەرزین. دێهاتییەکانیش هەروا بەچاوی لە ژێلآهاتۆوە سەیری ئەفەیان دەکرد. کەس متەقی لێوە نەدەهات. ئەفە رووی کردە دێهاتییەکان:

- یەکێك ژنی براکەی خۆی هەڵخەڵەتێنێ و لەگەڵی بنوێ، دەبێ چ سزایەك بدرێ؟ دەبێ چۆن تۆڵەی لێ بکرێتەوە؟

دیسان هەموو بێدەنگ دەبنەوە.

- کابرای لێقەوماو لە زیندانێ ئەوە دەبیستێتەوە و شێت دەبێ. هەر ئێسك و پرووسکی لێ دەمێنێتەوە. لە شەرمان سەری هەڵنایێ چاو لەکەس بکا. سزای ئەو ژن و پیاوە چییە؟

دێهاتی وەك بەردێك، متەقیان لێوە نایە.

- ئەو نامەردە لەسەر ئەو کۆتەرەدارە راکێشن. تۆ بەو باسك و دەستانەت ژنی براکەتت لە باوەش دەگرت؟ پیلی ببڕن.

لە بن بنەوە پیلی دەپەڕێنن.

نۆرەی ژنەکە بوو لەسەر کۆتەرەکە رایکێشن. رایدەکێشن. فرمێسکان هەڵدەوەرێنێ و بە دەنگی بەرز دەپاڕێتەوە:

## ******* پلخو *******

ـ نەکەی ئەفەم. بە قەرەواشت بم. دەبمە خاکی بەر پێت ئەفە. کوڕە لەسەرت گەڕێم ئەفە. وەرە و لێم خۆش بە.

ـ چما ژنی بەندییەکی داماوی کاری وا دەکا؟ ئەو سەرە چەپەڵەی بپەڕێنن. سەری ژنە دەپەڕێنن.

گوندی دەڵێی رەق هەڵاتوون. هەر سەیر دەکەن. دەڵێ بوونەتە بەرد. کەس لە تەرمەکان ناچێتە پێش.

ئەفە:

ـ کاتی نوێژە.

تفەنگچی دەردەپەڕن و خێرا بەرماڵێك دێنن و دێن لەسەر پەینەکە رایدەخەن. ئەفە نوێژەکەی دەکا و دوعاکانیشی دەکا. گوندی جارێ سەیری ئەفە و جارێ سەیری تەرمە لەخوێن شەڵاڵەکان دەکەن.

ئەفە لە نوێژ دەبێتەوە. تفەنگچی لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و بەبێ ئەوەی لەبزی دەلەبزی دێهاتییەکان بگەڕێ، دەڕوا.

سەعید پاشا کە نامەکە دەخوێنێتەوە، لە داخان شێت دەبێ. ئەو نامەیە یانی چی؟ هەرچۆنێك بێ دەبێ ئەو چاخیرجالییە بگرێ. زۆر ناخایەنێ، هەواڵی تازەترین کوشتاری چاخیرجالی دەبیستێتەوە. سەعید پاشا هەموو جەندرمەکانی کۆ دەکاتەوە و بەرەو ئەو گوندە دەچێ وا جینایەتەکەی تێدا کراوە. دەوراندەوری گوندەکە گەمارۆ دەدا، بەڵام چاخیرجالی بووەتە باڵندە و فڕیوە.

سەعید پاشا شێلگیرانە بڕیار دەدات چاخیرجالی لەکۆڵ بکاتەوە. هۆردووە گەورەکەی دەجووڵێنێ و چەند رۆژان بە دوای چاخیرجالیدا دەگەڕێ، بەڵام

******* پلخو *******

شوێنپێی نادۆزێتەوە. چاخیرجالی دەڵێی بووەتە ئاو و زەوی قووتی داوە. نییە کاکە نییە. چاخیرجالی دیار نییە. جەندرمەی سەعید پاشا بەزەییان بەکەسدا نایەتەوە. پۆل پۆل دێهاتی و شوان و عێلاتی دەگرن. هەتا دەبزوون هەر لێیان دەدەن، بەڵام کەس ئامادە نییە بچووکترین سەرەداو لە چاخیرجالی بدەنە دەستیان. متەقیان لێوە نایە. کە قسەش دەکەن، شوێنەونکە دەکەن. سەعیدپاشا لە شەکەتی و سەرلێشێواوی بەولاوە هیچی پێ نابڕێ.

سەعید پاشا بەشوێن حەشارگەکاندا دەگەڕێ، بەڵام وا دیارە هیچ کام لە گوندی و رەوەندەکان چاخیرجالییان لە ماڵی خۆیاندا نەشاردووەتەوە. لە راستیدا هەموو ماڵێك حەشارگەی چاحیرجالییە، بەڵام کەس نازانێ حەشارگەی راستەقینەی ئەو لە کوێیە. خەڵك بە عالەمی ئاشکرا پشتیوانی لە چاخیرجالی دەکەن. کەس کەیفی بە حکوومەت نایە. خەڵك هەر هەمووی دژی حکوومەتن. چاخیرجالی شوێنەکەی قایمە. کەس ئامادە نییە خیانەتی پێ بکا.

هۆردوویەکی گەورەی عوسمانی هەموو کێوپارە و بن رەوەز و گابەردان لە کابرایەك دەگەڕێ و هیچیشی پێ ناکرێ. هۆردوویەکی گەورە. فەرماندەکەشی پیاوێکی ئازا و لەخۆباییە. پاشایەکی لووتبەرز... .



# ١٤



دوای ئەو رووداوانە چاخیرجالییش رووی کردەوە چیا. جێیەکەی ئەمین بوو. گوندێکی بچووك بوو لە نێو رەوەزەکاندا. خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر زۆریان خۆش دەویست. ژن و پیاو و گەورە و بچووك، هەر هەموو ئامادە بوون خۆی بەقوربانی بکەن. لەوەتەی بەردی بناغەی ئەو گوندە دانرابوو، پیاوی وا باشی بەخۆوە نەدیتبوو. نە حکوومەت و نە یاخی و نە ئاغاکان هیچیان وەك چاخیرجالی باش نەبوون. هەر هەموویان کەڵەگاییان لە دێهاتییەکان دەکرد. هەر ئەفە پێشی ناهەقی و زوڵمی دەگرت و یارمەتیی خەڵکی دەدا. ئەفەیان زۆر خۆش دەویست. دەیانپەرست.

******* پاخر *******

چاخیرجالی کە دەچووە ئەو گوندانە، بەبێ خۆپاراستن و پاسەوان دەچوو. زۆر خاترجەم و ئاسوودە بوو. ئەگەر حکوومەت هەموو خەڵکی ئەو گوندانە بگرێ و ئەشکەنجەیان بدا، ئەگەر هەمووشیان لەناو بەرێ، دیسان ئەفەی خۆیان پێوە ناکەن. لە بن ئەشکەنجەدا دەمرن و قسە ناکەن. هەم حکوومەت و هەم چاخیرجالییش دێهاتییە هەژارەکانیان تاقی کردبۆوە، سەدان پیاویان دابووە بەر قەمچی. بەند کرابوون، بەڵام هیچ کامیان چاخیرجالییان پێوە نەکردبوو.

- لە کوێیە؟

- لەو دەوروبەرانەیە. بڕۆن و بیدۆزنەوە. ئەگەر پیاون وەشوێنی کەون با بتانگرێ و دایکتان بگێ...

- لەکوێیە؟

- لە پشت ئەو رەوەزانەیە.

ئەو شوێنەی پیرەپیاوەکە پەنجەی بۆ راداشتبوو، گەمارۆ دەدرێ. هەمووی سەنگ و سووژن دەدەن، بەڵام هیچ شوێنپێیەك دیار نییە.

- ئەدی کوانێ مامە گیان؟ تۆش درۆت کرد. پیرەپیاوە تەریق نابێتەوە:

ـــ وەرن بچینە ئاوایی. لەوێ هەمووان دەزانن چاخیرجالی لە کوێیە. بستەمنداڵێکیش شوێنەکەی پێ دەزانێ. دڵنیابن شوێنەکەیتان هەر پێ دەڵێن.

ئەو پێداهەڵگوتنانەی پیرەپیاوەکە، جەندرمەکان بەرەو گوند پەلکێش دەکا. گوندی دەگرن و لە منداڵی حەوت ساڵانەوە تا حەفتا ساڵانە دەیاندەنە بەر قەمچی.

## ******* یاخو *******

- چاخیرجالی لە کوێیە؟

- نە دیتوومانە و نە دەیناسین.

- رایکێشن.

رایدەکێشن. ئەوەندەی تێهەڵدەدەن، خوێن دەرشێتەوە.

- نایناسم.

- لە ژیانمدا نەمدیتووە.

خەفتەیەکی تەواو زوڵم لەو خەڵکە دەکەن. تێیان هەڵدەدەن.ماڵیان دەسووتێنن، بەڵام دێهاتی متەقیان لێوە نایە. جەندرمە ماندوو و شەکەت و دەست لە گونان درێژتر، گوندەکە بەجێ دێڵن، بەڵام چاخیرجالی لەسەر رێ بۆسەی بۆ داناونەتەوە. هەر هەموویان دەکوژێ.

ئەفە دوو رۆژ بێدەنگ بوو. سێهەم رۆژ بانگی حاجیی کرد:

- دەبێ گەمەیەك بەو سەعیدپاشایە بکەین. شاخ بە شاخ دەیگێڕین. وای لێ دەکەین سەری لێ بشێوێ. وای لێ دەکەین، ئەو شیرەی لە مەمەکی دایکی خواردوویەتی، بیهێنێتەوە.

- هەقتە ئەفە.

- جا ئێستا دەزانی دەبێ چ بکەین؟

- فەرموو ئەفە.

- هەر لێرە دەمێنینەوە. مانگێك، دوو مانگ. سێ مانگ. جێیەکەمان ئەمنە. هۆردووی عوسمانی قەت ناتوانێ بێتە ئێرە.

- ناتوانن بماندۆزنەوە.

## ******* یاخی *******

- بشماندۆزنەوە، زۆر گرنگ نییە حاجی. ئێمە لێرە دەتوانین بەرنگاریان بینەوە. دەتوانین فەوجەکەیان بە یەك رۆژ لەناو بەرین. دوایش دەتوانین رابکەین و بچینە شوێنێکی دیکە. هیچ فەوجێك ناتوانێ ئەوەندە هەڵکشێ بەرەو سەر.

- ناتوانێ ئەفەم.

دەتوانین ساڵێکی رەبەق لێرە بمێنینەوە. دەبێ سەگ بە حەوشەیەك بەو سەعیدپاشایە بکەین. وای لێ بکەین ژیانی لێ تاڵ بێ.

- تێگەیشتم ئەفە.

- جا ئەمجار وا دەکەین حاجی. هەر یاخییەك لە چیایە و چیی قاچاخچیی دەشتێیە، هەر هەموو چاخیرجالین. خۆ دەزانی دەڵێم چی حاجی؟

- دەزانم ئەفە.

- ژمارەیەك لە گەنج و مێرمندالی گوندەکان بانگ بکە بێنە ئێرە. دەبێ مندالی چاوقایم و نەترس بن. هەر یەکێکیان ترسنۆك بێ، سەرمان بەفەتەرات دەچێ. لە حەشارگە و عێلاتییەکانیش راسپێرە. ئەوانیش دەبێ بەپێی نەخشەکە بجووڵێنەوە. دەبێ هەموو یاخی و قاچاخچییەکان بە ناوی چاخیرجالییەوە بناسێنن و جەندرمەکان وەشوێن یاخییەکان بخەن. لە ماوەی سێ رۆژاندا، حاجی؛ گەنجە چاونەترسەکانی گوندەکانی دەوروبەری هەڵبژارد. تفەنگچییەکانیش بە جلوبەرگی رەشماڵ نشینەکان و گوندی ئۆدەمیش و تیرە و ئایدینەوە چوون و نەخشە نوێیەکەیان بە گوندییەکان راگەیاند.



قەرەسەعید پاشا، دڵی خۆش بوو. زیاتر لەخۆی رادەدیت و بەخۆیدا دەپەرموو. هەموو دێهاتییەکان و تەنانەت ئەوانەی ماڵەکانیشیان پەناگەی چاخیرجالی بوو، هاوکارییان دەکرد. هەر هەمووان بەشوێن چاخیرجالییەوە بوون. هەر ئەوەندە بەس بوو دەوەنێك بجووڵێ. بەردێك خلۆر بێتەوە یان فیشەکێك بتەقێ، بۆ ئەوەی دەسبەجێ هەواڵەکەی پێ بگاتەوە. دیار بوو چاخیرجالی ئەجەلی هاتبوو، چونکە هەموو خەڵکەکە دژی بوون. بۆ هەموو شوێنێ بەدوویەوە بوون. ئەمڕۆش نەبێ، سبەی. ئاخرییەکەی لە داو دەکەوێ.

رۆژێکیان هەواڵیان هێنا، ئەوە چاخیرجالی لە فلانە کێوە.

سیخوڕ:

## ******* یاخی *******

ـ هەموو گوندەکەی ئێمە وا دەڵێن. چاخیرجالی هاتووە. لە دەم کانییەکە دانیشتووە. لە یەکێ لە حەشارگە کۆنەکانی دانیشتووە و خەریکە بەرخ دەبرژێنێ. کەس نازانێ ماڵی کێی هەڵناوە. ئەمشەو لە دەم کانییەکە دەمێنێتەوە.

چاخیرجالی کە دەستی بە یاخیگەری کرد، لە شوێنە ئەمنەکانی چیاکاندا، گەلێ حەشارگەی دروست کرد. لەسەر هەر گرد و زینوێ و ملانەیەك، حەشارگەیەك دروست کرا.

قەرەسەعید پاشا، یەکەم هەلی خۆی بەدەست هێنابوو. تەلەگراف نارد بۆ ئەزمیر و ئایدین و پێی راگەیاندن، چاخیرجالی رێی راکردنی لێ گیراوە. یەکەم دەستەی جەندرمەکانی نارد. بەدوای ئەوانیشدا دووەم دەستە و سێهەم دەستە. ئەوجار هەستا و سەربازەکانی برد و شوێنەکەی گەمارۆ دا. کەژ و کۆ پڕ بوون لە سەرباز. خۆبەخشە ئەڵبانیاییەکان، ئەو یاخییانەی چووبوونە خزمەتی دەوڵەتەوە و تفەنگچیی ئاغاکان...

دەمودەست بوو بە تەقە. ئەوانەی گەمارۆ درابوون، وەك کێو راوەستابوون و بەرەنگارییان دەکرد، بەڵام دەیانتوانی چەندە خۆیان راگرن؟ دوو سەعاتی رێك، تەقەیان لە یەکتری کرد. دوایی دەنگی تەقەی یاخییەکان کپ بوو. شەو داهاتبوو. هەواکەی تاریك بوو.

سەعید پاشا فەرمانی دا:

ـ تفەنگچییەکانی چاخیرجالی تێداچوون، بەڵام کەمتەرخەم مەبن. بازنەی گەمارۆکەیان لێ توندتر بکەن. تا بەیانی لێرە چاوەڕێ دەبین.

## ******* پلخۆ *******

هـەر ئـەو شـەوە تەلـەگرافی بـۆ هـەموو لایـەك نـارد، کـە بـەڵێ چـاخیرجالی و داروده‌ستەکەی لەناو بـردووە و سـبەی بـەیانی تەرمـەکان دێنێتـەوە گونـدی ئۆدەمیش. هەواڵەکە گەیشـتەوە ئـەزمیر و ئایـدین. هـەواڵی سـەرکەوتنەکەی سـەعید پاشـا وەك تـۆپ دەنگـی دایـەوە و هـەموو ناوچـەکەی تەنییـەوە. تەنانەت گەیشتە ئەستەمبووڵیش.

ڕۆژ بـۆوە. سەعیدپاشـا چـووە سـەر تەرمـەکان. چـوو چ ببـینێ؟ پـانزە قاچاخچی وەك بێـژینگ دابێـژرابوون. تەنانـەت ئەسپەکانیشـیان کوژرابـوون. توورەکە کونکون بوو و تووتنی قاچاخچی بڵاو ببووەوە. سـەعید پاشـا مـات بوو. وەك پەیکەرەیەکی سەهۆڵ ڕاوەستابوو و قسەی نەدەکرد. ئیتر سـواری ئەسپەکەی بوو و بەتاقی تەنێ بەرەو ئۆدەمیش کەوتە ڕێ. پاشای لەخۆبایی هەستی دەکرد سووکایەتیی پێ کراوە.

خەڵکەکە بە نیگەرانییەوە چاوەڕێی تەرمی چاخیرجالی بوون. زۆر کـەس لـە دێهاتی دەوروبەرەوە هاتبوونە گوندی ئۆدەمیش. هـەر هەمووشـیان خەفـەت دایگرتبوون، بەڵام کە لەبری تەرمی چاخیرجالی، تەرمی چاچاخچییەکانیان دی، گاڵتەیان بە سەعیدپاشا کرد.

سەعیدپاشا وەك شێتانی لێ هاتبوو. لە هەر لایەکەوە هەواڵێکی چاخیرجالیی بۆ دەهات، دەمودەست سەربازەکانی بـۆ دەنـارد. دەسـبەجێ دەگەیشـتنێ. چاخیرجالییان گەمارۆ دەدا. دەبووە تەقە. چاخیرجالی و هاوڕێیانی کوژران، بەڵام کە تەرمەکانی دەپشکنین، دەیدی ئەوە چـەند قاچاخچییەکی دامـاون. جـاری واش بـوو دەسـتەیەك یـاخیی غـەوارە. بـەو جـۆرە پـتر لـە دە تـاقمی قاچاخچی و یاخیی لەناو بردبوو. ئەوەنـدە دامـاو بـوو، بـە پەلەپـەل هـەواڵی

## ******* پاخر *******

سەرکەوتنەکانی دەگەیاندەوە پایتەخت. زیاتر لە دە جاران تەلەگراف کردبوو و هەواڵی ناردبوو، کە بەڵێ چاخیرجالیی کوشتووە. هەموو رۆژێ و هەر سەعاتێك و چەند کەس دەهاتن و حەشارگەی چاخیرجالییان ئاشکرا دەکرد. پاشا بەملاولادا رایدەکرد و ئارەقەی هەڵدەڕشت. چیی پێ دەکرا؟ هەولی دەدا بێهیوا نەبێ. وردە وردە لەو کەسانە دڕدۆنگ دەبوو کە هەواڵیان بۆ دێنا، بەڵام چیی لەدەست دەهات؟ باشە ئەگەر هەر بەراستی یەکێك جێگای چاخیرجالیی نیشان بدا؟ ئەوانەی هەواڵی درۆیان هێنابوو، تێی هەڵدەدان، بەڵام دەسبەجێ کەسی دیکە دەهاتن و هەواڵێکی ناڕاستی دیکەیان دێنا.

هەواڵدەر بە ئاخ وناڵینەوە دەهاتن:

ـ فریامان کەوە پاشا. مردین لەدەست ئەو چاخیرجالییە. مردین پاشا. دەست لە هیچ شتێ ناپارێزێ. هەنگاو بە هەنگاو وەشوێنی دەکەوین. شوێنەکەی دەدۆزینەوە و دێین جەنابت ئاگادار دەکەینەوە، بەڵام ئەو نامەردە را دەکا و قوتار دەبێ.

پاشا ماندوو بووە. لە گیانی خۆی وەڕەزە. ئێستا ئیتر تووشی گونڕەشی خۆی بووە. ئەمجار بڕوا بەهیچ هەواڵێك ناکا. سەربازەکانی هەڵدەگرێ و لە خۆڕا دەسووڕێتەوە. گوند بە گوند دەگەڕێ. تووشی هەر گوندییەك دەبێ، فەرمان دەدا، رایکێشن و لە بن قەمچییاندا رەش و مۆری بکەنەوە.

ئیتر کەس نەیدەوێرا ناوی چاخیرجالی بێنێ. تەنانەت دوژمنە قەستە سەرەکانی چاخیرجالییش دەترسان لەوەی شوێنەکەی ئاشکرا بکەن. هەرکەس هەواڵێکی چاخیرجالیی هێنابایە، تەنانەنت هەواڵەکەی راستیش بوایە، بە ئەمری پاشا تێهەڵدانی دەخوارد و ئەشکەنجە دەکرا و تووشی

## ******* پاخر *******

زیندانیّ دەبوو. زیندان پڕە لە تفەنگچیی چاخیرجالی. هەر کەس ژمارەی بەندییەکان ببینیّ، پێی وایە، چاخیرجالی لە عوسمانیی پتر سەرباز هەیە. جگە لە سەعید پاشا، هەموو پیاوەکانی دەوڵەت پێیان وایە.





چاخیرجالی هیچ خەفەتێکی نەبوو. لە گوندەکەی خۆی، بێ خەم و خەیاڵ دەژیا. هەموو رۆژێ دەچووە تەمرینی تفەنگ هاویشتن. بە کەیفی دڵی رای‌دەبوارد. لە خۆشییان شاگەشکە ببوو:

ـ دیتت حاجی؟ سەعید پاشای لەخۆباییت جوان دیت؟ ئێستا وەزعی چۆنە؟ هەر حەیای بەخۆیەوە نەهێشت.

حاجی:

ـ تەنیا شتێکت لەبیر نەچێ ئەفە. ئەگەر خەڵکمان لەگەڵ نەبوایە و یارمەتییان نەدابایین، هیچمان پێ نەدەکرا. لە یەکەم دەرفەتدا دەبێ چاکەی ئەو خەڵکە بدەینەوە. دەبێ هەموویان پۆشتە و پەرداخ بکەین.

## ******* پاخر *******

- بۆ خۆشم هەر وام بیر دەکردەوە. ئێستا دەتوانین بەبێ خەم و خەیاڵ بچینە دەشت. کەس ناتوانێ نامەردیمان لە هەقدا بکا. ئەگەر ئاشکراشمان بکەن، سەعیدپاشا بڕوا ناکا. تەنانەت دەتوانین بەبێ ترس بچینە نێو ئۆدەمیشیش. جا دەزانی چ دەکەین؟

- چ دەکەین ئەفە؟

- لە گوندەکانی بناری کێوپارە، سێ چوار کەسی قوون بە گێچەڵ دێنین. سەعید پاشا دێتە چیا. ئەو کات ئێمە دەتوانین داگەڕێین بەرەو خوار. لەوانەیە نەیەش، بەڵام ئەگەر هات، دوو لەو کوڕانەی بۆ دادەنێین، وەك مار پێوەی بدەن. تاقمێك ئەمڕۆ لێرە هەرایەك بنێنەوە و تاقمێك سبەینێ، لە شوێنێکی دیکە. ئێمەش بە کەیفی خۆمان دەچینە دەشتێ. ئەگەر ئەو سەعید پاشایەم شێت نەکرد، ناوی خۆم دەگۆڕم. ئامادە بن.

ئامادە بوون و کەوتنە رێ. رێگە بەردەڵێن و رەقێن بوو. لە هەڵدێرێکەوە دەچوونە هەڵدێرێکی دی. رۆژێك تا ئێوارە هەر بە رەوەزان هەلگەڕان. حاجی مستەفا پیر بوو. نەدەگەیشتە ئەفە. ئاخرییەکەی هاواری لێ هەستا:

- خەریکە دەمرم ئەفە. باشە بۆ بە رێگای تەختانیدا ناڕۆین؟

- نابێ حاجی. دوژمن تەنانەت مێرووولەیەکیش بێ، دەبێ...

- چما شتێك لە گۆڕێیە ئەفە؟ خۆ هیچ شتێکمان لە سەر رێ نییە. ئەوجار هەواڵدەرەکانمان زۆر باش دەجووڵێنەوە.

- ناکرێ حاجی. تەنانەت ئەگەر بڵێن سەعید پاشا و سەربازەکانی هەر هەموویشیان مردوون، دیسان لەخۆم غافڵ نابم. تەنانەت ئەگەر بەو چاوانەی خۆشم سەعید پاشا ببینم، دیسان هەر دەبێ پارێز بکەم.

## ******* یاخی *******

حاجی گلەیی نەکرد. بێدەنگ بوو. لە بن لێوانەوە جنێوی بەخۆی دەدا. جنێوی بە رەوەزەکان دەدا. جنێوی دەدا بە یاخیگەری. چاخێرجالییش زۆر کەیفخۆش نەبوو. ددانی چیڕ دەکردەوەو قسەی نەدەکرد. هیچ کام لە هەڤاڵەکانیشی کەیفخۆش نەبوون.

بەر لەوەی ئەفە و برادەرەکانی بگەنە دەشتێ، "عەلییە رەش" بەخۆی و چەند تفەنگچییەوە هەڵیانکوتابووە سەر گوندێك و کوڕی ئاغایان رفاندبوو و بردبوویانە شاخ. هەڵبەت بەپێی رێککەوتنەکەی پێشوو، کەس ناوی عەلییە رەشی نەهێنا. بە هەموو وڵاتیاندا بڵاو کردەوە، کە چاخێرجالی هێرشی کردووە و کوڕەی بردووە. سەعید پاشا بەوپەڕی توورەییەوە فەوجەکەی برد و بەرەو لای ئەوێ کەوتە رێ، بەڵام بۆ سبەینێ بەیانی، لە گوندێکی دوورتر، ماڵی ئاغایەکی دیکە تاڵان کرا و منداڵەکانی بە بارمتە گیران. سەعید پاشا ناچار بوو، دەستەیەکی دیکەش بنێرێتە ئەوێ. دوای رێگابڕینێکی تاقەتبڕ و زۆر، چاخێرجالی گەیشتە دەشتێ. خۆی و هاوڕێکانی زۆر زۆر شەکەت بوون. شەوێ چوونە گوندی "تیرە" و میوانی یەکێ لە خواپێداوەکان بوون. دە رۆژ لەسەر یەك لەوێ مایەوە. ماڵی یەکێك لە نامەردترین دەوڵەمەندەکانی هەڵبژاردبوو. ئەو کابرایە زەوی و زارێکی زۆری هەبوو و زۆریش بۆ رەعیەتەکانی خراپ بوو. شەوێکیان وەك بەڵای لابەلا بەسەریدا دا:

ـ کەس نەبزوێ.

ماڵەکەی پڕ بوو لە میوان.

ـ من چاخێرجالیم.

خاوەن ماڵ بە زمانلووسی گوتی:

## ******* یاخی *******

- فەرموو ئەفە.

- بمان بە سەر خەزێنەکە.

خاوەنماڵ وەپێشی کەوت و لە گەڵیان چووە سەر سندووقی دراوەکە. دەرگاکەی بۆ کردنەوە. حاجی لە پێشدا توورەکەی ئامادە کردبوو. زۆر بە سانایی دەیانتوانی سێ چوار هەزار سکە زێڕ بەدەست بێنن. کارەکەی خۆیان راپەڕاند و زۆر زوو لە ماڵەکە چوونە دەر. هەواڵەکە زۆر خێرا بڵاو بۆوە. کەس نەما لەو شارەدێیەدا ئەو هەواڵەی نەبیستبێتەوە. ئەفە دیسان هاتەوە ماڵی برادەرە دەوڵەمەندەکەی خۆی. ئەوێ یەکێك بوو لە ئەمنترین و بێ مەترسیترین حەشارگەکانی. هەواڵەکە گەیشتبۆوە جەندرمەکان و ئەوان هەموو رێگاکانیان گرتبوو. هەموو چاوەڕێ بوون چاخێرجالی بێ و بە بەردەمیاندا تێپەڕێ.

سەعید پاشا دیسان لە شاخ بوو، کە هەواڵەکەی بیستەوە. سەربازەکانی کۆ کردەوە و بەرەو ئێرە کەوتە رێ. ئیتر ئەمجارەیان ئارخەیان بوو، چاخێرجالی لەو دەشتەدا دەخاتە داو.

ئەفە سێ رۆژان لە حەشارگەکەیدا مایەوە. ئەوجار هاتە دەرێ و لە سەر رێی خۆی، چەند دەوڵەمەندێکی دیکەشی تالان کرد و خۆی گەیاندەوە شاخ و چۆوە گوندەکەی خۆی. پارەیەکی زۆری تالانی دا بەو گەنج و گوندییانەی سەریان لە سەعیدپاشا شێواندبوو.

چیا تەواو چۆڵ ببوو. یاخیی گەورە و بچووك هەموو تێداچووبوون. دوو یاخی مابوون، لەگەڵ چاخێرجالی کێبڕکێیان بوو. یەکێکیان "کامالی زیبەك" بوو. کامالی زیبەك هیچ لە چاخێرجالی نەدەترسا.

## ******* پاخر *******

ـ حاجی، دەبێ مشوورێك لەو كامالی زیبەكە تووتكە سەگەش بخۆین.
كورەكانی بەدوودا بنێرە.

هەفتەیەك دواتر هەواڵدەرەكە هات. چاخیرجالی هەواڵەكەی وەرگرت و بەرنامە و نەخشەی خۆی بۆ داڕشت. ئەوجار كەوتە ڕێ و چووە سەر حەشارگەكەی كامالی. كامالی زۆر بەخۆی دەنازی و ئامادەی شەڕ بوو، بەڵام چاخیرجالی هەر بە یەكەم فیشەك سەرەنگرێی كرد. پیاوەكانیشی تێداچوون.

چاخیرجالی ئەو خەمەشی نەما. ئێستا ئیتر دەڵی زۆر خۆش بوو و بە ڕوخسارێكی گەشەوە بانگی حاجیی كرد و گوتی:

ـ زۆر ماندووین حاجی. دەبێ زوو ئێرە بەجێ بێڵین. دەبێ ماوەیەكیش پشوو بدەین.

چیاكانیان بڕی و بەرەو دەشتەكەی ئەوبەری چیا داگەڕان. خۆیان گەیاندە دەوروبەری "موغەلا". لەوێش دەوڵەمەندێكیان ڕووت كرد و ژمارەیەك چەركەزیان ـ كە بۆسەیان دانابۆوە ـ كوشت و خێرا چوونە ئاناتالیا. ماوەی پازدە ڕۆژێك لە چیاكانی ئاناتالیا پشوویان دا و ئەوجار گەڕانەوە شوێنەكەی خۆیان و وەك جاری جاران چیاكانی "دایكان و بێش بارماق و بابەچیا و كارینجالی"یان كردەوە بە حەشارگەی خۆیان.





**ئاغای عێلاتییەکان:**

بیستووتە سەعید پاشا دەڵێ چی ئەفە؟ دەگاتە هەر جێیەك، بەخۆی هەڵدەڵێ، و دەڵێ ئەو چاخیرجالییە کابرایەکی ترسنۆکە. دەڵێ ئەو هەمووە کەژ و کێوەی وەدوو کەوتم، تەنانەت بۆ جارێکیش چییە نەیوێرا لەبەرم راوەستێ. دەڵێ چاخیرجالی هەر پیاوی راکردنە. بە تووتووش ناوێرێ بەرەنگارمان بێتەوە. خوا دەکا چاوم پێی دەکەوێ، خودا یان بەمنی دەدا یان بەو.

هەم خۆی ئەم قسانە دەکا و هەم پیاوەکانیشی ئەو قسانە بڵاو دەکنەوە. دەیەوێ سووکت بکا ئەفە. دەیەوێ لەبەر چاوی خەڵکی رەشت بکا.

## ******* یاخی *******

چاخیرجالی کە گوێی لەوە بوو، لە فکرەوە ڕۆچوو. دەبوو باش بیری لێ بکاتەوە. سەعید پاشا کاری وای بۆ دەکرد؟ تۆ بڵێی بیەوێ چاخیرجالی تووڕە بکا؟ هەر بەراستی دەیەویست سووکی بکا؟ لەوانەبوو هەر دووکیان وا بێ.

- حاجی!

- فەرموو ئەفەی من.

- دەبێ ئەو سەعیدپاشایە تەمبێ بکەین.

- چۆن ئەفەم؟

- دەبێ بەرەنگاری ببینەوە.

- زۆر ئەستەمە ئەفە. ئەوە کردەنی نییە. من نایەم. هێندەی مرا و مێروو سەربازی هەیە.

- مەرگ برا گەورەیە حاجی. ئەگەر بەرەنگاری نەبینەوە، ئاخرییەکەی بە شێوەیەکی دیکە دەمرین. دەزانم بەرەنگاربوونەوەی ئەو واتە، بەپیر مەرگەوە چوون، بەڵام ناچارین وا بکەین. خۆشم دەزانم ئەو کارەمان سەدا نەوەد مەترسیی مەرگی پێوەیە.

- ئەگەر سەدا پەنجاش بێ، دیسان من لەگەڵ نیم ئەفە.

- خەنیمەکەمان خەریکە شادەمارمان هەڵدەبڕێ حاجی. خەریکە خەڵکمان لێ سارد دەکاتەوە. لە هەموو لاوە پێمان دەڵێ، ترسنۆکین. لەوانەیە یەك دوو جار بڕوا بە قسەی نەکەن، بەڵام ئاخرییەکەی باوەڕ دەکەن کە ئێمە هەر بەراستی لێی دەترسین.

- من لەگەڵ نیم ئەفە. چیی پێ خۆشە با بیکا. من نایکەم.

## ****** پلخو ******

- حاجی!

- حاجی سەری بەردایەوە.

- خۆت کۆ بکەوە حاجی. قەدری خۆت بگرە. ئەگینا...

یەکەم جار بوو ئەفە ئەوەندە توورە دەبوو. حاجی تێ گەیشت، بەلام بەو حاڵەشەوە بەخۆی گوت:

- ئەوە خۆت و تفەنگچییەکانت. چ دەکەی بکە.

- یانی چی حاجی؟ مەبەستت چییە؟ زوو پێم بڵێ بزانم.

خەریك بوو کار دەگەیشتە جێی باریك. لەوانە بوو، مشتومڕەکە شەڕە تفەنگی لێ بکەوێتەوە. ئەفە توورە بوو. پەنجەی لەسەر پەلەپیتکە بوو.

حاجی لەسەر بەردێك دانیشت. چەکەکەشی لە سەر کۆشی دانا.

- دەڵێی چی؟

قەت نەبووە تفەنگچییەك ئاوا جوابەجەنگێی ئەفەکەی بکا. ئەفەی خۆی بشکێنێتەوە. ئەویش ئەو کەسەی نزیکترین هەڤاڵی ئەفە بوو. لە فەرمانی ئەفە دەرچووبوو و بگرە قەرزباریشی کردبوو. ئەفە بە توورەییەوە بەملا و ئەولادا دەڕۆیشت و بەخۆی دەگوت:"بڵێم چی؟ بڵێم چی؟ بۆخۆشی نەیدەزانی بۆچی ئەملاوئەولای دەکرد. لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد. لەپڕ بڕیاری خۆی دا. قەڵافەتی گۆڕابوو. دەموچاوی وەك بەرد وشك و بێجووڵە بوو. هات و بەسەر حاجییەوە ڕاوەستا.

حاجی سەری هەڵێنا و سەیری ڕوخساری ئەفەی کرد. ئەفە دەتگوت ڕەوەزە بەردێکی قایمە. ترووسکاییەکی تایبەت لە چاویدا بوو. یەکلایی ببۆوە. ئەگەر

******* یلخو *******

خێرا نەجوولابایەوە، لەوانەبوو بەلای لێ بباری. هەستا و دوو هەنگاو بەرەو ئەفە رۆیشت:

ـ خۆت سەخلەت مەکە ئەفە. کەرێتیم کرد. بمبوورە. لە پڕ نەمزانی دەڵێم چی. ئەگەر راستیت دەوێ، زۆر لەو قەرە سەعیدە ترسابووم.

ئەوجار چەکەکەی بە هەر دوو دەستان فڕێ دایە بە پێی ئەفە. چاخبرجالی داهاتەوە و تفەنگەکەی هەڵگرتەوە و دیسان دایەوە بە حاجی:

ـ تۆش نارەحەت مەبە حاجی. چ بکەین یاخیگەرییە ئیتر. ئەگەر براشت بێ دیسانیش...

حاجی زەردەیەکی هاتێ.

شیوی کۆشکەکە رەوەز و زەرد و ما بوو. بزنی پێ هەڵنەدەگەڕا. کەوتووەتە شوێنێك دەست پێی رانەگا. رووبارێکی برێك گەورەی بە نێوەڕاستەکەیدا دەڕوا. ئاوەکە زۆر خوڕە. گابەردی زل زل رێگای هاتوچۆیان گرتووە. تەنانەت باڵندەش ناتوانێ بەسەریدا بفڕێ و ماریش ناتوانێ پێیدا بخوشێ. بەڵێ بەردەڵێنێکی سەخت و رژد.

رۆژێکیان، کاتی تاوهەلات هاتنەوە شیوەکۆشك. چوونە ماڵێك. حەشارگەیان بوو. خاوەن ماڵ برادەریان بوو. ماڵەکە پشتی بە زەرد و رەوەزانەوە بوو. رووبارەکەش بە بەرەوەیدا دەڕۆیشت. نێوەڕاستی شیوەکە پڕ بوو لە گابەردی گەورە گەورە. ئاو لە دەوروپشتی گابەردەکانەوە رێگای خۆی کردبۆوە. ئاوەکە کەفی دەکرد و هاژەی دەهات.

ـ جا ئێستا ئەگەر لێشی راسپێرین، سەعید پاشا بڕوا ناکا.

ـ چ بکەین؟

## ******* يلخو *******

- تێکهەڵچوونێك...

- ئەگەر وایە، با چەند کەسێك بنێرین.

هەر ئەو شەوە هەڵیانکوتایە سەر گوندێك و هەواڵیان بۆ سەعید پاشا نارد:

- ئەوە پیاوەکانی چاخیرجالی بوون پەلاماری ئەو گوندەیان دا و ئێستاش چوونەتە شیوەکۆشك.

لەبەردەم ئەو ماڵەی تێیدا حەوابوونەوە، سوارێك راوەستا. گورجوگۆڵ لە ئەسپەکەی دابەزی. ئەسپەکەی زۆر ماندوو بوو. شەلاڵی ئارەقە بوو. سوارە زۆر بەپەلە بوو.

- زوو بمبەنە لای ئەفە.

بردیان.

- ئەفەم، ئەفەی من. سەعید پاشا. خۆ دەیناسی سەعید پاشا. هەر ئەو سەعید پاشایە هەموو فەوجەکەی خستووەتە رێ و بەرەو ئێرە دێ. هەرد و بۆ پڕ لە سەرباز. سەتید پاشا... هەر ئەو سەعید پاشایە... تووشی هەر کەس دەبێ، تێی هەڵدەدا. بێ راوەستا لێ دەدا.

چاخیرجالی بە کەیف بوو. زەردەی دەهاتێ. هەر ئەوەندە سەری لەقاند، واتە تێگەیشتم، بەلام حاجی مستەفا زراوی چووبوو. رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو... بە هەموو رق و قینی خۆی، بە غرووره شکاوەکەیەوە، بە هەموو بەرزەفڕی و زێدەخوازییەکانی حەزی لاوێتییەوە و بە هۆردووە زنۆر و زوەندەکەیەوە وا دێ. پاشای عوسمانی خەریکە دێ. لەگەڵ سەربازە لەژمار نەهاتووەکانی. سێ چوار پیاو لە هەمبەر لەشکرێك سەربازدا. زۆر شێتانەیە... تاقە رێگەچارە، راکردنە. ئەگینا دەیگیرێی، بەلام

******* یلخو *******

راناکا. هەر لێرە، لەو ماڵەدا دەگیرێن. رەهێڵەی فیشەکیان بەسەردا دەبارێ. دابێژدابێژ دەکرێن. دەبێ شتێك بگوترێ. دەبێ فکری ئەو ئەفەیە بگۆڕدرێ، بەڵام ئەفە هەر پێدەکەنی. گاڵتە لە روخساریدا شەپۆلی دەدا. حاجی نەیوێرا هیچ بڵێ.

هەواڵدەرێکی دیکەش هات:

- سەربازەکان وا دێنە نێو دێ.

حاجی مستەفا حەجمینی نەما. دیسان ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد، بەڵام نەیتوانی هیچ بڵێ. دەیزانی هەر قسە بکا، ئەفە فیشەکێکی پێوە دەنێ. کە چاخیرجالی ئاوا زەردەیەکی دێتێ، دیارە دەیەوێ کارێکی بێ بەزەییانە بکا.

حاجی لەبەرخۆیەوە گوتی:

- ئێمەش هەر دەبێ ئاوا بمرین. بەشی ئێمە ئەوە بوو، چار نییە. لە دەست چارەنووس رزگار نابی...

تەقەکە زۆر زوو دەستی پێ کرد. هێشتا تاریکدا نەهاتبوو. یەکەم تەقە چاخیرجالی کرد. ئەویش کاتێك هێشتا دوژمن نەگەیشتبوونە بەر سێرەیان. دەیەویست پێیان بڵێ لە کوێن.

بەڵام باشە بۆچی ئەو هەمووە سەربازە؟ چۆن توانیبووی ئەو هەمووە بنیادەمە بێنێتە ئێرە. چاخیرجالی چاوەڕوانی سەرباز بوو، بەڵام قەت پێی وانەبوو ئەوەندە بن. لەپڕ سەری لێ شێوا، بەڵام زۆر زوو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. باشە ئێستا چۆن را بکەن؟ خۆ دەرزی هەڵاوێی، لەبەر ئەو حەشیمەتە، وەعەرزی ناکەوێ. سەرباز هەموو وڵاتیان گەمارۆ داوە. راکردن مەحاڵە.

## ******* پلخی *******

فیشەك وەك ڕێژنـەی بـاران دێ. سـەربازەكانی قەرەسـەعید پاشـا، خـەریكن ماڵەكە ئاگرباران دەكەن. ئەو چەند كەسەی چـاخێرجالی ڕەوە سـەربازە بـێ ئەژمارەكەی سەعید پاشایان لە جێی خۆیان چەقاندووە. ناهێڵن یەك هـەنگاو چییە، بێنـە پێشـێ. لـە سـێ چـوار هـەزار سـەرباز، تەنانـەت یـەك كەسـیش ناتوانێ بێتە پێشێ. لەوانەیە لە مێژوودا ئەوە یەكەم جـاری بـێ دوو دەسـتە ئاوا بەرەنگاری یەكتر ببنەوە. هەر تفەنگچییەك، لە بەر نزیك هەزار سـەربازدا وێستاوە. جا سەیرتر ئەوەیە، كەمینەكە، تەنگی بە زۆرینە هەڵچنیوە.

چاخێرجالی و پیاوەكانی ئارەقە لەبەری پێیان دەچۆڕێتەوە. بۆ سـاتێكیش چییە ئۆقرەیان نییە. بێ پسانەوە تەقە دەكەن. وەك شێتان شـەڕ دەكـەن و زوو زوو تفەنگە سوورەوەبووەكانیان دەگۆڕنەوە.

قەرەسـەعید پاشـا، چـاخێرجالیی خسـتووەتە نێـو لـەپی دەسـتییەوە. هـەر بەراسـتی كەوتووەتـە بـەری دەسـتی. ئەگـەر بتـوانێ دەسـتی وێـك بـێنێ، چاخێرجالی لەناو دەبا.

جارێكی دیكەش لە خۆشییان نەیزانی چ بكا و هەر ئەو شەوە تەلـەگراف نـارد بۆ ئەزمیر و ئەستەمبۆڵ و چەند جێی دیكەش. هەموو بەپرسانی مەملەكـەتی لـە گەمارۆدانەكـەی چـاخێرجالی ئاگـادار كـردەوە. پاشـا لەخۆبابیەكـەی عوسمانی زۆر خۆشحاڵ بوو. ئاخرییەكەی پاڵەوانەكەی كوێستان و كێوپارەی لە داو خستبوو.

چاخێرجالی نەیدەتوانی گەمارۆكە بشكێنێ. ئەوە مـەحاڵ بـوو. سـەربازەكان بە چەند ڕیز ماڵەكەیان گەمارۆ دابوو. لەوانەیە پەنجا ڕیـز دەبـوون و سـەعید پاشا بەبێ ترس سەراسۆی هەموو لایەكی دەكـرد و چـاوێكی كردبـووە چـوار

چاو، نەکا کلێنێك دروست بێ. لێی سوور بوو، باڵندەش لەو گەمارۆیە قوتار نابێ.

دەموچاوە خروێکاوی و ناشیرنەکەی حاجی مستەفا سات بە سات رەشتر داگەڕا و ناشیرنتر دەبوو. لەبەر تیشکە کزەکەی چراکە، رەنگی مردووانی لێ نیشتبوو. دەتگوت خۆڵی مردوویان بەسەردا کردووە، بەڵام بێدەنگ نەبوو. تەقەی لە هەموو لایەك دەکرد. گەمارۆدراوەکان دەتگوت تەنیا چەند یاخییەك نین، بگرە لە هەمبەر سوپا بێ ئەژمارەکەی سەعید پاشادا دەتگوت سوپایەکن.

هەم سەعید پاشا و هەمیش چاخیرجالی باش دەیانزانی، ئەو شەڕە لە رۆژێك پتر ناخایەنی. تفەنگچییەکان زۆر زۆریش خۆیان راگرتبایە، لەوانەبوو رۆژێك خۆ راگرن. ئەی دوایی؟ دواییش دیار بوو. یان دەبوو خۆ بەدەستەوە بدەن، یان خۆ بکوژن. سەعید پاشا بە بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی بڕیاری چاخیرجالی بوو. ئیتر ئێستا حاڵەتێکی گەپچاڕانەی بێ بەزەییانە لە رواڵەتی چاخیرجالیدا شەپۆلی دەدا. لەوەتەی شەڕەکەی دەستی پێ کردبوو، تاقە قسەیەکیشی نەکردبوو. کە دەیویست کارێکی گەورە بکا، یان بڕیارێك بدا، کپ و کڕ دەبوو، بەڵام ئێستا جۆرێکی دیکە بوو. دەتگوت ملی بۆ مەرگ دانواندووە. خەریکە گاڵتە بە مردن دەکا.

شەوگار شەق ببوو. ئەفە لەپڕ گەڕاوە و بەرەو لای حاجی چوو. حاڵەتەکەی پێشووی روخساری گۆڕابوو. ئێستا رواڵەتێکی تەواو شێلگیری هەبوو. دیسان وەك بەردێك توند و قایم بوو.

- بانگی خاوەن ماڵ بکەن.

## ******* یلخی *******

له خوارەوه دەنگێك وەڵامی دایەوه:

ـ لێرەم ئەفه.

ـ وەره بزانم. خێرا ده جەواڵم بۆ بێنه. هەتانه؟

ـ هەمه ئەفه. هەمه.

ـ حاجی زوو بە دوو تفەنگچی بنێرە با بچنه دەرێ و هەندێ بەرد خڕ بکەنەوه و بیهێنن.

حاجی گیانێکی وەبەر هاتەوه. روخساره پڕ لە قین و تووڕەیی و مەرگ لێنیشتووەکەی، تۆزێك گەش بۆوه. دەتگوت تروسکەی هیوایەك لە دوورەوه دەیاره.

ـ با هەر بەرد لە جەواڵەکان نەکەین ئەفه. هەندێ بەردی تێدەکەین و ئەوی دیکەشی پڕ دەکەین لە خوری و لێفه و دۆشەگ و شتی دی. ئەو کات لە خوارەیوه وا شڵپەی دێ، هەمووان پێیان وادەبێ بنیادەم بەربۆوه:

زۆری نەبرد، جەواڵەکانیان پڕ کرد و لە تەنیشت یەکتریان دانان.

ئەفه:

ـ بەر لەوەی یەکەم جەواڵ پڕ بکەن، رووی تفەنگەکانتان بکەنە شیوەکه و بێ پسانەوه وێکڕا تەقه بکەن. دەبێ وا بنوێنین، یەکێك خەریکە خۆی بە رووبارەکەدا دەدا و ئەوانی دیکه تەقەی لێ دەکەن. هەموو چەکەکان وێکڕا تەقەیان لە ئاوی نێو شیوەکە دەکرد. سەعید پاشا و جەندرمەکانی هۆشیان چووه سەر ئەوێ. بەخۆیان گوت:

ـ ئەو کابرایە شێت بووه. ئەو هەمووە سەربازەی بەلاوه ناوه و تەقە لە ئاوەکە دەکا.

## ******* پاخر *******

بەڵام زۆری نەبرد، تێگەیشتن بۆ وا دەکا. شتێك لە پەنجەرەکەوە دەرپەڕی و کەوتە نێو ئاوەکەوە. شتێکی دیکەش وەك ئەوی پێشوو لە پەنجەرەکەوە خۆی فڕێ دایە نێو ئاوەکە. تەقە لەسەر یەك دەستی پێ کرد. لەوانەیە پتر لە هەزار فیشەکیان بەو دوو شتەوە نابێ. هەر چارەگە سەعاتێك ئەو رووداوە دووپاتە دەبۆوە. کە پێنجەمین جەواڵ فڕێ درا، ئیتر هەموو سەربازەکانی سەعید پاشا هاتبوونە دەم ئاوەکە. بازنەی گەمارۆکە درزی تێکەوتبوو. تاوێك دواتر پێنج جەواڵی دیکەش فڕێ درانە نێو ئاوەکەوە. دوای هەر جەواڵێکیش، رەهێڵەی فیشەك دەباری و جەواڵەکان کون کون دەکران.

چاخیرجالی و برادەرەکانی زۆر سووك و سانا توانییان بازنەی گەمارۆکە بشکێنن و دەرچن. خاوەن ماڵیشیان لەگەڵدا بوو. کەوتنە رێ و رۆیشتن. خاوەن ماڵیشیان برد، بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەست سەعید پاشا.

سەعید پاشا و سەربازەکانی، لە تاریکایی شەوەکەدا، جەواڵەکانیان دایە بەر رەهێڵەی ئاگرە بێ ئامانەکەیان.

رۆژ بۆوە. سەعید پاشا بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، خۆیان گەیاندە سەر کوژراوەکان، بەڵام کە سەیری کردن، دە جەواڵی دیت لەملاوە کەوتبوون و دابێژرابوون، وەك شێتانی لێ هات. ئەوە چەندەمین جاری بوو، چاخیرجالی دەیخەڵەتاند.

چاخیرجالی و هاوڕێکانی ساغ و سەلامەت گەیشتنە بابادایی. کە تەواو حەسانەوە، چاخیرجالی ئەمری کرد:

- قەڵەم و کاغەزێکم بۆ دێنن. دەبێ نامەیەکی تێروتەسەل بۆ سەعیدپاشا بنووسم.

## ******* پاخر *******

جا نووسیی:

بەڕێز جەنابی "کالدان دەرەلی" ناسراو بە خاوەنشکۆ قەرەسەعید پاشا.

لە پێشدا سڵاوێکی گەرموگوڕ، هیوادارم زۆر باش و بێوەی بی. دوایش دەمەویست عەرزت بکەم، پیاوی ژیر جارێك لە کونێکەوە مار پێوەی دەدا، بەڵام جەنابت سەد جاری پێوە دای. زۆر جاران لە شوێنان دانیشتووی و قسەت بە من گوتووە. فەرمووتانە چاخیرجالی ترسنۆکە و ناوێرێ بەرەنگارم بێتەوە، بەڵام خۆ دیتت چۆن وێرام و بەرەنگاریشت بوومەوە. ئەگەر پێویست بوو لە داهاتوودا دیسانیش تووشی یەکتر دەبینەوە. نیگەرانی ئەوە مەبە و خەمی لێ مەخۆ. تۆم خۆش دەوێ پاشا. من ئەوە لە باباداغیم. ئیتر لەوێ جەوالی لێ نییە. لەوێ منی لێم و من دەبینی، بەڵام تکایەکی دیکەم لێت هەیە پاشا. ئەو قاچاخچییە داماوانە و ئەو چەتە و دز و یاخییە بچووکانە لەبری چاخیرجالی مەکوژن. بەزەییم پێیاندا دێتەوە.

دیسان ڕێز و سڵاوم هەیە پاشا.

چاخیرجالی مەمەد ئەفە.

پاشا کە نامەکەی خوێندەوە، لە دین دەهەری بوو. نەیدەزانی چ بکا. نامەهێنەرەکەی بانگ کرد. شوانێکی داماو بوو کە ئاگای لە مەحموودی بێزەوادیش نەبوو.





لێره ناچارین تۆزێ بگەڕێینەوه دواوه. بۆ پێنجەمین یان شەشەمین ساڵی یاخیگەرییەکەی ئەفە. خۆ لە پێشدا ئاگادار بووین کە هەندێ شت پاڵیان بە چاخیرجالیەوە نا روو بکاتە شاخ. هەر ئەو شتانەش تا دوا هەناسە بەرۆکیان هەر بەرنەدا. چاخیرجالی قەت پێی خۆش نەبوو تفەنگ هەلگرێ و بچێتە شاخ.

دەرەبەگی ئەو سەردەمی، هەر گەنجێکیان چاونەترس و هەژار و توندوتۆڵیان دیتبایە، ئیتر گەنجە ماڵوێران دەبوو. هەرچۆنێك بوایە یان ناچاریان دەکرد یەکێك بکوژێ و بگیرێ، یان بەرنامەیەکیان بۆ دادەڕشت تا کابرا ناچار بێ تفەنگ هەلگرێ و بچێتە شاخ و ببێتە ئەفە. دەرەبەگ ناچار بوون وا بکەن. هەر کامەیان یەك، یان چەند ئەفەیەکیان لە چیا هەبوو، بۆ ئەوەی لە کاتی

پێویستدا کەلکیان لێ وەرگن. دەرەبەگایەتی بەبێ ئەفە، وەك سەربازی بێ چەك وابوو.

لە سەرەتای بەسەرهاتەکەماندا دیتمان، هەندێ رووداو چاخێرجالییان یاخی کرد. گروپان حەسەن ناچاری کرد. ئاغاکان ناچاریان کرد. بۆ وێنە خەلیل ئاغا و چەند ئاغای دیکە، کە ناویان نازانین و چەند بەگیش. ئەوانە دۆستی بوون و شووتیان دابووە بن هەنگڵی. یەکێك لەوانەی بەو پێناوەدا زۆری دەستی چاخێرجالی گرتبوو و چەند حەشارگەی بۆ دروست کردبوو، تۆفیق بەگ بوو.

تۆفیق بەگ چەند حەمام و کاروانسەرای لە ئالاشار و دەوروبەری هەبوو. دیارە یەکێکیش بوو لە گەورە ملکدارەکانی ئەو دەوروبەرەش. لە نەوەی "دەرەبەگە" گەورەکانی ئەو ناوچەیە بوو. کابرایەکی زۆر لەخۆبایی بوو.

کە لەسەر مەسەلەی زەوی و زار لەگەڵ یەکێك دەمەقرە و کێشەی دەبوو، یەکەم قسەی ئەوە بوو:

- پەلە مەکەن با بەچاخێرجالی بڵێم. جا هەر بەراست واشی دەکرد. جا چاخێرجالی دەهات و مشووری دوژمنەکانی دەخوارد. هەر کەس لە ناوچەی ئالاشار کێشەی لەگەڵ تۆفیق بەگ بوایە، لە راستیدا بەرۆکی چاخێرجالیی گرتبوو. لە لایەکی دیکەشەوە، تۆفیق بەگیش یەکێك بوو لە گەورەترین پشتیوانەکانی چاخێرجالی. هەموو کارێکی بۆ دەکرد. ئەو رۆژانەی کێشەیەکی دەبوو، بەهانایەوە دەچوو و بەردەوام هەواڵی نوێ و پارەی زۆری بۆ دەنارد.

## ******* پلخر *******

پێنجەمین یان شەشەمین ساڵی یاخیگەریی چاخیرجالییە. تۆفیق بەگ چەند جاران پێویستیی بە چاخیرجالی دەبێ. چەند جاران بانگی دەکا و چاخیرجالی دەچێ و گرێپووچکەی بۆ دەکاتەوە. ئێستاش ئەوە تەنگانەیەکە و تۆفیق بەگ حەوجێی بە چاخیرجالییە و داوای یارمەتیی لێ کردووە. ئەمجارەش دەیەوێ ئەرکێکی بخاتە ئەستۆی. ئەرکێکی وەك ئەرکەکانی پێشووی:

ـ کێشەی زەوی و زارمان هەیە ئەفە. لەگەڵ کوڕە مامەکەم لێمان بووەتە کێشە. چیی دەیهێنم و دەیبەم قسەم وەرناگرێ. وەرە و ئەو کوڕە مامەم بکوژە ئەفە. جا چیت بوێ دەتدەمێ. تەنانەت دەڵێی، بەشی کوڕە مامەکەمت دەدەمێ. هەر ئەوەندە بیکوژە، ئەویتری لە ئەستۆی خۆم.

ئەفە بێدەنگ رادەوەستێ. قسە ناکا. ماوەیەکی زۆر سەری دادەخا. ئەوجار لە تۆفیق بەگ دەچێتە پێشێ و بەهەموو تینی خۆی شەپلاخەیەکی لێ دەدا. تۆفیق بەگ بەو زللەیە دەکەوێ.

ـ زوو بە حاجی، ئەو کافرە بێ دایك و بابە بکوژە. ئەو ژن حیزە. تا کەنگێ دەیانەوێ چاخیرجالی بکەنە دارەدەستی خۆیان. تا کەی بە منداڵم دەزانێ.

حاجی خۆی دەگەیەنێتە ئەفە. دەستی دەگرێ و دەیباتە لاوە:

ـ لێی خۆش بە ئەفەی من. تۆفیق بەگ دۆستی خۆمانە.

ئەفە خدەیەکی تایبەتی هەبوو. هەرگیز دەستی نەدەچووە خوێنی دۆست و هاوڕێیەکی. مەگەر ئەوەی خەیانەتێکی گەورەی کردبێ. هەر بۆیە لە تۆفیق بەگ خۆش بوو.

## ******* پاشخ *******

دوای ئەو رووداوە بوو، کە چاخیرجالی هەر بەراستی بوو بەو چاخیرجالییە.
دوای ئەو رووداوە، چاخیرجالی بوو بە دوژمنی ئاغا و دەرەبەگان. ئیتر نەبوو بە دارەدەستیان. هیچ کام لە ئاغا و دەرەبەگەکانیش نەیانتوانی کەڵکی خراپی لێ وەرگرن. جا ئەوجار نۆرەی چاخیرجالی بوو ئەوان بخاتە خزمەتی خۆیەوە. بوو بە بەڵای سەریان. باجی لێ وەرگرتن. تاڵانی کردن. زەوی و زارەکەی لێ ئەستاندن و بە سەر وەرزێراندا دابەشی کردن. پارەی لێ ئەستاندن و جیازی بووکان و داوودەرمانی نەخۆشانی پێ کڕی. دوای ئەوە بوو، کە چاخیرجالی وای لێ هات شیاوی ئەوە بێ، خۆی بە کوڕی ئەحمەد ئەفە بزانێ. بوو بە دوژمنی خەیانەتکەران. بوو بە پشت و پەنای خەڵك و دوژمنی دەربار. ئەو کاتە بوو کە خەڵکی ناسی و بەرەنگاری ئیمپراتۆرێکی مەزن بۆوە. تێگەیشت کە ئەو ئەفانەی دەبنە دارەدەستی ئاغاکان، زۆر زۆر لە بەگ و پاشاکان خراپترن. هەتا دوا هەناسەشی لەسەر باوەڕی خۆی سوور بوو. پیاوانە لەسەر ئیمانی خۆی راوەستا و ئیتر دەستی بۆ هیچ خەیانەت و نامەردییەك نەبرد. خەڵکیش خۆشیان دەویست و بە هەر نرخێك بوایە، پشتیان دەگرت. تەنانەت سەریشیان تێدا چووبایە.
جاری وابوو تووشی شەڕێکی قورس دەبوو. چاخیرجالی گەمارۆ دەدرا. هەر بەراستی تەنگاو دەکرا. نیوەی گەمارۆدەرەکان ئەو جەندرمانە بوون کە مووچەیان لە عوسمانی وەردەگرت، بەڵام نیوەکەی دیکەیان، لەوانەیە زۆربەشیان سەرباز بوون. چاخیرجالی شەڕی دەکرد، بەڵام زۆر ئاگای لێ بوو تەقە لە هیچ سەربازێك نەکا. دەکرێ بڵێی، سەرەڕای ئەو هەمووە شەڕ و راکردنە، تەنانەت لووتی سەربازێکیش چییە لەخوێن نەهاتبوو. تەنیا جار و

## ******* پاخو *******

بارەیەك سەربازێك تووشی ڕووداوێكی چاوەڕواننەكراو ببوو یان مارێك پێوەی دابوو. سەربازەكانیش چاخێرجالییان باش دەناسی و هەمیشە لەسەر هەست بوون نەكا زیانێك لە ئەفەی خۆیان بدەن.





سمایل ئەفە، یەکێك لە دوژمنە هەرە بچووکەکانی چاخیرجالییە. ئەفە پێی وایە تۆفیق بەگ نێوبژیوانیی نێوان حکومەت و سمایل ئەفەی کردووە و ئەوی سووك کردووە. ئەو تۆفیق بەگە بۆ وا دەکا؟ ئەفە کەوتەوە بیر مەسەلەی توقات. دوای رووداوەکەی تۆقات، تۆفیق بەگ ببوو بە دۆستی سمایل ئەفە. جا پێی خۆش بایە هەر کەس بکوژێ، بە سمایلی دەکوشت.

یانی ئاوا تۆفیق بەگ. زۆر باشە بمێنێ. ئەفە لە چیا دێتە خوارێ. بەرەو ئالاشار. بێ راوەستان چوونە ماڵی تۆفیق بەگ، بەڵام کە گەیشتنێ، سەیریان کرد کەس لە ماڵێ نییە. کەس لە ماڵ نەبوو. لێرە تۆفیق بەگ و سەعید پاشا لێك هەڵبەزیبوونەوە، هەر بۆیە تۆفیق بەگ خۆی شاردبۆوە. ئەو خۆشاردنەوەیەی باشی بۆ تەواو بوو. چونکە چاخیرجالی هاتبوو بیکوژێ.

## ******* یاخو *******

لەو کاتەدا هەواڵێکی تازەیان هێنا: سمایل ئەفە بەتاقی تەنێ لەماڵەکەی خۆی دانیشتووە. چاخێرجالی هەر ئەوەی بیست، بەبێ تۆسقاڵێ حەسانەوە، بەرەو گوندەکەی سمایل ئەفە کەوتە رێ. خەڵکی ئاسایی ئەو رێیە بە پێنج سەعات دەبڕن، کەچی ئەفە و هەڤاڵەکانی بە سێ سەعات بڕییان.

وەك دەڵێن یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی چاخێرجالی ئەو گورجوگۆڵی و توندوتۆڵییە بووە. ئەو کارەی ئەو، هەموو کەسی بەسەهوو دەبرد. گەورەترین تایبەتمەندیی یاخییەك، ئەوەیە دەبێ گورج و گۆڵ بێ لە رێگەبڕین. ئەمڕۆ دەبینی چاخێرجالی لە چیای باباداغییە. سبەی لەپڕ دەبینی هەر ئەو کابرایە بەخۆی و پیاوەکانییەوە، خۆی گەیاندووەتە دەشتی بەرکاما. ئەو توندوتۆڵبوونە، ئەو خۆشبەزی و تەردەستییەی لە تاقەتی ئینسان دا نییە، لەکوێیان هێنابوو؟ بەرهەمی خۆڕاهێنانی بەردەوام و زۆر بوو. هەرکام لەوانە چەند ساڵان چاچاخچێتی و یاخیگەرییان کردبوو. جا چونکە زۆربەشیان منداڵی بنەماڵە وەرزێرە هەژارەکان بوون، لە منداڵییەوە شوانی و گاوانییان کردبوو و هەر لەو کاتەوە گورجوگۆڵ گەورە ببوون. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەوانە هەر ناچاریش بوون ئاوا خێرا رێگە ببڕن. دەشزانین حەوجێبوون و ناچاری وا لە بنیادەم دەکەن فێری هەموو شتێك بێ. ئەوەندە خوویان گرتبوو بە راکردن لە چیا و تەق تەقەکاندا، عێلاتییەکان پێیان دەگوتن "تفەنگچیی با". هەر کات بەر لێبوردەییش دەکەوتن و لە چیا دەهاتنە خوارێ، دیشان چاخێرجالی دەستی لێ هەڵنەدەگرتن. هەموو رۆژێ ناچاری دەکردن، تەمرینی نیشانەداکردن و تەقە بکەن.

## ******* پاخر *******

ماڵەکەی سمایل ئەفەیان گەمارۆ دا. بوو بە تەقە. سمایل ئەفە بەتەنیٚ لە ماڵەوە بوو. شەڕەکە کەوچکی تێنەدەگەڕا. سمایل زۆر ڕەشید بوو. گەنج بوو. لەوانە نەبوو، خۆی بدزێتەوە و لەبەر دوژمن هەڵیٚ. دوو سیٚ سەعاتێك لە بەر یەك ڕاوەستان و شەڕیان کرد. سمایل ئەفە نەیدەهێشت چاخیرجالی تەنانەت هەنگاوێکیش لە ماڵەکەی بچێتە پێش. هەر ئاوا هەشت سەعاتی ڕەبەق شەڕیان کرد. چاخیرجالی زانیی ئاوا هیچی بۆ ناچێتە سەر. یەکێك لە تفەنگچییەکانی ناردە سەری و خۆی بە تەقەی بیٚ پسانەوە سەری سمایل ئەفەی خافڵاند. تفەنگچییەکە بە پشتیوانیی چاخیرجالی خۆی گەیاندە ماڵەکە و ئاگری دا. ماڵەکە سووتا. چاخیرجالی پەنجەی لەسەر پەلەپیتکە و چاوی لە دەرگاکە بڕیبوو. چاوەڕیٚ بوو سمایل ئەفە بێتە دەریٚ. ماڵەکە سووتا و بوو بە خۆڵەمێش، بەڵام کەس نەهاتە دەریٚ.

چاخیرجالی خۆی پیٚ نەگیرا. وەك لافاو فرمێسکی هەڵڕشت. ئەوە دووەم جاری بوو وا بەکوڵ دەگریا. بە گریانەوە گوتی:

ـ حەیف بوو. سمایل ئەفە حەیف بوو. خۆزگە لە هەوەڵەوە زانیبام ئەوەندە ڕەشیدە. حەیف بۆ ئەو هەمووە مەردئازایەتیەی.





کامیل پاشا بانگی سەعید پاشای کرد:

- باس و خەبەر چییە پاش؟ کاروبارەکان چۆن دەچنە پێش؟

- هێشتا هەر بەردەوامە پاشا.

- ئەوە دەبێ تاکەی هەر بەردەوام بێ؟ ئەی کەنگێن دەبڕێتەوە؟

- دیار نییە پاشا. خەنیمەکەمان شەیتانێکی راستەقینەیە، بەڵام هەر بەم زووانە بە گوێ دەیگرم.

کامیل پاشا قیت بۆوە و بەپێی خووخدەی هەمیشەیی خۆی نەڕاندی:

- ئەوەندەی لێ مەڵێ پاشا. خێرا بە دوو قسە پێم بڵێ بزانم بە چەند رۆژی دیکە دەتوانی چاخیرجالی بگری؟ هەر ئەوەندە بڵێ.

- دیار نییە پاشا. لەوانەیە بە رۆژێك و لەوانەشە بە ساڵێك.

## ******* پلخو *******

ـ دەتوانن لە مانگی داهاتوودا بیگرن و بیهێنن؟

ـ ناتوانم پاشا.

ـ کەواتە داوای لێ دەکەم لە چیا بێتە خوارێ و لێی خۆش دەبین.

سەعید پاشا مات بوو. وەك ئەوی بە کوتکت لە سەریت دابێ. لە داخان لێوی خۆی دەکرۆشت. پاڵەوانە گەورەکەی عوسمانی، ئەوەی راپەرینە مەزنەکەی ئەلبانیای سەرکوت کردبوو، ئێستا چۆن دەیتوانی بڵێ بەزیوم؟ ئەوە دووەم جاری بوو، لە هەمبەر یاخییەکدا سەری شۆڕ دەکرد. چۆن پێی قەبووڵ دەکرا؟

هەفتەیەك دواتر چاخیرجالی و تفەنگچییەکانی سواری ئەسپ دەبن و لەخۆباییانە لە چیا دێنە خوارێ. ئەمجارەیان مەرجی زۆر قورستری داناوە. ئەو مەرجانە بۆ حکوومەت حەیاچوونن.

چاخیرجالی ماندوو بووە. ئەگەر بنیادەم بە عەشقەوە کارێك بکا، کارەکەی زۆر زۆریش قورس بێ، دیسان هەر لێی ماندوو نابێ. قەت نەیویستبوو کەس تالان بکا یان بیکوژێ. ناچاریان کردبوو. چاخیرجالی پێی وابوو تاوانی ئەو هەموو کوشتار و تالانە لە ئەستۆی ئەودا نییە. تاوانی ئەو کەسانە بوو کە ئەویان ناچار کردبوو وا بکا، بەڵام کێ ناچاری کردبوو؟ ئاخۆ پادشا ناچاری کردبوو؟ ئاخۆ خەتای میللەت بوو؟

هەرچۆنێك بێ، خەتای ئەوان بوو. جا فەرقی نەبوو، کامیان پتر تاوانبارن. ئەو هەر خۆی بەبێ تاوان دەزانی. ئەو دڵێکی پاکی هەبوو. رێك وەك دڵی منداڵێکی حەوت ساڵانە. چما تا ئێستا ناهەقیی لەکەس کردبوو؟ کێی کوشتبوو؟ گروبان حەسەن و زاڵمەکانی دی. ئەوانەی ناهەقییان لە خەڵکی

دەکرد. چەرکەز و ئەلبانیاییەکان. هەر ئەوانە خۆیان بە پادشا فرۆشتبوو و ژیانیان لە خەڵك کردبووە دۆزەخ. ئەو جەندرمانەی بۆ چەند قرۆشە دراوێك ببوونە کاربەدەستی دەوڵەت و بەڵای گیانی گوندییە لێقەوماوەکان. ئەو ئاغا و بەگانەی خوێنی وەرزێرەکانیان دەمشت. جگە لەوانە کێی دیکەی کوشتبوو؟ ئەوانەی شەو و رۆژ بە شوێنییەوە بوون بیکوژن؟ باشە مافی ئەوەی نەبوو بەرگری لە خۆی بکا؟ چاخیرجالی شەو و رۆژ بیری لەوە دەکردەوە. بیری دەکردەوە و دەیدی تەواو هەقێتی. جا بڕیاری دەدا، کارەکانی رابردووی دووبارە نەکاتەوە و ژیانێکی بێ چەرمەسەری بۆ خۆی و خێزانەکەی دابین بکا. ئیتر حەساوەتەوە و ئیشەڵا هیچ رووداوێکی چاوەڕواننەکراوی بۆ نایەتە پێش.

***

ئەفە لە ئایاسۆرات و کایاکۆی وەدەر نەدەکەوت. لە زەوی و زارەکەیدا کە بەنیوەچڵی بەجێی هێشتبوو، خەریکی کارە. . دەبێ دایچێنێ... دەبێ فڵانە شت لەو فیسارە جێ دروست بکرێ. هەتا ئێوارە هەر ئەمری دەکرد و رێوشوێنی پێشان دەدان. بە مەزراکەیدا دەگەڕا. نوێژی دەکرد و چەند لە دەستی هاتبایە دەستی هەژارانی دەگرت. لە ژنەچکۆڵەکەی کچێکی هەبوو. هەڵۆ لەخۆباییەکەی کوێستان، ئێستا چێژی لە باوکایەتیی خۆی وەردەگرت و چەند سەعاتان لەگەڵ منداڵەکەی گەمەی دەکرد و سەری خۆی دەخافڵاند. لەبیری چووبۆوە.

هەر لەبیریشی نەمابوو. ئەو ئەلبانیاییانەی بە زیندوویی ئاگری دابوون، ئەو ژنەی سەری بڕیبوو، پۆسلۆئۆغڵی، سمایل ئەفە، چیاکان و یاخیگەری و

## ******* پاشخو *******

بەکورتی هەموو شتێکی لەبیر چووبۆوە. تەنانەت بۆ جارێکیش بە زەینیدا نەدەهات بیر لەو شتانە بکاتەوە. بەلای تفەنگدا هەر نەدەچوو. دەمانچەیەکی لە قەدی دەدا، بەڵام قەت سەیری دەراغ (مەخزەن)ەکەی نەدەکرد. وا راهاتبوو دەمانچەکە لە قەدی بدا، وەك چۆن عادەتی گرتبوو پانتۆڵ لەپێ بکا.

چەند مانگان تێپەڕین. مەزرا و مندالّ و گوند تەواو سەرقاڵیان کردبوو. ئەگەر گوندی ئەزیەتی نەکەن، ئەگەر شەڕ و هەق و ناهەقی خۆیانی نەهێننە لای... ئەگەر لێی گەڕێن بۆ خۆی بژیێ... ئەگەر لێی گەڕێن وەك هەموو کەسی دیکە، وەك هەموو دێهاتییەکانی دی بژی. ئای خۆزگە وا بوایە، بەڵام نابێ نا. هەر ئەوەندە جارێك ناوی خۆی نا ئەفە، ئیتر تەواو. ناچار بوو خۆ لە هەندێ ئیش هەڵقورتێنێ. دیارە بەوەندەیە قایل بوو. هەر خوداخودای بوو نەهامەتییەکی دیکەی تووش نەبێ و کەس کەڵەگایی لێ نەکا و دیسان ناچاری نەکەن بچێتەوە شاخ. گەورەترین ئاواتیشی هەر ئەوە بوو. بەردەوام نیگەرانی ئەوە بوو، بەڵام ئەو ئاواتەی لای کەس نەدەدرکاند. جگە لە ئیراز، کەسی دی ئاگای لە دڵی ئەفە نەبوو.

بەڵام ئاخرییەکەی قەوما و ئەوەی لێی دەترسا، بەسەری هات.

***

سەرهەنگ رۆستەم بەگ، براگەورەی ملازم حەسەنی ئەفەنییە. هەر ئەو ملازمەی بە دەستی چاخیرجالی کوژراوە. ئەو بنەماڵەیە هەر هەموویان لە ئازایەتیدا بەناوبانگن. مام و خاڵی هەموو رەشید و ئازای بەناوبانگن. خاڵوانی چەندی چەند ساڵە دەیانەوێ چاخیرجالی بکوژن، بەڵام تا ئێستا هیچیان پێ

نەکراوە. ئەو بنەماڵەیە هەموو لە ئاگری تۆڵەئەستاندنەوەدا دەگرێن. هەر هەمووان دەیانەوێ تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، بەڵام لێیان سوورە بەرامبەرەکەیان چاخیرجالییە. چییان پێ دەکرێ؟ رۆستەم بەگ خۆشی سەرهەنگێکی ئازایە. پێی قەبوول ناکرێ خوێنی براکەی بەفیڕۆ بچێ. تاقە ئاواتی ئەوەیە، رۆژێك تووشی چاخیرجالی بێ و تۆڵەی خۆی لێ بکاتوە. ئەو برینە دەمێك ساڵە هاتووەتەوە سۆ. چەند جاران کەوتبووە کەژ و کۆ لە چاخیرجالی گەڕابوو بەڵام هیچی پێ نەکرابوو. چەند جاران هەوڵی داوە، گیانی لەسەر بەری دەستی دابنێ و بەبێ ترس پەلاماری چاخیرجالی بدات، بەڵام برادەرەکانی پێشیان گرتووە. کە چاخیرجالییش لە چیا هاتووەتە خوارێ، نەیانهێشتووە سەرهەنگ توخنی بێ، بەڵام رۆستەم بەگ دەست هەڵناگرێ. هەر لە دەرفەت و رێیەك دەگەڕێ بەشکم بتوانێ تووشی چاخیرجالی بێ. جا ئەو کات یەکێکیان دەبێ بمرن.

رۆژێك سەر لەبەیانی هەواڵیان بۆ چاخیرجالی هێنا:

سەرهەنگ رۆستەم بەگ بەخۆی و سەربازەوە هاتووەتە ئاوایی و لە ماڵی کوێخان.

یانی چی؟ چما چاخیرجالی و حکوومەتی ناوەند گرێبەستیان مۆر نەکردووە؟ هیچ پیاوێکی چەکدار و هیچ بەرپرسێکی حکوومی نابێ بێتە ئاپاسۆرات. باشە رۆستەم بەگ ئەوەی دەزانی؟ لەوانەشە لێی تێك چووبێ... بەشکم مەبەستێکی خراپیشی نەبێ...

بەڵام رۆستەم بەگ بە نیازی خراپ هاتبوو. خۆی پێ نەگیرابوو. بە بیست سی کەس لە سەربازە هەرە باشەکانییەوە هاتبوونە ئاواییەکەی چاخیرجالی.

## ******* پاشی ******

ئـاگری تۆڵەسـەندنەوە لـە ناخیـدا بڵێسـەی دەکێشـا و هـاتبوو ئـەو ئـاگرە دامرکێنێتەوە.

ڕۆستەم بەگ بڕیـاری خـۆی دابـوو. دەیزانـی چـاخیرجالی زۆربـەی کاتـەکانی خـۆی لـە قاوەخانـەی ئاواییـدا بەسـەر دەبـا. بڕیـاری دابـوو، لـەپڕ بچـێتە چایخانەکەوە و سینگ بە سینگی چاخیرجالییەوە بنێ. چاوی لە چاوی ببڕێ و سینگی پڕ بکا لە فیشەك.

بەڵام خەونەکەی وەدی نـەهات. هـەرگیز ئـەوەی بـۆ نەڕەخسـا. چـونکە نیـو سـەعات بـەر لـەوەی ڕۆسـتەم بـەگ بگاتـە ئـاوایی، چـاخیرجالییان ئاگـادار کردەوە:

ـ سەرهەنگ ڕۆستەم بەگ بەخۆی و سی سەربازەوە بەرەو ئاوایی دێ.

چاخیرجالی هەواڵەکـەی پـێ گـەیبوو، بـەڵام خراپـی بـیر نـەکردبۆوە. لەگـەڵ ئەوەشدا نابێ لەخۆی خافڵ و خەمسارد بێ.

بەڵام ڕۆستەم بەگ لە تۆڵە بەولاوە بیری لە هـیچ شـتێ نـەدەکردەوە. خـوێن بەری چاوی گرتبوو. لە لایـەکی دیکەشـەوە دەرەبـەگ و ئاغاکـانیش دنـەیان دابوو. بەوپەڕی تووڕەییەوە لە قاوەخانەکە وەژوور کـەوت. پـەنجـەی لەسـەر پەلەپیتکە بوو، بەڵام چاخیرجالیی لەوێ نەدی. تووڕەتر بـوو. دەی دەبـێ چ بکا؟ ئاخۆ هەڵکوتێتە سەر ماڵەکەی چاخیرجالی یان نا؟

گوندی خولْقیان کرد. ڕۆستەم بەگ دانیشت.

ـ ئەفە، سەرهەنگ هاتووە. زۆریش تووڕەیە.

ڕۆستەم بەگ هاتووە بۆ دۆستایەتی یان دوژمنایەتی؟ دەبێ روون بێتەوە.

بانگی پیاوەکانی خۆی کرد:

## ******* یاخی *******

ـ زوو بن خواردن ئامادە بکەن. هەر لەو قاوەخانەیە مێزەکان ڕێکوپێك بکەن و میوانداری لە ڕۆستەم بەگ و هاوڕێیانی بکەن. سڵاوی منیشی پێ بگەیەنن و بڵێن خەمی هیچی نەبێ. ئەو گوندە، گوندی خۆیەتی. ئەگەر حەزیش دەکا، دەکرێ بێتە ماڵەوە.

سفرەیەکی باشیان لە قاوەخانەکە بۆ ڕاخست. هەموو شتێکیان ئامادە کرد. لە شیری مریشکەوە هەتا...

یەکێك لە پیاوەکانی ئەفە چووە لای ڕۆستەم بەگ و گوتی:

ـ ئەفەم سڵاوی گەیاندووی و گوتی، سەرهەنگ خەمی هیچی نەبێ. گوندەکە، گوندی خۆیەتی. ئێستاش فەرموون پارووەك نانی نیوەڕۆ بخۆن. دوای نانی نیوەڕۆش ئەگەر گەورەمان دەکەن، با بێنە ماڵێ.

ڕۆستەم بەگ، ئەفەی لە قاوەخانەکەدا نەدیتبوو و بەوە توورە ببوو، ئەمجار بەجارێك شێت بوو. خوێن بەری چاوی گرت. چوو و سفرەکەی دایە بەر شەق و خواردنەکانیشی بەملاولادا بڵاو کردەوە.

ـ نانی سەگبابێکی ئاوا ژن حیز، بۆ وەی نابێ سەگیش بیخوات. ئەوەش بەو نامەردە بڵێن.

چیی لە زاری هاتە دەرێ گوتی و جنێوی دا و سووکایەتیی پێ کرد. هەواڵەکەیان بە چاخیرجالی گەیاندەوە. چاخیرجالی مات بوو. یانی چی؟ دیسان شاخ؟

ـ تفەنگچییەکان ئامادە بن.

## ******* پلخر *******

تفەنگچی لە خودایان دەویست. ئەوەندەی یەك و دوو ئامادە بوون. دوو کیلۆمەتر لە دەرەوەی دێ، بۆسەیان نایەوە. رۆستەم بەگ بەولایەدا دەرۆیشت.

رۆستەم بەگ لە دوورەوە دەرکەوت. گەیشتە شوێنی بۆسەکە. چاخێرجالی ددانی چیڕ دەکردەوە. بەخۆی دەگوت:

ـ ئاخر کافری بێ دایی و باب... چیت لە گیانی من دەوێ؟ بۆچی هاتوویە ئەو گوندە؟ چما...

تەقە لە تفەنگانەوە هەستا. رۆستەم بەگ و ژمارەیەك لە پیاوەکانی سەرنخوون بوون. ئەوانی دیکەش گەڕانەوە و رایان کرد.





جـا کـێ چـاخیرجالی راوەدوو نـانیّ؟ کـام تۆڵەئەسـتێن؟ چـەرکەزەکان، ئەلبانیاییەکان، هێزە حکوومییەکان... نۆکەری دەرەبەگەکان، پیاوی ئاغـا و دەرەبەگان، برا و خزمی ئەفە کوژراوەکان...

ئەوانە تەواو لە کارەکەی خۆیاندا خاراون و شارەزا بوون، بەڵام چۆن؟ باشە، خـۆ دیـارە. چـەندی چـەند سـاڵان وەشـوێن چـاخیرجالی کـەوتوون و ئـیتر سرووشتییە بتوانن مەتەڵ و فرت و فێڵەکانی فێر بن و لـە کارەکـەی خۆیانـدا شارەزاتر بن.

چاخیرجالی تەواو تەنگاو کراوە. لەوەتـەی هەیـە ئەوەنـدە تـەنگاو نـەکراوە. لەوەتەی چۆتە شاخ، ئەوەندەی عەزاب نەکێشاوە، بەڵام ئەو لە هـەموو هـەل

و دەرفەت و تواناکانی کەڵك وەردەگرێ. هەموو هۆش و زیرەکیی خۆی دەخاتە گەڕ و ناهێڵێ دوژمنەکانی زەفەری پێ بەرن.

بێبەزەییانە پیاوی دەکوشت. بە هەموو لایەدا دەیکوشت و ئەو هەقەشی بە خۆی دەدا. بۆ وێنە ئەو ڕۆستەم بەگە چیی لە گیانی ئەو دەویست؟ حکوومەتی ناوەندی بۆچی نەیدەهێشت بژیێ؟ هەر هەمووی لەبن سەری حکوومەتدا بوو. هەمووان قۆڵیان هەڵماڵیوە ئەفە بکوژن. ئەفەش ناچارە کونەمشکیان لێ بکاتە قەیسەری. لە سەر ڕێی جەندرمە و ئەوانەی کەوتوونە شوێنی، بۆسە دادەنێتەوە و دەیانکوژێ. دوای شەڕ و خۆشاردنەوەیەکی ئیتر ئێستا ئەوانەی ڕاوەدووی دەنێن، تێگەیشتوون لەو جۆرە شەڕ و بەرەنگارییانەدا ئەوەی رادەکا، سەردەکەوێ و براوەیە و ئەوی دەکەوێتە شوێنیش، ئەو دەیدۆڕێنێ. " بەڵام ئەوان هێزی حکوومەتن. ئەرکیان ئەوەیە وەشوێن کەوتن. ئەگەر ڕاو نەنێن، چاخیرجالی مەمنوونیش دەبێ. لە خودای دەوێ نەکەونە شوێنی، بەڵام ئیتر ئەوکات ئەویش خۆی دەبێتە حکوومەتێك و چیی پێی خۆش بوو دەیکا. دەبێ ڕێونیشانێك بکێشن. دەبێ کارێك بکەن، کە چاخیرجالی جەندرمان ڕاو بنێ و بکەوێتە شوێنیان. دەبێ تووڕەی بکەن و ناچاری بکەن کارێکی قۆڕ و هەڵنەسەنگێنراو بکا.

باشە چۆن تینی بدەن؟ زۆر سادەیە. دەبێ خانووەکەی بسووتێنرێ. باخچەکەی تێك بدرێ. ئەو کات دەهری دەبێ، چونکە باخچەکەی هێندەی منداڵەکانی خۆش دەوێ. دەبێ ژن و منداڵەکەی بڕفێنرێن و ببردرێنە شارۆچکە و لەوێ زیندانی بکرێن. ئەو کات چاخیرجالی وەشوێن جەندرمان دەکەوێ بۆ ئەوەی تۆڵەی ماڵە سووتاوەکەی بکاتەوە. شێت دەبێ، بۆ

## ******* پاشی *******

ئازادکردنی ژن و منداڵەکەی هێرش دەکاتە سەر شارۆچکە و جا ئەو کات سووك و سانا لە داو دەکەوێ.

ئەوانە هێشتا چاخیرجالییان نەناسیبوو.

ئەشکەنجە سامناکەکان دەستیان پێ کرد. بە بیانووی شاردنەوەی چاخیرجالی خەڵکێکی زۆر لێیان دەدرێ و دەکوژرێن و دەبرێنە زیندان و دوور دەخرێنەوە. عوسمانی سێبەری شوومی ترس و مەرگ بەسەر خەڵکەکەدا دەکێشێ. عوسمانی دەکوژێ و بەبێ پرینگانەوە زوڵم دەکا و بیانووی هەموو ئەو کارانەیش چاخیرجالییە، بەڵام خەڵك ئەفەی خۆیانیان لەوە پتر خۆش دەوێ، چونکە دەبینن، لەگەڵ عوسمانی بەشەڕ دێ، لەگەڵ ئاغاکان بەشەڕ دێ و دژی زوڵم دەوەستێتەوە و بەشەڕ دێ. چیی عوسمانی پتر لێیان توند دەکا، خەڵك چاخیرجالییان خۆشتر دەوێ.

لە هەفتەیەك لەوەپێشەوە، جەندرمە دەستیان کردبوو بە دەنگۆ نانەوە. تووشی هەر کەس دەبن، دەڵێن:

فلانە ڕۆژ حکوومەت ماڵەکەی چاخیرجالی دەسووتێنێ. باخچەکەشی تێك دەدا و ژن و منداڵەکەشی دەخاتە زیندانەوە.

ڕۆژە دیاریکراوەکە دەگات. ڕۆژێکی هەینی، هێشتا تاو هەڵنەهاتووە، سەرباز گەمارۆی ماڵەکەی چاخیرجالی دەدەن و سەنگەر دەگرن. چاخیرجالی دێ و زۆر سووك وسادە دەیکوژن. دێ ماڵەکەی ڕزگار بکا. ژن و منداڵەکەی ئەفە لە ماڵێ دێننە دەرێ و خانووەکە دەسووتێنن. هەموو پەنجەیان لەسەر پەلەپیتکەیە. چاوەڕێن. بڵێسەی ئاگرەکە، ئامێز بە ماڵەکەدا دەکەن و سەر لە ئاسمانێ دەسوون. ئەفە دێ.

## ******* پاشو *******

بەڵام ئەڤە لە بەرزاییەکەوە، کە دەڕوانێتە گوندەکە، لە بن تاکەدارێك دانیشتووە و سەیری سووتمانی ماڵەکەی دەکا. زەردەیەکی تاڵی لەسەر لێوە...

ماڵەکەی سووتا و بوو بە خۆڵەمێش. نزیکەی نیوەڕۆ بوو. جەندەرمە زۆر چاوەڕێ بوون، بەڵام کەس نەهات. چاخێرجالی هەر لەو شوێنەوە کە دانیشتبوو، گوێی لە تەقەی تفەنگ دەبوو. دەموچاوی گرژ ببوو، بەڵام زەردە تاڵەکەی هەر لەسەر لێو بوو.

پێش بینیی جەندرمەکان وەڕاست نەگەڕا. چاخێرجالی تا نیوەڕۆ هەر سەیری کرد، دواییش ملی رێگای گرت و رۆیشت.

جەندرمە هیچیان پێ نەبڕا. هەر بۆیەش تووڕەتر بوون. بۆیە ژن و منداڵەکەی چاخێرجالییان گرت و بردیاننە ئۆدەمیش و لەوێ بەندیان کردن.

چخێرجالی یەك دوو رۆژ چاوەڕێ بوو، بەڵام حکوومەت خێزانەکەی بەر نەدا. حەوتووەکی دیکە راوەستا. ئەوجار نامەیەکی بۆ قایمەقامی ئۆدەمیش نووسی و هەڕەشەی لێ کرد، بێت و خێزانەکەی بەر نەدەن، کاری وا دەکا، زیرەکترین بەرپرسی حکوومەتیش ئەقڵی پێی نەشکێ. هێشتا نامەکە نەگەیبووە دەستی قایمەقام، چاخێرجالی رێی بە کاروانێکی دەوڵەتی گرت و زێڕ و زیوێکی زۆری لێ ئەستاندن و رووتی کردن. ئەوە یەکەم کاری بوو. کە فەرماندار نامەکەی وەرگرت، لەولاشەوە هەواڵی تاڵانی دارابیەکەی دەوڵەتی پێ گەیشت، دەمودەست خێزانەکەی چاخێرجالیی ئازاد کرد و ناردنییەوە ئاوەدانی.

## ****** یاخی ******

قەرەعەلی ئەفە، یەکێك بوو لە هەڤاڵ و بەردەستەکانی چاخیرجالی. ئەویش چەند تفەنگچییەکی هەبوو. بە ئەمری چاخیرجالی لێبوردنەکەی حکوومەتی قەبووڵ کردبوو و لە چیا هاتبووە خوار. یەکێك لە مەرجەکانی لێبوردنەکەشی ئەوە بوو، خۆی و هەڤاڵەکانی ئیزنی چەکهەڵگرتنیان هەبێ. جا بۆچی ملکەچی ئەو لێبوردنە ببوو، دیار نییە. لەوانەیە بۆ ئەوە بێ لە دەشتێ بێ و لە ڕۆژی تەنگانەدا بەهانای چاخیرجالییەوە بێ. کێ چووزانێ، بەڵام سەرەڕای لێبوردنەکەش، حکوومەت دەست لە عەلییە ڕەش هەڵناگرێ. بەردەوام لێی دەخەفتێ.

ڕۆژێکیان کە خەریك بوو لە گوندێکەوە دەچووە گوندێکی دیکە، کەوتە داوی جەندرمەکانەوە:

- مەبزوو. خۆ بەدەستەوە بدە.

- من قەرەعەلی ئەفەم.

- خۆت بەدەستەوە بدە. چەکەکەشت فڕێ بدە.

- فڕێی نادەم. ئێمە و حوکمەت گرێبەستمان مۆر کردووە.

- یان خۆ بەدەستەوە دەدەی، یان دەتکوژین. تەواو.

عەلییە ڕەش، ناچار تفەنگەکەی فڕێ دا. هەڤاڵەکانیشی وایان کرد. چەند جەندرمە لە سەنگەرەکانیان دەرپەڕین و تفەنگەکانیان هەڵگرت. دواییش دەستیان لە بەرپشتێندیان نا و دەمانچە و خەنجەرەکەیان لێ دارنین. دەستیان بەستن و وەپێش خۆیان دان و بەرەو ئۆدەمیش کەوتنە ڕێ. لە سەر ڕێیان، چەند شوان و عێلاتی و دێهاتییان تووش بوون. یەك دوو کەس لەوانە پیاوی چاخیرجالی بوون. عەلییە ڕەش بە برۆهەڵتەکاندن و

****** یاخی ******

چاوترووکاندن مەسەلەکەی تێ گەیاندن. ئەوانیش هاتنەوە و بۆ ئەفەیان گێڕاوە. ئەفە هیچ خۆی تێك نەدا. هەر بێدەنگ بوو و متەقی لە خۆی بڕی.

عەلییە رەش لە رێگایە خێرا خێرا ئاوڕی لە هەڤاڵەکانی دەداوە و پێی دەگوتن:

- خەمتان نەبێ نا. ئەفە خۆی دەگەیەنێتێ. لەوانەشە هەر ئێستا لەسەر رێگامان بۆسەی نابێتەوە. زۆری پێ ناچێ، گوێمان لە تەقەی تفەنگی دەبێ.

جەندرمە وێکڕا گۆرانییان دەگوت. سروودێکی سەرکەوتن. ئەو گۆرانییە عەلییە رەشی دەکوشت. دەتگوت هەناوی دەردێنن. دەیویست بنەڕێنێ و بڵێ: "کوڕە هەی دایك حیزینە. بەر لەوەی بگەنەوە ئۆدەمیش، ئەفە هەمووتان دەکوژێ. جاری راوەستن...

ئێوارە داهات. هێشتا دانێکیان مابوو بگەنەوە ئۆدەمیش. شەوێ لە گوندێکی سەر رێیان مانەوە. منداڵە وردکەی گوند کە بیستیانەوە عەلییە رەش گیراوە، هاتنە سەیری. جەندرمە چەنەیان گەرمدا هاتبوو و چۆنێتیی گرتنەکەی عەلییە رەشیان بە تاموخوێوە دەگێڕاوە و دەیانگوت، هەر بەو زووانە چاخێرجالییش دەگرین و وەك سەگ پەتی دەکەین. عەلییە رەش ددانی چیڕ دەکردنەوە. چیی نەمابوو بنەڕێنێ و بڵێ:

- زۆری پێناچێ چاخێرجالی زیارەت دەکەن. ئەو کات ناتوانن ئەوەندە چەنەوەڕی بکەن، دایکی هەمووتان دەگێ.

نەیگوت. نەیتوانی وا بڵێ. نەیویست دوژمنەکەی بەخۆیدا بێنێتەوە، ئەگینا زۆری پێخۆش بوو بنەڕێنێ. جەندرمە قاقا پێدەکەنین. گاڵتەیان بە عەلییە رەش و هەڤاڵەکانی دەکرد. جنێویان دەدانێ، بەڵام ئەو پێدەکەنی. لە بەر

## ******* یاخی *******

خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە، کە ئەو دەمەی چاخیرجالی پەیدا دەبێ، ئەو جەندرمانە چەندە سەیر دەبن. چەندە دەترسن. چۆن دەپاڕێنەوە. دەست و پێیان چۆن دەلەرزێ. خۆزگە وا بوایە. ئەو کات تێری دڵی سەیری دەکردن.

دەست و پێی عەلییە رەش و دوو هەڤاڵەکەیان لە کۆت و زنجیر کرد. لەو ژوورێکدا بەندیان کردن و دەرگایان لەسەر گاڵە دان و جەندەرمەیەکی سوارچاکیشیان کردە پاسەوانیان. عەلییە رەش خەوی لێ نەدەکەوت. حەجمینی لەبەر هەڵگیرابوو. ئەفە بێ و نەبێ دەمێکە هەواڵەکەی بیستۆتەوە. خۆ زۆریش دوور نەبوو. ئەی باشە بۆ تا ئێستا نەهاتووە؟ دێ. بێ و نەبێ نەخشەیەکی هەیە، ئەگینا هاتنەکەی مسۆگەرە.

ئیتر سێ سوار سەعاتێکی ماوە رۆژ بێتەوە. ئەو باش دەزانێ چ دەکا. رزگارمان دەکا. ئەگەر پێویست بێ، تەنانەت دێتە ئۆدەمیشیش. دەرگای بەندیخانەش دەشکێنێ و لە چنگی جەرندرمان دەرماندێنێ. دەست و پێی جەندرمان شەتەك دەدا و هەمووان دەباتە چیا. چما ئێوە ئەفەی خۆتان ناناسن؟

هەڤاڵەکانی وەڵامیان نەداوە. لەوانەیە خەوتبێن. لەوانەشە خەیاڵ و فکر هەڵیگرتبێن.

عەلییە رەش هەرای کرد:

ـ ئەفە دێ.

جەندرمەکان لە دەنگی راچڵەکین.

رێك لەو کاتەدا هەواڵبەرێك چووە لای چاخیرجالی و پێی راگەیاند و پێشی گوت سبەی بەیانی عەلییە رەش دەبەنە ئۆدەمیش و لە داری دەدەن.

## ******* یاخۆ *******

هەواڵبەرەکە رووداوەکەی باس کرد و رۆیشت. چاخیرجالی لەو دەمەوە کە بیستبوویەوە عەلییە رەش گیراوە، لەبزی دەلەبزی کەس نەگەڕابوو. دوای رۆیشتنی کابرای هەواڵدەر، سەری خستە نێوان لەپی دەستەکانییەوە و لەجێی خۆی نەبزووت. یەك دوو سەعات ئاوا مایەوە و ئەوجار بانگی حاجیی کرد:

- دەبیٚ بچین و عەلییە رەش رزگار بکەین حاجی. لە سێدارەی دەدەن. لە داری دەدەن. هەر لەبەر ئەوەی برادەری چاخیرجالییە. دەڵێی چی؟

- ئەگەر رزگاری نەکەین، دەبێتە نامەردی. دەبیٚ باش بیری لیٚ بکەینەوە و بزانین بۆچی گرتوویانە. لەپێشدا دەبیٚ جوان لێکی بدەینەوە. کیٚ چووزانیٚ، بەشکم عوسمانی ئەو بکاتە داوێك، بۆ ئەوەی ئێمەی پیٚ بگریٚ.

- بەڵام ئەی ئەگەر لە داریان دا؟ ئەو کارەی ئێمە نابێتە نامەردی؟ ناڵێن چاخیرجالی ترسا؟

- ناکریٚ ئەفە. ئەوە دەبێتە خۆ کوژی. یانی چاوت بگری و خۆت بخەیە داوی جەندرمانەوە. ئاخۆ ئێمە ئەومان نەداوەتە دەست جەندرمان. کەس لۆمە و سەرکۆنەی ئێمە ناکا.

چاخیرجالی وەڵامی نەداوە. بێدەنگ بوو. هەتا بەیانی متەقی لێوە نەهات، بەڵام خەویشی لیٚ نەکەوت.

بەیانی زوو، جەندرمە، عەلییە رەش و هەڤاڵەکانیان وەپێش خۆیان دا و رۆیشتن. بەرەبەری نیوەڕۆیە گەیشتنە ئۆدەمیش. لە دەرگای بەندیخانە نزیك بوونەوە. عەلییە رەش و برادەرەکانی بۆ ساتێك لە بەر دەرگای زیندانەکە چاوەڕێی شتیچك بوون، بەڵام نەبوو.

## ******* پاخو *******

لەپڕ دەرگای زیندانەکە کرایەوە. عەلی سەیرێکی دەرگای زیندانەکە و سەیرێکی لایەکەی دیکەی کرد. یەك دوو هەنگاو چووە پێشێ و دیسان راوەستا و سەیری دەوروبەری خۆی کرد. هیوای برا و وەژوور کەوت. دەرگا گەورەکەی زیندانەکە لە پشتەوەی داخرا.

دەستی هەڤاڵەکانی گرت و چاوی بڕییە چاویان و گوتی:

ـ کێ چووزانێ ئەڤە چ خەیاڵ و نەخشەیەکی لە زەینیدایە؟ هیچ خەم مەخۆن. بمانبەنە بن عەرزیش، لە بن پەتی سێدارەش بێ، ئەڤە هەر رزگارمان دەکات.





چاخیرجالی تەنگاو کرابوو. تاقمەکانی راوەدوونان و پشکنین هەموو سەنگەرەکانی ئەویان ناسیبوو و بەو پێیەش دەجووڵانەوە. ئیتر چاخیرجالی نەیدەتوانی لە شوێنێك چالاکییەك بکا و لە جێیەکی دیکە سەر وەدەر بنێ. تاقمی راوەدوونەر زیرەکتر ببوون و سەریان بە هەموو کون و قوژبنێکدا دەکرد، بەڵام چاخیرجالییش دەستی لەسەر دەست دانەنابوو. ئەو نەنووستبوو. لە دارشتنی نەخشەی نوێدا کەسێکی بێوێنە بوو و دوای مەرگی "حەیدەر ئۆغڵی" ئەو چیایانەی وێنەی چاخیرجالییان بەخۆوە نەدیتبوو. ئەفە تاقانەی رۆژگار بوو لە دارشتن و داهێنانی تاکتیکی شەڕدا.

رۆژێکیان لەپڕ تفەنگچییەکانی خڕ کردەوە:

## ******* یاخی *******

- با تاوێك بچین و له دەشتیّ بگەڕێین.

تفەنگچی بە ئەزموون دەزانن، کاتیّ ئەفە خرپیان دەکاتەوە و بە دڵێکی خۆشەوە پێیان دەڵێ:"با تاوێکیش... " دیارە نەخشەیەکی نوێی لە زەینیدایە و ئەوە هێمای راپەڕاندنی هەندیّ کاری باشە.

تفەنگچی ئامادە بوون و شەویّ لە چیاوە داگەڕان. چوون و لە ماڵی یەکیّ لە برادەرەکانیان کە حەشارگەشیان بوو، کۆ بوونەوە. ئەو ماڵە لە یەکێك لە گوندەکانی "کۆلا" بوو. ماڵێکی تا بڵێی گەورە بوو. جا ئێستا لێیانگەڕێن با هەموو ئەو کەژ و کێوانەمان بەدووودا بتەقێنن. رێك حەوتوویەك لەویّ مانەوە و پشوویان دا. چاخیرجالی لەو هەفتەیەدا قسەی لەگەڵ کەس نەکرد. هەر دانیشت و بیری کردەوە. هەتا ئەوەی رۆژێکیان هەواڵێکی نویّ هات:

- جەندرمە لە کۆلا چوونە دەریّ و وەشوێن رووداوێك کەوتن. چاخیرجالی چاوەڕێی ئەو ساتە بوو. رێك لەو کاتەدا هەستان و چوونە کۆلا و یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی کۆلایان رفاند و بردیانە چیا.

چاخیرجالی کەسی لەسەر پووڵ و پارە نەدەکوشت. کەسی ئەزیەت نەدەکرد. ئەو تەنیا ئەلبانیایی و چەرکەزە ملهوڕەکانی دەکوشت. ئەوانە بەکرێگیراوی حکوومەت بوون و کار و پیشەیان هەر ئەوە بوو وەشوێن چاخیرجالی بکەون. ئەو ئاغا و زاڵمانی دەکوشت. ویستبای باج و پیتاك لە هەر دەوڵەمەندێك بستێنیّ، دەیرفاند و دەیبردە چیا. لەوێش وەك شا میوانداریی لیّ دەکرد و رێزی دەگرت. زۆربەی ئەوانەی چاخیرجالی رفاندوونی و بردوونییەتە چیا، دواتر دەیانگێڕایەوە لەویّ سەد هێندەی ماڵی خۆیان ئاسوودەتر بوون. باشترین خواردنیان دراوەتیّ و تاقە قسەیەکی

## ******* پاخر *******

ناخۆش چییە، پێیان نەگوتراوە. قاوە و تووتن و تەنانەت ڕۆژنامەشیان بۆ کابرای بەبارمتەگیراو دابین دەکرد. ئەفە ئەوپەڕی پیاوەتیی لەگەڵ دەکردن و لەگەڵیان بە بەزەیی دەبوو. ئەو ئەفەیەی لە هەمبەر عوسمانی و پیاوەکانیدا وەك پڵنگێکی مەغروور وا بوو، لە هەمبەر میوان و دیلەکانیشیدا، وەك خزمەتکارێکی خاکەڕا. تەنانەت لەلای ئەوان دەنگیشی هەڵنەدەهێنا.

دەوڵەمەندە کۆلاییەکەیان بۆ ماوەی حەوتووەك لە چیا ڕاگرت و دوای ئەستاندنی چوارهەزار سکەی زێڕ، بەریان دا.

ئەو ڕۆژانە، ئەفە زۆری پێویستی بە پارە بوو. دەبوو ئەوەندە پارە بە هەزاران بدا... دواییش خۆ دیارە. ئەوجار پارەی لەو کەسانە وەردەگرت، کە خەڵك ڕقیان لێی بوو و بێزراو بوون. لەو کات و ساتەدا کە زۆر تەنگاو کرابوو، بە بەردێك دوو کێلی دەشکاند.

لە "تۆرقۆتلو" کابرایەکی لێ بوو ناوی "موتافی زادە" بوو. تا بڵێی دەوڵەمەند بوو. ئەفە ساڵێك لەوەپێش داوای لێ کردبوو هەزار لیرەی بۆ بنێرێ، بەڵام ئەو وەڵامەی وەگرتبۆوە:

ـ نایدەمێ. جا ئەگەر پیاوە با بێ و لێم بستێنێ. "

چاخیرجالی ساڵێك بێدەنگەی لێ کرد. خۆی لە گێلی دا، بەڵام ئەو جوابە تەزاندبووی. جا ئێستا کاتی وەی بوو هەڵکوتێتە سەر تۆقۆتلو و دەهەزار لیرە لە موتافی زادە بستێنێ، دە هەزار لیرەی تەواو. تەنانەت قرۆشێکیشی کەم بێ نەیەوێ.

بەڵام زۆریشیان تەنگاو کردووە. دەی باشە، دەبێ ڕێگایەك بدۆزێتەوە. زیرەکییە لە ڕادەبەدەرەکەی چاخیرجالی ئەو گرێپووچەکەیەشی کردەوە.

## ******* پاخو *******

دارودەستەکەی چاخیرجالی هەرگیز لە دە تفەنگچی پتر نەبوون، کەچی گەر ویستبای، دەیتوانی دە بیانکاتە دە هەزار تفەنگچییش. دەیتوانی هێزێکی شۆڕشڤان پێك بێنێ. هەر هەموو چاویان لە دەمی چاخیرجالی بوو. جگە لەوە کۆمەڵێك تفەنگچیی لە گوندەکانیش هەبوو کە لە راستیدا وەك پالێوراو سەیریان دەکرا و دەیانتوانی جێی ئەو تفەنگچیانە بگرنەوە کە دەکوژران یان دەگیران.

باشە چۆن هێرش بکاتە سەر تۆرقۆتلو؟ چاخیرجالی ئەوەندە ساویلکە نەبوو، بێ پارێز، هەڵکوتێتە سەر شارۆچکەیەکی گەورە. نەدەبوو راستەوخۆ هێرشەکەی بکا. هێرشی بەبێ تەگبیر و گەلاڵە دارشتن لە بەرنامەی چاخیرجالیدا نەبوو. دەبوو چ بکا؟

لە بیست تفەنگچیی ئامادەی گوندەکەی راسپارد. هاتن. چووە "سالّح لی" و لەوێ گێچەڵێکی نایەوە. جەندرمە و سەرباز و چەکداری چەرکەزی و تاقمەکانی دیکەی راوەدوونان بەرەو سالّح لی کەوتنە رێ. هەلی لەباریان بۆ رەخسابوو. ئێستا زۆر بە ئاسوودەیی و سانایی دەیانتوانی چاخیرجالی بگرن. دەبوو بەهەموو توانا و هێزەوە هێرشی بکەنە سەری. دەبوو یەك بگرن و ئەو بەڵایە لەسەر حکوومەت بکەنەوە. هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو، بوو بە تەقە. پیاوەکانی چاخیرجالی هەر سی کەس دەبوون. سەرەڕای ئەوەی پیاوانی حکوومەت زۆریش بوون، بەڵام چاخیرجالی نەیهێشت لە جێی خۆیان ببزوون. هەتا ئێواری رەهێڵەی ئاگریان بەسەر یەکتریدا باراند. ئێواری چاخیرجالی بە تفەنگچییە گیان لەسەردەستەکانی گوتی:

## ******* پلخو *******

ـ من و پیاوەکانم دەڕۆین. ئێوە هەتا نیوەی شەوێ هەر لێیان دەن. دوایـیش بازنەی گەمارۆکەیان بشکێنن و خۆتان رزگار بکەن. تێگەیشتن؟

ـ تێگەیشتین ئەفە.

لەو تەقە و لێکدانەشدا، تفەنگچییە راستەقینەکانی چاخیرجالی هەر دە کەس بـوون. ئەفـە دە کەسـەکەی هـەڵگرت و ملـی رێـی گـرت و رۆیشـت. بیسـت کەسـەکەی دیکـە مانـەوە و هـەتا نیـوەی شـەوێ شـەڕیان کـرد. هیچـکامیان لووتیان لەخوێن نەهات، بەڵام هێزەکانی حکوومەت وەك هەمیشـە کوژراویـان زۆر بوو.

چاخیرجالی وەك بای شەماڵ خۆی گەیاندە تۆرقۆتلو. شەو بوو. چـاو چـاوی نەدەدی. تووشی دوو کەسی گوندەکە بوو و پێی گوتن:

ـ من چاخیرجالیم. خێرا ماڵی موتاف زادەم نیشان بدەن.

ئـەو دوانــە هــەتا بـەردەرگای موتــاف زادە وەپـێش چــاخیرجالی کـەوتن. چاخیرجالی هەرای کرد:

ـ خێرا دەرگا بکەنەوە. دەرگا بکەنەوە.

ئەوانەی لە ماڵەکەدا بوون، زوو زانیان لە دەرەوە شتێکی ناخۆش دەقەومێ. هەر بۆیە دەرگایان نەکردەوە. زۆری نەبرد، زانییان چاخیرجالی و پیاوەکانی لەوێن. هات و هاوار شارۆچکەکەی داگرت.

ـ سووتمان، ئاگر. ماڵەکەی موتاف زادە خەریکە دەسووتێ.

هەموو دەیاننەڕاند. چیی خەڵك بوون، بە گەورە و بچووکەوە لە بەر دەرگـای موتاف زادە کۆ بوونەوە. بوو بە قیامەت.

## ******* پاخر *******

چاخیرجالی زانیی، خەریکە شتەکە قۆڕ دەبێ. لە پێشدا خۆی و دوایش تفەنگچییەکانی هەرایان کرد:

چاخیرجالی لێرەیە. چاخیرجالی... چاخیرجالی لێرەیە.

ئەوانەی گوێیان لێ بوو، زوو چەکدارەکانیان دیت و ترسان و رایان کرد. خەڵکەکە پاڵەپەستۆی یەکتریان دەدا بۆ ئەوەی زووتر بتوانن لەو گێچەڵە خۆ دەرباز بکەن. زۆر کەس دەکەوتن و پێخۆست دەکران. چەند خولەکێك دواتر، بەر دەرگاکەی موتاف زادە و تەنانەت کۆڵانەکانیش چۆل بوون. وای لێ هات هەر دەتگوت چەند ساڵێکە ئەو شارۆچکەیە چۆلە. شارۆچکە تەنانەت پشووشی دەرنەدەهات. هەر بەبێدەنگی هەڵدەلەرزی.

ئەفە پێی داگرتەوە لەسەر ئەوەی دەرگاکە بکەنەوە. تەنانەت هەڕەشەشی کرد، ئەگە دەرگاکە دەشکێنێ و ماڵەکە کاول دەکا، بەڵام موتاف زادە دەرگای نەکردەوە. باشە، چما کێویش خۆ لەبەر چاخیرجالی رادەگرێ؟

بە پەیژەی دراوسێکەیاندا وەسەر کەوت. چووە نێو خانووەکەی موتاف و کوڕە شانزەساڵانەکەی لە جێوبان دەرهێنا و هێنایە خوارێ. ئەو کارانە لە نیو سەعاتی پتر نەهایاند. لە شارۆچکەکە هاتنە دەرێ و لە دەرەوەی تۆرقوتلو لە مەزرایەك پشوویان دا. جەندرمە کەژ و چیایان لێ دەگەڕان، کەچی ئەو و هەڤاڵەکانی لە مەزرایەکدا پشوویان دەدا.

زۆری نەبرد، کە پەیامی موتاف زادەیان پێ گەیشت. کابرا ئەو پارەیەی داوا کرابوو، بۆی دانابوون.

## ******* پاشی *******

حاجی مستەفا و چاخێرجالی جلوبەرگی فەقێیانیان لەبەر کرد و کەوتنە رێ. بە بازاڕەکەدا رۆیشتن و گەیشتنە ماڵەکەی موتاف زادە. لە دەرگایان دا و بە نۆکەرەکەیان گوت:

- بمانبە لای موتاف زادە.

نۆکەر بردنییە ژوورەکەی موتاف زادە. موتاف زادە، کە چاوی بە فەقێکان کەوت، بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

- فەرموون کاکە، فەرموون.

چاخێرجالی گوتی:

- ئاغا بێنە ئەو پارەیە.

موتاف رەنگی بە رووەوە نەما. ناسینی. لەگەڵ حاجی چوونە ژوورەکەی دیکە و سێ توورەکەی پڕ لە زێڕیان هێنا. توورەکەیان دا بە چاخێرجالی. چاخێرجالی و حاجی دانیشتن و ورد ورد پارەیان ژمارد. تەنانەت سکەدراوەکانیشیان بە وردی بارەوبار کرد، بۆ ئەوەی لێیان سوور بێ، ئەسڵن.

حاجی سەکەکانی لە توورەکەی بارووتەکە کرد و کەوتنە رێ. دیسان لەسەرخۆ هەموو کۆڵانەکانی شارەکەیان بڕی و هاتنەوە حەشارگەکەیان. لەوێ چاخێرجالی بە کوڕەکەی موتاف گوت:

- چووین و باوکتمان دی. زۆر بە گەرموگوڕی پێشوازیی لێ کردین. جا ئێستا تۆ ئازادی. تفەنگچییەك دەتگەیەنێتەوە.





دوای ئـەو رووداوە، چـاخیرجالی هێرشـی کـردە سـەر یـەکێك لـە سـەرۆك عەشیرەتەکان و کوڕەکەی رفاند و بردییە چیا. دوای ئەوە چووە خانەقایەك و بوو بە موریدی شێخەکانی ئـەوێ و دڵنیـای کردنـەوە لـەوەی چـاخیرجالی کابرایـەکی ئیمانـدار بـووە و ئیمانداریشـە و رێـز لـە پیـاوانی ئـایین دەگـرێ. ئەوجار بۆ تالانی دەوڵەمەند و ئاغاکان بەرەو دەوروبەری "شیوە دار" کەوتە رێ.

لەو کاتەدا راوەدوونەرەکان زۆر بەهێز ببوون. پیاوی چەرکەز و خەڵکێکی بێ ئـەژماری "قوشچـی زادە ئەشـرەف بـەگ"یش کەوتبوونـە گـەڵیان. قوشچـی باشی، سوپاییەکی نەترس و بەغیرەت بوو و لەو دەوروبەرانەدا زۆر بەناوبانگ

بوو. لەگەڵ قوشی باشی، "قۆجە مەمەد"یش لەگەڵ پیاوەکانی هاتبوو. ئەو قۆجە مەمەدە، برا بچووکی سمایل ئەفە بوو. هەر ئەو سمایل ئەفەیەی چاخیرجالی هەڵیکوتابووە سەر ماڵەکەی و بە ماڵەکەیەوە سووتاندبووی. قۆجە مەمەد، زۆر لە سمایل ئەفە ئازاتر و بەغیرەتتر بوو. گەنج بوو و ئاگری تۆڵەی براکەی لە دڵیدا بڵێسەی دەکێشا و سوێندی خواردبوو، تۆڵە لە بکوژی براکەی بکاتەوە و بێبەزەییانە بیکوژێ. هەر بە راستی قۆجە مەمەد بۆ چاخیرجالی مەترسییەکی گەورە بوو.

چەکدارەکان بە رێنوێنیی قۆشچی باشی و قۆجە مەمەد، خۆیان ئامادە کرد. ئەوان زۆر زۆریان گرنگی بە کۆکردنەوەی هەواڵ دەدا. ئەوەش لە چاخیرجالی فێر ببوون. زۆر زوو تێگەیشتن ئەو کارە سوودی زۆرە. هاتوچۆکانی چاخیرجالییان خستە ژێر چاوەدێرییەوە و لەو رێگەیەشەوە، زانییان چاخیرجالی چووەتە شیوەدار.

قۆشچی باشی و قۆجە مەمەد جەندرمەکانیان برد و زۆر خێرا بەرەو شیوەدار کەوتنە رێ. جەندرمەکان لە دووسەد کەس پتر بوون.

چاخیرجالی کە پیشتر ئاگادار کرابۆوە دێنە سەری، پەنای بردبووە بەر رەوەزەکانی شیوەدار.

جەندرمە هات و گەیشتنە نێو شیوەدار. پیاوەکانی چاخیرجالی دەوری جەندرمەکانیان دابوو. بوو بە تەقەیەك، سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە. چەند جەندرمەیەك کوژران.

هاوین بوو. تەقەکە، کاتی نیوەڕۆ دەستی پێ کرد. لەگەڵ تەقەی تفەنگدا فیشکەفیشکی ماریش دەهات.

## ******* یاخو *******

زۆری نەبرد دوو هەڤاڵی چاخیرجالی پێکران. لەو لاشەوە، قۆجە مەمەد ئەنگێورا. بەو جۆرە بوو فیشەکێکی بەر کەوت:

قۆجە مەمەد بە قۆشچی باشیی گوت:

ـ ئەشرەت بەگ، ئاوا هیچمان پێ ناکرێ. خەریکە لە خۆڕا فیشەکەکانمان خەسار دەکەین. ئاخرییەکەی توانیمان وەگیری بێنین. جا ئێستا دەبێ مشووری بخۆین. ئەگەر هەمووشمان بکوژرێین، دیسانیش نابێ چاخیرجالی رۆح دەربەرێ و بەزیندوویی دەرچێ. ئەگەر لێی گەڕێین را بکا، هەرگیز پێمان ناگیرێ.

ـ دەتەوێ چ بکەی؟

ئەو گابەردە دەبینی؟ ئەوێ دەکەینە سەنگەر. دوایش بە سینگەخشکێ خۆم دەگەیەنمە سەنگەرەکەی چاخیرجالی و دەیکوشم.

ـ ئەوە شێتانەیە. چاخیرجالی ئاوا سووك و سانا راو ناکرێ.

ـ من پێم دەکرێ.

بەر لەوەی ئەشرەف بەگ بتوانێ پێشی بگرێ، مەمەد خۆی گەیاند پشت گابەردەکە و بە سینگەخشکێ بەرەو چاخیرجالی چوو. هەر هێندەی پەنجا مەترێکی مابوو بگاتە چاخیرجالی، کە چاخیرجالی دیتی و بە حاجیی گوت:

ـ ئەو دایك حیزەت دیتووە مستەفا؟ بزانە تا کوێ هاتووە.

خۆ ئەگەر فیشەکەکە گرتبای، لەتوپەت دەبوو، بەڵام قۆجە مەمەد ئەوەندە گورج و گۆڵ دەهات، نەدەپێکرا. هەر هات هەتا گەیشتە بیست و پێنج مەتریی چاخیرجالی. جا لەو کاتەدا وەك ئەو دەم باو بوو، دەستی کرد بە

جنێودان. جنێودانەکە دەبووە هۆی ئەوەی بەرامبەرەکەی، بە شوێنی بزانە و لێی بدا، بەڵام قۆجەمەمەد لەوانە نەبوو. زۆر باش دەهاتە پێشێ.

چاخیرجالی:

ـ حاجی، ئەو دایك حیزە تۆزێکی دیکە بێتە پێشێ، بە قەڵەمبازێك دەمانکوژێ. جوان لەسەر هەست بە. دەبێ زوو لێی بدەین.

بەڵام دەرفەتی نەدا. قۆجە مەمەد دەرپەڕی، کەچی... دوو تفەنگ وێکڕا تەقەیان لێ هەستا و قۆجە مەمەد وەك شلکە دارێك کەوتە عەرزی.

ـ دایکت بگێم.

دوای ئەو رووداوە، ئەفە بە وردی چاوێکی بە بازنەی گەمارۆکەدا گێڕا. لە لای رۆژهەڵاتەوە تەقەکە کەمتر دەبۆوە. جەندرمە شەکەت ببوون. دەبوو بازنەی گەمارۆکە بشکێنن و خۆیان دەرباز بکەن. شکاندنی گەمارۆ بۆ چاخیرجالی وەك ئاوخواردنەوە وابوو. لەوەدا پتر لە هەموو شتێك شارەزا و لێزان بوو. نەڕاندی. رووی تفەنگەکانیان لە بەرۆ رۆژهەڵاتەوە گرت و رەهێڵەی فیشەکیان بەسەر جەندرماندا باراند. دڕیان بە دوژمن دا و هاتنە دەرێ.

هاتنە دەرێ، بەڵام قوتار نەبوون. "مەحموود موختار پاشا" کە والیی ئەو ناوچەیە بوو، تەلەگراف بۆ هەموو ناوچەکە ناردبوو و پێی راگەیاندبوون، چاخیرجالی لە شیوەداردا قەتیس کراوە. ئەمری بە هەموو سەربازی ناوچەکە کردبوو، بگەنە ئەوێ.

"باندەرەلی محەمەد ئەفەنی" کە پلەی ملازمیی هەبوو، هەر تەلەگرافەکەی پێ گەیشت، خۆی گەیاندە شوێنی تەقەکە، بەڵام لە رێگایە بیستییەوە،

## ******* یاخی *******

چاخیرجالی گەمارۆکەی شکاندووە و بەرەو "گوێز ئالان" کەوتووەتە رێ. رێیەکەی گۆڕی و بەرەو گوێزئالان وەڕێ کەوت و رێك لەوێ بەرەنگاری چاخیرجالی بۆوە و بوو بە شەڕ.

بایندەرەلی محەمەد ئەفەنییش کابرایەکی رەشید و یەکێك بوو وەك چاخیرجالی. لەوەتەی چاخیرجالی چووبووە شاخ، هەنگاو بە هەنگاو بە دوویەوە بوو. چەند جاریش تێکهەڵچووبوون و چیی نەمابوو بیکوژێ. هەر ئەو رۆژە جووقەواری لە پازدە تاقمی یاخی بڕیبوو. هەر ئەو بڕوابەخۆبوونەشی ببووە هۆی ئەوەی بە پێنج کەسەوە بچێتە شەڕی چاخیرجالی. هەر ئەو چاخیرجالییەی دەستەیەکی دووسەت کەسیی شکاندبوو. بایندەرەلی محەمەد ئەفەنی کابرایەکی رەشید بوو.

زۆری نەبرد، جەندرمەی دیکەش گەیشتنێ. چاخیرجالی دیسان گەمارۆ درایەوە. ئەمجارەیان گەمارۆدەرەکان هەزار و پێنج سەد کەس دەبوون. شەڕ هەڵاییسا. دوو هەڤاڵی چاخیرجالی پێکران. ئەمنییە بەغیرەتتر بوون. هەزار و پێنج سەد کەس دەیانتوانی هەر بە تف دەستە بچووکەکەی چاخیرجالی بخنکێنن. گەمارۆیەکی هەزار و پێنج سەد کەسی، ئیتر ناشکێنرێ و هیی ئەوە نییە لێی قوتار بی. دەبوو خۆ بدەنە دەست چارەنووس و چاوەڕوان بن. چاخیرجالی لە هەفتا ـ هەشتا مەتریی بایەندەرەلی و پیاوەکانییەوە بوو. چاخیرجالی، بایندەرەلیی هەڵنابوو* و لێوی لێ دەکرۆشت:

ـ ئەو دایکەت بگێم، ئەگەر وەچنگم دەکەوی.

---

*هەڵنان: واتە خستنە ژێر چاودێرییەوە.

## ******* پاشخر *******

ئەگەر بکەوێتە چنگی، بایندەرەلی تێدا دەچێ. تەنانەت ئەگەر هەر ئەمجارەش لەو گەمارۆیە قوتار بێ، دیسانیش هەر کاری کراوە.

زۆری نەبرد، تاریك داهات. بوو بە شەو. دەبوو هەل بە دەرفەت بزانن:

- زوو بن دەوەن خڕ بکەنەوە. دەوەنی بچووك بچووك. چەند کەسێکتان هەر تەقە بکەن. ئەوانی دیکەش دەوەن کۆ بکەنەوە.

تفەنگچی دەوەنیان کۆ کردەوە. هەر کامە و کۆمایەکیان دەوەن لە پێش کۆ کرابۆوە. جا ئێستا ئەو دەوەنانە بۆچی دەبن؟

- دەوەنەکان لە خۆتان بئاڵێنن.

ئەوەش نوێترین فێڵی ئەفە بوو.

- هەوڵ بدەن دەوەنەکان لێك نەخشێن. نابێ خشەخشەیان بێ. تەقەش هەر بکەن.

تفەنگچی دەوەنیان لەخۆیان بەست.

ئەنگوستەچاو بوو. گەرم بوو. ئەستێرەی گەورە گەورە بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە. جریوەی ئەستێرەکان شەوەکەی دەرووشاند. هۆردووە هەزار و پێنج سەد کەسییەکەی جەندرمەکان دەشت و کێوی داگرتبوو. رەهێڵەی فیشەك بەهەموو لایەکدا دەباری. فیشەکیان بە تاریکییەوە دەنا. باش بوو هەواکەی تاریك بوو، ئەگینا چاخیرجالی پیسی لێ دەقەوما. لەتوپەتیان دەکرد.

- تەقە مەکەن و برۆن. بێدەنگ.

## ******* پاشخو *******

تفەنگچییەکان بەرە هەرە لاوازەکەی جەندرمەکانیان هەڵبژارد و کەوتنە ڕێ. چەند کۆمەڵە دەوەن لە تاریکاییەکەدا بەرەو لایەك دەڕۆیشتن. لەوانەیە با بیانبا. گەیشتنە لێواری هەڵدێرێکی گەورە.

- ڕاوەستن.

ڕاوەستان. تارمایی خەرمانێك دەوەن بەسەر ڕەوەزەکەوە دیار بوو. جەندرمە یەك دوو سەعاتێك چاوەڕوان بوون. تەقەیان کرد، بەلام وەلامی تەقەیان نەدراوە. چاخیرجالی یان کوژراوە، یان ڕای کردووە.

جەندرمە لە شەڕ وەڕەز ببوون. وازیان لە شوێنی شەڕەکە هێنا و چوونە یەکێك لە گوندەکانی دەوروبەر. بایندەرەلی محەمەد ئەفەنی هەر لەوێ مایەوە. بێ ئەملاولا چاخیرجالی دەبینرێ. نە کوژراوە و نە ڕای کردووە.

چاخیرجالییش محەمەد ئەفەنیی دەناسی. بە هاوڕێکانی گوت:

- بایندەرەلی محەمەد لەجێی خۆی چەقیوە. جەندرمە ڕۆیشتن، بەلام ئەو ژن حیزە لەوێ مایەوە. دەبێ بە زیندوویی بیبرژێنین. لەتوپەتی دەکەین و کەلاکەکەی دەنێرینەوە بۆ مەحموود موختار پاشا، بەلام دەبێ دانیشین و محەمەد ئەفەنی بدوێنین. ئەو کابرایە پیاوێکی باشە، بەلام بۆچی چەندی چەند ساڵە خزمەتی عوسمانییەکانی کردووە؟ بۆچی بووەتە پیاوی دوژمنی خەڵك؟ ئەویش بە نرخی گیانی؟ دەبێ ئەو شتانەی لێ بپرسم. پیاوێکی ئاوا ڕەشید و ئازا بێ، تۆ بڵێی نەتوانێ کارێکی دیکە بکا؟ دەڵێی چی حاجی؟

- ئەفەم باشتر دەزانێ.

- ئەفەم باشتر دەزانێ.

## ******* یاخی *******

- یانی ئەو محەمەد ئەفەنییە من ناناسیێ؟ من دۆستی هەژار و لێقەوماوانم. لەوە ئاگادارە؟ لەوەتەی چوومەتە شاخ، دەستم بۆ شتی حەرام نەبردووە. ماڵی کەسم نەخواردووە. لەوە ئاگادارە؟ ئەی باشە بۆچی چەند ساڵانە وەدووی من کەوتووە؟ باشە باوکیم کوشتووە؟ قسەی لەگەڵ دەکەم و ئەگەر قسەی لێ وەرنەگرتم، تەرمەکەی وەك دیارییەك دەنێرمەوە دەرباری عوسمانی.

ئەفە بۆ وای لێ هاتووە؟ لە ژیانی دا ئاوا بیرمەندانە قسەی نەکردبوو. قەت ئەوەندەی قسە نەکردبوو. هەرگیز ئاوا راشکاوانە بۆچوونی خۆی نەدرکاندبوو. یانی محەمەد ئەفەنی ئەوەندەی کاریگەریی لەسەری بووە؟

- زوو بن ببزوون. جەندرمەکان بکوژن، بەڵام ئاگاتان لێی بێ، لووتی لەخوێن نەیە. دەبێ محەمەد ئەفەنی بەزیندوویی بگرین. هەر وەك پێم گوتن.

پیاوێکی لەسەرخۆی وەك چاخیرجالی ئاوا سووك و ئاسان وورووژابوو. پەیتاپەیتا دەیگوتەوە:

- بە زیندوویی بیگرن. زیندوو.

لەپڕ لە پشتەوەڕا دەنگی تەقەیەك هات. محەمەد ئەفەنی لەپڕ زانیی هەموو پیاوەکانی کوژراون. هەر خۆی مابوو. لە مەودایەکی زۆر نزیکەوە گوێی لە دەنگی چاخیرجالی بوو.

- خۆت بە دەستەوە بدە محەمەد ئەفەنی. چەکەکەت فرێ بدە. ئەگینا دەتکوژم.

محەمەد ئەفەنی بۆ ساتێك بیرێکی لێ کردەوە. جاخۆ هەرچۆنێك بێ، چاخیرجالی هەر دەیکوژێ. هەڵدێرێکی هەزار بە هەزاری لە پشتەوەی بوو،

******* پلخر *******

بەڵام چەندی خەتەریش بێ، باشترە لەوەی یەخسیری بکەوێتە دەست چاخیرجالی. دەسبەجێ خۆی هەڵداشت.

ئەوەندە زوو بزووت، چاخیرجالی واقی وڕ ما. دەرفەتی هیچ جووڵەیەکی نەدانێ. بەسەرسووڕمانەوە گوتی:

- هەی گەوادی گەماڵ باوك. لەبری ئەوەی خۆ بدات بەدەست منەوە، لە هەڵدێرەکەوە خۆی هەڵداشت و مرد. لێی گەڕێن با بتۆپێ.

تووڕە بوو. پێی ناخۆش بوو، نەخشەکەی سەری نەگرت. دەیزانی محەمەد ئەفەنی لەتوپەت بووە. لەمێژ بوو ئەو هەڵدێرەی دەناسی. بە ڕۆژی ڕووناکیش دیتبووی. بەردەڵێن و زەرد و ما بوو. زۆر مەترسیدار بوو. ڕەوەزەکانی تیژ بوون. وەك چەقۆ.

بەڵام محەمەد ئەفەنی نەمردبوو. لەپڕ وەخۆ هاتەوە و زانیی بە جێیەکەوە گیرساوەتەوە. لە درەختێك گیرسابۆوە. هەرچۆنێك بێ، خۆی بەردا. زۆری هەوڵ دا، هەتا خۆی لە چنگی مەرگ قوتار کرد.

لەو شەڕەدا دوو کەس لە هەڤاڵەکانی چاخیرجالی کوژران و دووی دیکەش بریندار ببوون. دەبێ لەوێ دوور بکەونەوە. دەبوو را بکەن. چاخیرجالی بە بریندارەکانی گوت:

- ئێوە هەر لێرە بمێننەوە. لە نێو ئەو گەنمەشامییانەدا خۆ مات بکەن. مەشبزوون. سبەینێ ئەسپتان بۆ دەنێرم بتانهێنن.

- بەڵام ئەفە. دەماندۆزنەوە و دەمانکوژن.

- لێرە بمێننەوە. ئێستا ناتوانین بتانبەین. بەر لەوەی ڕۆژ بێتەوە، ئەسپ سوار دێن و دەتانهێننەوە. بمێننەوە.

## ******* يلخو *******

بریندار بەجیّ مان. چاخیرجالی کەوتە ریّ. ماندوو بوو. شەکەت بوو.
محەمەد ئەفەنی لە هەڵدێرەکە هاتبووە دەریّ و لە قوڵکەیەکدا مات ببوو.
چاوەڕوان بوو. چاوەڕێی ڕۆژبوونەوە بوو. خەوی لیّ نەدەکەوت.
شەوێکی تاریك بوو. ئەستێرە بەجریوەیەکی کز، تاریکییەکەیان دەڕووشاند.
ئەستێرەکان درشت بوون.
لەپڕ سەیری کرد و دیتی، ئەوە چەند کەسێك بەرەو لای دێن. بەسپایی
قسەیان دەکرد. بەلایدا تێپەڕین. پیاوەکانی چاخیرجالی بوون.
کامیان چاخیرجالییە؟ محەمەد ئەفەنی وا هەژابوو دەلەرزی. لە فیشەکێك پتر
پێی نەمابوو. ئای خۆزگە چەند فیشەکێکی دیکەشی پیّ دەبوو. مخابن.
ئەگەر چەند فیشەکێکی دیکەشی پیّ بوایە، دەیتوانی شەڕێکی باش بکا.
خەریك بوون لەسەرخۆ بە بەردەمیدا تێدەپەڕین.
محەمەد ئەفەنی دەستی لە گیانی خۆی بەردا. بەشکم ئەو فیشەکە کاری
خۆی بکا و سەردڵی چاخیرجالی بگریّ. یاخییەکان هەر دووسەد مەترێکی لیّ
دوور بوون. لەوانەیە ئەوەی لە پێش پێشەوەیە، چاخیرجالی بیّ. ئەو پیاوە
و لە هەموو هەلومەرجێکدا وەپێش پیاوەکانی دەکەویّ. سێرەی لیّ گرت و
تەقەی کرد.
چاخیرجالی لەسەرخۆ گوتی:
- پێکرام، هاوڕێیان. گوللەم لیّ درا.
فیشەکە سەر رانی گرتبوو.
گوتی:
- هیچ نییە. دەڕۆین. بەشوێن تەقەکەردا مەگەڕێن. کاتی وەمان نییە.

## ******* پاخر *******

محەمەد ئەفەنی چاوەڕێ بوو، تفەنگچی بگەڕێنەوە و بیکوژن. لە نێو چەند دەوەنێکدا مات ببوو. زۆر نارەحەت بوو.

حاجی مستەفا چاخیرجالیی بەکۆڵدا دا:

ـ لەوانەیە گوللە بەڕێلا بووبێ. ئەگینا کابرا تەقەی دیکەشی دەکرد.

ئەفە پرسیی:

ـ جا دیتوانی؟

ئەو دەیزانی فیشەکە شێتە نەبووە، بەڵام ئەی کێ بوو دەیەویست بیکوژێ؟ زۆری پێ چوو بۆی روون بۆوە.





لە ئۆدەمیش تەواو تەنگیان بە عەلییە رەش هەڵچنیبوو. دەیانویست شوێن و حەشارگەکانی چاخێرجالیی لێ بپرسن و پێی ئاشکرا بکەن.

عەلییە رەش زەردەی لە لێوان نەدەڕەوی. زۆری گوێ نەدەدایە ئەشکەنجەکان. زەردە سیحراوییەکەی لە لێوی نەدەڕەوییەوە:

ـ حەشارگەکان؟ لەخۆمان دەپرسن حەشارگەمان کوێ بوون؟ لە چیا و دەشتن. ماڵی هەر گوندییەك حەشارگەیەکی ئێمەیە. هەموو ماڵەکانی حەشارگەمانن. بۆخۆشتان ئەوەتان لێ روونە.

ـ ماڵی کێ بنکە و حەشارگەی سەرەکیتانە؟

ـ ماڵی هەموو کەس. بە خودایەتیی خودا ماڵی هەموو کەس.

جاروبارە فکر و خەیاڵ هەڵیدەگرن. بەخۆی دەڵێ:

## ******* پاخر *******

ـ ئەی ئەو ئەفەیە چیی لێ هات؟

ئەوجار خۆی قایل دەکا:

ـ ئەم رۆژانە، جەندرمە تەواو تەنگاویان کردووین. ئێمەش جارێ ناچارین لێرە بین، بەڵام هەرچۆنێك بێ، رۆژێك هەر پەیدا دەبێ. دێ و رزگارمان دەکا...

کاتێ ئەوەی هات لە ئەزمیر بیانگوێزنەوە.

عەلییە رەش:

ـ من دەزانم، گیانی من. من دەزانم. دەزانم ئەفە بۆچی ئەوەندەی پێ چوو؟ دەی باشە، خۆ دیارە. چونکە زانیویەتەوە دەمانبەنە ئەزمیر. ئەو ئاگادارە. دەیەوێ هەڵکوتێتە سەر شەمەندەفەرەکە و ئازادمان بکا. ئەوە، هەم سادەترە و هەمیش هەواڵەکەی بەهەموو وڵاتدا بڵاو دەبێتەوە و بەناوبانگترمان دەکا.

رۆژە دیاریکراوەکەش گەیشت. عەلییە رش و هاوڕێکانیان هێنایە وێستگەی شەمەندەفەر. وێستگەکە زۆر قەرەباڵغ بوو. هەموو خەڵکی شارۆچکەکە بۆ دیتنی عەلییە رەش، ئەو تفەنگچییە بەناوبانگەی چاخێرجالی هاتبوونە ئەوێ. شەمەندەفەرەکە هات و راوەستا. عەلییە رەش و دوو هاوڕێی پێکەوە لە کۆت و زنجیر کرابوون. خەڵکەکە کشانەوە و عەلییە رەش و هاوڕێکانی تێپەڕین. عەلییە رەش سەیرێکی خەڵکەکەی کرد. تاوێك چاوی لە چاوی چەند کەسێك بڕی. ئەوجار سەری بەرداوە و فکر هەڵیگرت، بەڵام زۆر زوو سەری هەڵێنا و زەردەیەکی لەخۆباییانەی نیشتەوە لێوی:

## ******* یلخو *******

- من بەسەهموو چووبووم. ئێرە هیچ گونجاو و لەبار نییە. ئەفە نایە لەو قەرەباڵغییەدا ئێمە ئازاد بکا. ئەفە کابرایەکی خاکەڕایە. پیاوی خۆ نواندن و خۆهەڵکێشان نییە.

دۆستەکانی گوێیان نەدەدایێ. هەر بیریان دەکردەوە. تروسکایی هیوا لە نیگایاندا نەمابوو و روخساریان زەرد هەڵگەڕابوو. دەتگوت هەموو بوونەتە سەهۆڵ. هیچ تیشکێکی هیوایان لەچاویدا دیار نەبوو. بەحاڵ زیندوو بوون. دەتگوت جووچکەی سەرمابردوون و خۆ بەیەکترییەوە مەلاس دەدەن. دەستیان شل ببۆوە. عەلییە رەش کە ئاوای دەدیتن، دەهری دەبوو.

شەمەندەفەر رۆیشت. عەلیە ئەفە، رووی کردە هەڤاڵەکانی:

- گوێ بدەنێ بزانن دەڵێم چی. زۆر نابا ئەفەمان دەگاتێ. شەمەندەفەرەکە رادەگرێ و ئازادمان دەکا. ئەوە بۆ وا شەمۆتە دایگرتوون و وەك بێوەژنان تازیەتان داگرتووە.

لەبەر پەنجەرەی شەمەندەفەرەکە راوەستابوو. پانزە جەندرمە دەوریان گرتبوو. لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەوە سەیری دەشتەکەی ئۆدەمیشو شیو و کێوەکانی دەکرد. بوو بە عەسر. خۆر ئاوا بوو، بەڵام عەلییە رەش هەر سەیری دەرەوەی کرد.

چاوەکانی، تاریکییکە دەپشکنن. جاری وایە لە نێو دڵی تاریکییەکەدا، تارمایی رەش رەش دەبینرێن. دڵی توندتر لێ دەدا. شەمەندەفەرەکە بەرەو پێش دەکشێ و تارمایی جێ دەمێنێ. عەلییە ئەفە دەزانێ ئەو تارماییە ئەفە نەبووە. لەوانەیە دەوەنێك بووبێ...

## ******* پلخو *******

وەختایەك شەمەندەفەرەکە شل دەبێتەوە. جا ئێستا بە دڵنیاییەوە نەڕەی سامناکی چاخیرجالی دەبیسرێ. بەسەر جەندرماندا دەنەڕێنێ:

- هەی بێ غیرەتینە، نامەردینە...

جا دەڵێ:

- عەلی ئەفە، دۆستی من، عەلی ئەفە.

بەڵام شەمەندەفەرەکە دیسان دەکەوێتەوە رێ.

عەلییە رەش لە هەموو جێیەکدا چاخیرجالیی دەدی، بەڵام شەمەندەفەر گەیشتە ئەزمیر و لە وێستگەی "باسمانێ" راوەستا.

عەلیە رەش ئاوڕی لە برادەرەکانی دایەوە:

- تۆزقاڵێکیش مەترسن. هیچ بێهیوا مەبن. مەڵێن ئەفە نەهات. ئەفە لە چنگ جەندرمان رەزگارمان ناکا. چەند گرفتاریش بێ، هەر دێ. کێ چووزانێ ئەفە چ نەخشەیەکی لە زەینی دایە. چ خەت و نیشانێکی کێشاوە! بێ خەم بن. ئەفە بەتەنیامان بەجێ ناهێڵێ. لێناگەڕێ دیلی دەستی عوسمانی بین، ئێمە...

کە سەیری قەڵافەت و رواڵەتی برادەرەکانی کرد، هەموو بێ هیوا، هەموو شڵەژاو... توورە بوو. ئامۆژگاریی کردن. لۆمەی کردن:

- یەکێك بێهیوا دەبێ، ئەفەی جوان نەناسیبێ. کێ چووزانێ ئەفە پیاوێکی چۆنە. لەگەڵ ئێوەمە برادەرینە. ئەگەر لە شوێنێك بەندمان بکەن، کە تەنانەت تەیری ئاسمان و ماری بن عەرزیش رێی تێنەبا، دیسانیش ئەفە هەر دێ و دەماندۆزێتەوە. ئازادمان دەکا. هیچ خراپ بیر مەکەنەوە. پێ بکەن، دڵتان خۆش بکەن.

## ******* پاشڕۆ *******

کە عەلی ئەفە ئاوا قسەی دەکرد، بۆ ساتێك تروسکاییەکی هیوای لە روخساری برادەرەکانیدا دیت، بەڵام دوای چەند دەقەیەك لە ئەنگوستەچاوی بێهیواییدا بزر دەبوون.

دەیانخەنە زیندانەوە، بەڵام عەلییە رەش هەر مێشێکیشی لێ میوان نییە. هەر دەڵێی لە زیندانیش نەکراوە. دەڵێی هاتووەتە سەر شایی. دڵی خۆشە و زەردەی لە لێوی ناڕەوێ. دۆست و برادەرە کۆنەکانی خۆی دۆزیوەتەوە و خەریکی سوعبەت و جەفەنگە.

ڕۆژی دادگایی گەیشت. خەڵك هاتنە سەیریان. دەیانویست قارەمانەکە لە نزیکەوە ببینن. ئەوە نزیکترین و رەشیدترین هاوڕێی چاخیرجالییە. ئەو پیاوەی بەتاقی تەنێ ریزی چوارهەزاری کەسیی جەندرمەکانی شکاندبوو و لە گەمارۆ هاتبووە دەرێ. ئەو پیاوەی گەلێ ئازایەتیی نواندبوو.

تەنانەت حەوشەکەی دادگاش پڕ بوو لە حەشیمەت. لەوەتەی ئەزمیر بوو، ئەوەندەی خەڵك بەخۆوە نەدیتبوو.

دادگاییەکە دەستی پێ کرد:

- لە فلانە گوند، تۆ فلانە ئاغات تالان کرد؟

- بەڵێ، من بووم.

- باسی کوشتنی هەژدە کەسەکە بکە. کێ کوشتنی؟

- خۆم کوشتمن.

عەلییە رەش لە سەرەوە سەیری دادوەری دەکرد و بزەی دەهاتێ.

سێدارەیان بۆ بڕییەوە.

## ******* پلخو *******

کە ئاگاداریان کردنەوە، سێدارەکەیان مسۆگەرە، هاورێکانی زەندەقیان چوو. ئەژنۆیان لەرزی. یەکێکیان لەخۆ چوو و بەلادا هات. یەکی دیکەیان رەنگی بە روویەوە نەما و دانیشت و بەکوڵ گریا، بەڵام عەلییە رەش پێدەکەنی. کە هاتنە حەوشەی دادگا، عەلییە رەش بە دەنگێک، کە تۆزێکیش چییە نەدەلەرزی گوتی:

ـ ئەو پەنجەیەی قانوون دەیبڕێ، ژان ناکا. هەر بژین. چاوێکیشی لە برادەرەکانی داگرت، بەڵام کە دیتنی وەزعیان شڕە، تێك چوو:

ـ بەسە، بۆ دەڵێی پیرەژنی مێرد مردوون. چارەنووسمان هەر شتێك بێ، بڕاوەتەوە. پیاوبن پیاو. تێگەیشتن؟

عەلییە رەش و هاورێکانی لە ئۆدەمیش بە داردا دەکەن بۆ ئەوەی ببنە پەندی عالەمێ. نیوە شەوێ بوو، حوکمدراوەکانیان سواری شەمەندەفەر کرد و بەرەو ئۆدەمیشیان بردن. لەو کاتەوەی وێستگەی ئەزمیریان بەجێ هێشت، عەلییە رەش دەستی کرد بە چڕینی گۆرانییەکی شادی پاڵەوانی. ئەگەر فارگۆنەکە ئەوەندە تەسك نەدەبوو و ئەگەر جەندرمە لێی گەڕابایەن، حەزی لێ بوو دەورێکیش چۆپی بکێشێ. وا هەڵپەڕێ هەموو دونیا بڵێن ماشەڵڵا.

شەمەندەفەر گەیشتە ئۆدەمیش. وێستگەکە زۆر قەرەباڵغ بوو. دەرزییت هەڵاویشتبایە، وەعەرزی نەدەکەوتەوە. خەڵك لە دێهاتی دوور و نزیکەوە هاتبوون. چیی خەڵکی ئۆدەمیش و دەوروپشتە، هەواڵەکەیان بیستبۆوەو هاتبوونە سەیرکردن.

کە لە شەمەندەفەرەکە دادەبزی، ورد ورد چاوی بەنێو خەڵکەکەدا دەگێڕا. دیسانیش بە شوێن ئەفەیدا دەگەڕا... بە جلوبەرگی فەقێیانەوە، سۆل لەپێ

و عابا بە کۆڵەوە... ئەی کوانیٚ؟ لەکوێیە ئەفە؟ کورە ئەو ئەفەیە هەر کات بەفیڕۆ دەدا. چما نازانیٚ نەیدەتوانیٚ لە تاریکایی شەوەکەدا ئەو ئاسنە رێیانە هەڵکەنیٚ و شەمەندەفەرەکە راگریٚ؟ لەو قەرەباڵغییەدا، لە شوێنێکەوە دەرکەویٚ و ئەو لە چنگی جەندرمان ئازاد بکا و بڵیٚ:

- وەرە عەلی ئەفە، شوێنی تۆ بەندیخانە نییە. تۆ هەڵۆی کەژ و چیای. نەیدەتوانی بیٚ؟ نەیدەتوانی وا بڵیٚ؟ ئەی لە کوێیە؟

بە سمێڵی بادراو و چاوە رەش و درشتەکانی و بە دەموچاوە ئەسمەرەکەیەوە، زەردەیەکی بۆ برادەرەکانی کرد و سەیرێکی حەشیمەتەکەی کرد. جەندرمەیەکی زۆر لەویٚ بوون. سەیری ئەوانیشی کرد. بەوانیش پێکەنی.

لە پڕ فکرێکی بە زەینیدا هات. لەوانەشە ئەفە هەر نەیە. ئەگەر نەهات چار چییە؟ بەڵام زۆر زوو ئەو خەیاڵەی لەخۆی دوور خستەوە. شەرمی لەخۆی کرد. چما دەکریٚ ئەفە نەیە؟ ئەفە لە دەرفەتێك دەگەڕیٚ. ئەفە کارێك دەکا، ئەوەی لەوێیە، هەموو سەریان سووڕ بمێنیٚ و پێیان بە عەرزییەوە وشك بیٚ.

لە زیندانەکەی ئۆدەمیش سەیرێکی هەڤاڵەکانی کرد و سەرێکی بادا:

- تۆخوا بنیادەم ئەوەندە ترسنۆك دەبیٚ؟ ئەوە بەگیانی ناخێرتان ئێوە یاخین؟ ئەفە دیٚ. ئەی لە مەسەلەکەی "عوسمانە چکۆڵ"دا چۆن خۆی گەیاندیٚ؟ دیسان پەیدا دەبیٚ. ئەگەر عوسمانی هەموو سوپاکەشی کۆ بکاتەوە، دیسانیش ناتوانیٚ ئێمە لێرە راگریٚ. ئەگەر ئۆدەمیش پڕ پڕیش بیٚ لە جەندرمە، دیسان ئەفە دڕیان پیٚ دەدا و ئێمە ئازاد دەکا. یانی ئێوە ئەفە ناناسن؟ پیٚ بکەنن، سەما بکەن. دەتانەوی تاکەی خەفەتی لیٚ بخۆن؟

## ******* پلخر *******

عوسمانی نامەردیی کرد. ئەفە مشووریان دەخوا. بەو جۆرە وەك هەتیوان لە گۆشەیەك کرووشمە مەکەن.

بە سەرێکی بەرز و دڵی پڕ لە هیواوە، ماوەی زیندانەکەی بردە سەر. هەر دەتگوت لە زیندانیش نەکراوە، بگرە میوانێکە و لە کۆشکێکی بە شکۆدا. بەوپەڕی سەربەرزییەوە، بە زیندانێدا دەگەڕا و سمێڵی بادەدا.

سەرلەبەیانیی رۆژێکیان، بەر لە تاوهەڵاتنێ، لە ژوورەکەی هێنایانە دەرێ. زانیی دەیبەن لە داری بدەن. بە زەردەخەنەوە گوتی:

- بە پەت؟

وەڵامیان نەداوە.

بیری کردەوە.

- ئەفە بیستوویەتەوە. ئێستا بە رێگاوەیە. دێ و بەرمان دەدا. جەندرمان راو دەنێ. بەخوای سەیری خۆش دەبێ.

بە کۆڵانەکانی ئۆدەمیشدا کە بەرەو مەیدانەکە دەچوون، لە پێچ و گەوی هەموو کۆڵانێکدا و لە پشت هەر درەختێکەوە، چاوی لە ئەفە دەگێڕا. هەموو سێبەرێکی لێ ببووە ئەفە، بەڵام ئەفە دیار نەبوو.

گەیشتە بن پەتی سێدارە. سەیرێکی پەتە چەورکراوەکە و سەیرێکی حەشیمەتەکەشی کرد و زەردەیەکی هاتێ. سەری قیتتر راگرت و سینگی دەرپەڕاند. ئەفە پەیدا دەبێ.

چوارپێچکەیان لە بن پێی نا. توند و قایم لە سەری راوەستا. چاوێکی بەنێو خەڵکەکەدا گێڕا.

- ئاخرین قسەت؟ وسیەتت؟

وەڵامی نەداوە. شێلگیرانە سەیری چیاکان و خەڵکەکە و پەتەکەی دەکرد. چەند خولەك تێپەڕین. ئەفە هەر نەهات. زەردەخەنەکەی بەسەر لێووە بوو بە سەهۆڵ. ئاورێکی لە پەتی سێدارەکە دایەوە. لێوەکانی جووڵەیەکیان کرد:

ـ سەیرە. ئەفە بۆ ئەوەندەی پێ چوو؟

ئیتر سەری بردە نێو قڵفەی پەتەکەوە.

***

گەیشتنە کێڵگەیەکی گەنمە شامی. شەو خشەخشی دەهات. شەو خەریك بوو غەڵبەغەڵبێکی وەڕێ دەخست. ترووسکاییەك لەهیچ کوێوە دیار نەبوو. گەڵاکان دەبزووتن و دەنگی کپیان لێ هەڵدەستا. وەك خشەخشی کاغەز. بێ و نەیێ لەو دوور دوورانەوە کانییەکی لێیە. دەنگی بەحاڵ دەبیسترا. هێشتا کاتێکی زۆر رانەبردووە. تاوێکی دی ئێرە دەتگوت جەهەندەمە. تەقە و ویزەی فیشەك گوێی کەڕ دەکرد. چاخیرجالی پێکرابوو. فیشەکەکە لە کەلەکەیدا گیری خواردبوو. وردە وردە هەستی بە ژانەکەی دەکرد. تا دەهات، برینەکەی ساردتر دەبۆوە و ئازارەکەشی پتر دەبوو. حاجی بانگی کرد:

ـ ئەفەم. دەنگی دەلەرزی. دیار بوو زۆر ترساوە. ئەفە تێگەیشت:

ـ گرنگ نییە حاجی. یەکێکی خۆی بە پیاو بزانێ، دەبێ خۆی بۆ هەموو رووداوێك هەڵگرێ. یەکەم جاری بوو بریندار دەبوو. یەکەم جاری بوو ژانی برینێکی دەچێشت:

## ******* یاخو *******

- با خێراتر بڕۆین. دەبێ خێراتر بڕۆین. بەر لە تاوهەڵات دەبێ بگەینە چیا و شوێنمان ون بکەین. دوژمنەکە زۆر خەتەرناکە.

هەوڵی دا خێراتر بڕوات. هەر بڕێکی توانی. ددانی لێك توند دەکرد و هەنگاوی دەنا، بەڵام ئیتر نەیتوانی. راوەستا پشوویەك بدا. حاجیی زانیی وەزعی شڕە:

- ئەفەم، ئەگەر ئیزن بدەی، دەمەوێ لەکۆڵت بکەم.

ئەفە وەڵامی نەداوە. حاجی هاتە پێشێ و ئەو هەڤاڵە هەرە کۆنەی لەکۆڵ کرد. کەوتنە رێ. حاجی لاقی کەوتبوونە ژان. دەستیشی سڕ ببوون. چیی نەمابوو بەلادابێ و ئەفەش بەکوشت بدا، بەڵام ئاخرییەکەی توانییان بگەنە چیا. خەریك بوو تاو دەکەوت، کە خۆیان گەیاندە شاخ.

ئەفە:

- شوکر. هەزار و هەزار جار شوکر... بەو رۆژەشت...

لەو نێوەدا عێلاتییەکانی ئاگادار بوونەوە. خەریك بوون بەرەو دەشتێ دادەگەڕان، کە بیستیانەوە ئەفەیان بریندارە. بە کوڵ و داخەوە بۆی گریان. نەشتەرگەری رەوەند هاتن. یەك و دووان نەبوون. زۆر بوون. گەنجەکان برانکاردیان دروست کرد. خێرا بە سواری کەوتنە رێ و ئەفەیان گەیاندە یەکەم رەشماڵ. لەوێش دەست کرا بە داوودەرمانی. دەرمانی خۆماڵییان بۆ هێنا. ئەو دەرمانانەی بۆنی هەزاران ساڵ شارستانییەتی مرۆییان لێوە دەهات. مەلحەمی هەزار و یەك گوڵی کوێستانیان لە برینەکەی دا. ژانەکەی کەمتر بۆوە. یەك دوو سەعات چاوی لێك نا. دوایی بەسپایی پێڵووی هەڵێنان. بانگی حاجیی کرد. حاجی هات و لە ژوور سەری دانیشت.

## ******* پلخو *******

ـ دەزانی بیر لە چی دەکەمەوە حاجی؟

دەموچاوی تروسکایی ژیانی تێکەڕابوو. زۆر بە چێژەوە بزەی دەهاتێ. دەتگوت منداڵێکی بەختەوەرە.

ـ نەخێر، ئەفەم.

ـ هەندێ کەس دەڵێن بنیادەم شیری خاوی خواردووە و بۆ متمانەی نابێ، بەڵام ئەو قسانە پڕوپووچن. زۆر باشیش، دەکرێ متمانەی پێ بکەی و پشتی پێ بسپێری. دەبێ متمانە بە ئینسان بکەی. هەر ئەوەندەی تۆزێ چاکەیان لەگەڵ بکە. ئەو کات دەبێتە خۆشەویستیان. وا نییە حاجی؟

حاجی بیری کردەوە.

ئەفە:

زۆریش راستە حاجی. من ئیمانم بە ئنیسانییەتی ئنیسانەکان هەیە.

ئەفە تەخت خەوت. نەشتەرگەری رەوەندان وەك پەپوولە لە دەوری دەخولانەوە. دەتگوت لەگەڵ یەکتری کێبڕکێیانە. هەموو توانا و لێوەشاوەیی خۆیان خستە گەڕ. لە هەموو جۆرە دەرمانێکی گیاییان لەوێ خڕ کردەوە. مەڵحەمەکان خەریك بوو کاریان تێ دەکرد. برینەکان سارێژ دەبوونەوە.

هەر جارێکی چاوی هەڵدێنان، لە عەلییەرەشی دەپرسی. هەموو جاێکیش دڵنیایان دەکردەوە، کە عەلییە رەش لە بەندیخانەکەی ئۆدەمیشە. ئیدی پێیان نەگوت لەوێوە بردوویانەتە ئەزمیر. پێیان گوتبا، بەو جەستە بریندارەیەوە دەکەوتە رێ، شەمەندەفەرەکەی لەناو دەبرد و هاوڕێیەکانی رزگار دەکرد.

## ******* پلخو *******

- ئێستا عەلی لە کوێیە؟ هیچ لێی ئاگادارن؟

- لە بەندیخانەی ئۆدەمیشە ئەفەم.

- باشە. هەر برینەکەم چاك بێتەوە، دەکەوینە رێ. هێرش دەکەینە سەر ئۆدەمیش و عەلی رزگار دەکەین. عوسمانی نامەردیی لەگەڵ عەلی کرد. ئەوەیان لەبەر من کرد.

رۆژێکیان، یەکێك هات و حاجیی بانگ کردە دەرەوەی خێوەتەکە:

- حاجی ئەفە، دوو رۆژی دیکە دەیانەوێ عەلییە رەش لە دار بدەن. بەگ پێی گوتین سڵاوم بگەیەنە بە چاخیرجالی مەمەد ئەفە و پێی بڵێن بێ و هاورێیەکەی رزگار بکا. دوو رۆژی دیکە لە گۆڕەپانەکەی...

پەیامەکەی کە گەیان، گەڕاوە و رۆیشت.

حاجی بیری کردەوە. ئاخۆ ئەو مەسەلەیە بە ئەفە بڵێ یان نا؟ ئەگەر بیلێ... ئەفە بریندارە. بێت و ببزوێ، خراپتر دەبێ و ئیتر هەمووان تێدا دەچن، بەلام ئاخر نامەردییش دەبێ لە هەقی عەلییە رەشدا. خودا هەڵناگرێ هاورێیەکی باشە. رەشیدە. مەردە...

حاجی دوو رۆژان کپ و بێدەنگ بوو. حاجیی دڵڕەق، حاجیی پیاوکوژ دوو شەو و رۆژان خەمی خوارد. خەوی لێ نەکەوت. خەو و خۆراکی لەبیر چۆوە. متەقی لێوە نەهات. لە گۆشەیەك هەڵکورمابوو و نەدەبزووت. چەند جاران بڕیاری دا، هەموو شتێك بە ئەفە بڵێ، بەلام نەیتوانی. جارێکیشیان لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە، کە بەبێ ئەوەی بە ئەفە بڵێ، تفەنگچییەکانی هەڵگرێ و هێرش بەرێتە سەر ئۆدەمیش و عەلییە رەش ئازاد بکا، بەلام

## ******* یاخی *******

نەیوێرا. بەبێ ئیزنی ئەفە نەدەکرا کاری وا بکا. دوو ڕۆژ تێپەڕی، بەبێ ئەوەی بڕیارێکی پێ بدرێت و ساغ بێتەوە.

حاجی:

- ئەی هاوار بەماڵم. نامەردیمان کرد و هاوڕێیەکی ئازیزمان لەدەست دا. دوانیوەڕۆ بوو، کە سوارێك هات و هەواڵی زۆر دڵتەزێنی هێنا. ئەفە چاك بۆوە. هەر توانیی خۆ بەسەر پێیانەوە بگرێ، گوتی:

- زوو بن. ئامادە بن. دەبێ هەڵکوتینە سەر ئۆدەمیش و عەلییە رەش رزگار بکەین.

کەس وەڵامی نەداوە.

- بۆ بێدەنگن؟

دیسان کەس هیچی نەگوت.

- یەکێکتان قسە بکەن با بزانم عەلیی چیی لێ هاتووە؟

دیسان بێدەنگی.

- حاجی.

فەرموو ئەفەم.

- عەلییان لە دار داوە. وایە؟

حاجی سەری داخست.

- ئەو کارەت نامەردی بوو حاجی. تۆ نامەردییەکی گەورەت کرد. تەنانەت ئەگەر من لەسەرەمەرگیشدا بوایەم، دەبوو ئاگادارم بکەیەوە. هاوڕێکەم تێدا چوو حاجی. عەلییە رەش هەرگیز ئەو چاوەڕوانییەی لە من نەبوو. پشتم شکا حاجی. ئیتر ناتوانم ببمەوە بە مەمەدەکەی جاران. هەستن وەڕێ کەون.

## ******* پڵنگ *******

ئەفە لە پێش هەمووانەوە دەڕۆیشت. زۆر توند دەڕۆیشت. دەیەویست بچێتە کوێ؟ کەس نەیدەزانی دەچێتە کوێ. نیوەڕۆ داهات. هێشتا هەر دەڕۆیی. تەنانەت بۆ جارێکیش چییە ئاوڕی نەداوە. بوو بە عەسر. خۆر ئاوا بوو. تاریکی بەسەر هەموو وڵاتدا زاڵ بوو، بەڵام ئەفە دەڕۆیشت. هەر وا بەخێرایی و تووڕە ڕێی دەبڕی. هاوڕێکانی برسییان بوو. ماندوو ببوون بەڵام نەیاندەوێرا قسە بکەن. ئەفە تووڕە بوو. لەو حاڵەدا لەوانە بوو دەست بۆ هەموو کارێك بەرێ. لەو حاڵەدا دەیتوانی هەزار کەس لە چاوتروووکانێکدا بکوژێ. دەیان گوند بسووتێنێ. مەڵبەندێك بکاتە کۆی زووخاڵ. زۆر جاران تووڕەییەکەیان دیتبوو، بەڵام ئەمجارە جیاواز بوو.

گەیشتنە بەردەڵێنێك، بەڵام ئەفە هەر وا خێرا دەڕۆیشت. دەتگوت بە ڕێگەیەکی لێك و راستدا دەڕوا. گران و سەنگین بوو. دەتگوت ڕەوەزە. هەیبەتی چیایەکی هەبوو. دەتگوت پڵنگێکی مەغرووری کەژ و کۆیە و بەسەر عەرزیدا دەڕوات.

ئەوانی دواوە سرتوخورتیان بوو، بەڵام هەراشیان کردبایە ئەفە نەیدەبیست.

- کوڕە مردین ئەوەندەی بەشوێنیدا غار بدەین. باشە چ بکەین؟

- دەبێ بەخۆی بڵێین.

- گوێ ناگرێ. ناچارین بەدوویدا غار بدەین. گوێ ناداتێ...

بە سەر گابەردە تیژەکاندا پەڕینەوە و گەیشتنە زەوییەکی هەموار و ڕێك. لە رووبارێکیان دا. تفەنگچی راوەستان. هەموو خۆیان فڕێ دا و بە هەڵپە کەوتنە ئاوخواردنەوە. کە ئەوان خەریکی ئاوخواردنەوە بوون، ئەفە هەر وا

## ******* پلخو *******

بێ راوەستان دەڕۆیی. ئێستا ئیتر مەوداکە پتر ببوو. دەمیان لە ئاوەکە کردەوە و بە شوێنیدا غاریان دا.

تاو هەڵات. سێبەرەکەیان بە سەر دەشتەکەدا کشا. دەشتەکە کاکی بە کاکی بوو. تا چاو هەتەری دەکرد، شوێنەواری ئاوەدانی دیار نەبوو. دەتگوت خاك وخۆڵەکەی مشتومالّ دراوە. رێك و ترووسکەدار بوو. پۆل پۆل گیای سەوزیش...

خۆر بڵند بوو. ئەفە دەتگوت باڵی گرتووە. زۆر خێرا دەڕۆیی. هاوڕێکانی بەجێ مابوون. مەودایان زۆر بوو. ئاوا نەیدەگەیشتنێ. زۆری نەبرد، لە چاویان ون بوو. دەشت خەتەرە. ئەگەر لەو دەشتە بێ برانەوەیەدا گەمارۆ بدرێن، چ دەقەومێ؟ تفەنگچیی چاخیرجالی، خۆت بۆ مەرگ ئامادە بکە.

حاجی خۆی بۆ هەموو مەترسییەك ئامادە کرد و بە دوای ئەفەدا غاری دا. دەترسا. لەوانەبوو لەو حاڵەدا ئەفە هەموو شتێك بکا. ئەگەر دایك، ژن یان منداڵەکەی خۆشی ویستبای پێشی بگرێ، لەوانە بوو بکوژرێ. حاجی خۆی بۆ مەرگ ئامادە کردبوو. رای کرد و لەسەرخۆ پیلی راستی ئەفەی گرت.

ـ تاوێ راوەستە ئەفە. تکا دەکەم.

ئەفە راوەستا و ئاوڕی لە حاجی دایەوە. قەڵافەتێکی زۆر سامناکی هەبوو. چاوی بەقووڵدا چووبوون. رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو و نێوچاوانی پڕ ببوون لە چرچ و لۆچ. یەك دوو هەنگاوی دیکەشی نا و دیسان راوەستا.

ـ دەنگ و باس حاجی؟ دەتەوێ چ بڵێی؟ زوو بە بڵێ بزانم.

ـ ئەفەم سەری سلامەت بێ. دەچینە کوێ؟ ئیزن بدە تاوێك دانیشین ئەفە. کوڕەکان زۆر دوا کەوتبوون. ئیزن بدە با چاوەڕێیان بین.

******* پلخو ******

راوەستان و چاوەڕێی هاورێ کاینان بوو. تفەنگچی هاتن و گەیشتنێ. حـاجی لەسەرخۆ و وەك پاڕانەوە پرسیی:

- ئیزن دەدەی پشوویەك بدەین ئەفە؟

- ئەفە وەڵامی نەداوە.

- تۆزێك بحەسێینەوە ئەفـە. کوڕەکـان برسییانە. ئیـزن بـدە نانێـك بخـۆن و تۆزێك بحەسێنەوە.

دووپاتەی کردەوە:

- پاروەوە نانێك بخۆین.

دانیشتن.

تەم و مژێك خەریك بوو لە دەشتەکەوە هەڵدەستا.

ئەفـە وردە وردە نێوچـاوانی کرایـەوە. چـاوی وەك پێشـوویان لـێ هاتـەوە. وەخۆی هاتەوە:

- حاجی، کە عەلییان لە دار دەدا، ئـاخرین قسـەی چ بـوو؟ کـێ دەزانـێ؟... باشە نەیگوت ئەفە نامەردیی لەگەڵ کردم؟

- عەلی پیاوێك نەبوو قسەی وا بکا. عـەلی مـەرد بـوو ئەفـە. کـەس ئەوەنـدە رەشید نەبوو. دڵنیام بیستوویەتەوە ئێمـەش چـیمان بەسـەر هـاتووە. عـەلی پیاوێك نەبوو خراپەی تۆ بڵێ.

سفرەیان راخست. ئەفە هەر پارووەکی هەڵگرت. تۆزێکی جووی، بـەڵام پێـی قووت نەدرا، تفی کردەوە.



# ٢٥



هەتا "قۆنییە" چوون. سەرانسەری دەشتەکەی قۆنیەیان بڕی و گەیشتنە ئەرمەنەق. لەوێ بوونە میوانی ڕەوەندەکانی ئەرمەنەق. لێرە دەیانتوانی مانگێکیش بمێننەوە. ئەفە ناڕەحەت بوو. هێشتا ئەو ڕەوەندانەی تاقی نەکردبۆوە. نەیاندەتوانی بزانن بایی چەندە، چونکە ئاگایان لە پیاوەتییەکانی نەبوو. ئەو هەر لە دوورەوە ئەفەیان دەناسی. لێرەش بەگوێرەی پێویست دۆست و حەشارگە و سیخوڕی نەبوو. ئەگەر حکوومەت پێی زانیباوە، دەیتوانی بیگرێ. دەکرا پەنا بۆ کوێ بەرێ، یان بەرەو کوێ ڕا بکا؟ بەڵام خودا هەڵناگرێ عێلاتییەکان وەك شا میوانداریيان لێ کرد. چیی دەیەویست دەمودەست لەبەردەمیان دادەنا و زۆر شتیان بۆ دێنا کە هێشتا

# ******* یاخی *******

داواشی نەکردبوو. دیار نەبوو لێی دەترسن یان هەر بە راستی خۆشیان دەویست. عێلاتی خەڵکێکی میوانگر بوون.

هەرچۆنێك بێ، ئێرە بۆ وی جێی مەترسی بوو. هەرچۆنێکی بێ دەچۆوە کوێستان و کێوپارەی خۆی. لەوێ پتر لە سەد گوندی لێ بوو کە هەر هەموو ئامادەبوون خۆی بە قوربانی بکەن.

تاقمەکانی راوەدوونان، دوو مانگی رەبەق هەر بە شوێنی کەوتبوون و شەکەت ببوون. ئیتر حەزیان لێ نەبوو بەدوای بکەون. وەك پێشوو خێرا نەبوون.

هەر کارە و کاتی خۆی. کە گەرماوگەرم دەستکەوتت نەبوو، ئیتر کەفوکوڵەکەت نامێنێ و ماندوو دەبی لەوەی بەردەوام بی.

رۆژێکیان لای عەسرێ، لە چیاکانی ئەرمەنەقەوە کەوتنە رێ. وەرزی کۆچ و کۆچباری عێلاتی و رەوەندان بوو و ئەوانیش لەگەڵ رەوەندەکان کەوتنە رێ. جلوبەرگی رەوەندانیان لەبەر کرد و تفەنگیان لە نێو باری وشتراندا شاردبۆوە. خۆشیان بە سواری ئەسپ دەرۆیشتن. رەوەند لەگەڵ خێزانەکەیان بوون. چاخێرجالی پارەیەکی زۆری دابوونێ بۆ ئەوەی لەگەڵی برۆن. ئەوەندەی دابوونێ، تا مردن بۆیان پەیدا نەدەبوو.

بیست رۆژێکی خایاند هەتا کاروانی عێلاتیەکان مەودای نێوان ئەرمەنەق و باباداغیی بری. لەوێش بوو بە میوانی تایفەیەکی رەوەندی دیکە. لە هەموو لایەکی راسپارد. سیخورِ و دۆست و برادەری کۆن هاتن و چیی قەومابوو یەك بە یەك بۆیان گێرایەوە.

## ******* پلخو *******

هەواڵی گەڕانەوەی چاخێرجالی ئەوەندەی یەك و دوو بەهەموو لادا بڵاو بۆوە. خەڵکی دێهاتەکانی دەشتێ، گوندەکانی چیا و کێوپارە و عێلاتی هەر هەموو بیستیانەوە. دڵیان خۆش بوو. لەوەتەی چاخێرحالی رۆیشتبوو، دەتگوت باڵێکیان شکاوە.

لەو ماوەیەدا ئاغا و دەرەبەگ و خوونکاران دیسان قیت ببوونەوە. دیسان گوندییان لە فەلاقە دەکردەوە و لێیان دەدان. پێشتر چاخێرحالی لەسەر ئاغاکانی دەکرد، پرد بۆ رووبارەکان دروست بکەن، بەڵام لەگەڵ بزربوونی ئەو، پردەکان بە نیوەچڵی مابوونەوە. رێگەکان تێك چووبوون.

چاخێرجالی دیتی خەڵکەکە شڵەژاون. ئەوان زراویان لە ئاغاکان چوبوو و ئیتر وەك جاران لەخۆیان رانەدەدی. گوندی هەژار و سەرلێشێواو بوون. چاخێرحالی خەفەت دایگرت. چاوی پڕ بوو لە فرمێسك. کەواتە ئەو خەڵکە پێویستیان بە چاخێرجالی هەبوو. هەر وەك چۆن چاخێرجالی پێویستی بە خەڵکەکەی بوو. کە ئەو لەوێ نەبوو، ئاغا و دەرەبەگ خوا بزانێ چییان لەو خەڵکە نەکردبوو.

دێهاتی دەوریان گرتبوو و باسی دەرد و مەینەتییەکانی خۆیانیان دەگێڕاوە. باسی ئەو زوڵم و زۆرەی دیتبوویان. دەکرووزانەوەوە و سکاڵایان بوو.

پیرەپیاوێك هات و بە چاوی بەگریانەوە دەستی چاخێرجالیی گرت:

- ئیتر بەجێمان مەهێڵە کوڕم. جارێکی دیکە لێمان دوور مەکەوە. خودا سێبەرت لەسەرمان هەڵنەگرێ. کە تۆ رۆیشتی، ئاغاوات بووژانەوە. چۆکیان لەسەر سینگمان دادا. عوسمانی بەسەرماندا زاڵ بوو. ناهەقییان کرد کوڕم.

مالوێرانیان کردین. که تۆ رۆیشتی، چۆلەکەمان لێ بوونه باز و هەلۆ. ئیتر بەجێمان مەهێلە کورم. بەتەنێمان بەجێ مەهێلەوە.

ئەوجار کەوتنە گلەیی و سکالا. فلانە ئاغا وای لە من کرد... ئەویتر بەراتی نەداینێ... ئەو ڕێگایە خراپ بووە... ئەو پردە ئاو بردوویەتی و ئەرباب خۆی تێ ناگەیەنێ.

دەرد و ئازارەکە یەك و دووان نەبوو.

ڕووبارەکەی "چەمە سپی" لە نێوان "بوزدۆغان" و "نازیللی"دا هەستابوو و پردەکەی بردبوو. ئەو پردە زۆر گەورە بوو. پردێك بوو خەلکی دەیان گوندی بەسەردا دەپەڕینەوە.

- که پردەکه تێك چوو، بۆچی هیچتان نەکرد؟

- چیمان پێ دەکرا ئەفە؟ دەلیایەکی* پارە دەوێ. خۆ ئێمە ئاغا نین. بەگ نین. خۆت دەزانی ئێمە هەژارین.

- بەلام لەو دەوروبەرانە عوسمان بەگێکی لێیە. چما ئەو ئاگای لێ نەبوو؟

- پێمان گوت ئەفە.

- دەی؟

- گوتی بەمن چی. من کارم پێی نییە.

- باشه. جا ئێستا بزانن دەلێم چی. بچنە لای و سلاوی منی پێ بگەیەنن و پێی بلێن پردێکی نوێ لێ بداتەوە.

گوندی چوونە لای عوسمان بەگ. دەبوو پردێکی تازە دروست بکاتەوە. عوسمان بەگیان لە ئاردپاز و لە مالەکەی خۆیدا دۆزییەوە. لەگەل براکەی

---

*دلیایەك: دەریایەك. بە دەربڕینی ئاخافتنی ڕۆژانە

بوو. دێهاتی باسی مەسەلەکەیان بۆ کرد. عوسمان بەگ بێدەنگ بوو. نە گوتی باش و نە گوتیشی نا، بەڵام براکەی جنێوی بەچاخێرجالی دا. قسەی سارد و سووکی پێ گوت. پارێزگارێکی چەرکەزییش لەوێ بوو. ئەویش زۆری جنێو دا. دێهاتی هاتنەوە و هەموویان بۆ چاخێرجالی گێڕاوە.

ـ ئێوە برۆن خەمتان نەبێ. پردی چەمە سپی چاك دەکرێتەوە.

خۆی ئامادە کرد. دەبوو عوسمان بەگ تەمبێ بکا. ئەو عوسمان بەگە، لە دەرەبەگە کۆنەکان بوو. پیاوێکی چاوقایم بوو. بەرپرسەکانی ناوچە هەموو رێزیان دەگرت. زۆر زۆریش دەوڵەمەند بوو. باوکیشی زۆر جاران بەڵای ئەفەکانی بەسەردا نازڵ ببوو. هەر بۆیەش برجێکی پاسەوانیی بەرز و قایمیان لە تەنیشت ماڵەکەی بۆ دروست کردبوو. ئەو برجی پاسەوانییە زۆر ئەفە و تفەنگچیی دیتبوو. هەر لە پشت ئەو برجەشەوە بوو، براکەی عوسمان بەگ دەیتوانی خۆی بەپیاو بزانێ و هەڕوگیف لێ بدا. کە یەکێك دەچووە نێو برجەکەوە، ئەفەی چی، هۆردوویەکیش دەرقەتی نەدەهات.

ئەفە سیخوڕی بە هەموو لادا بڵاو کردەوە، بەڵام زۆری پێ چوو و هیچ سەروسۆراغێك نەبوو. چاخێرحالی تووڕە بوو:

ـ هەستن. دەبێ بچینە ئارپاز.

رۆژێك نیوەڕۆ بوو، کە هاتنە ئارپاز. هەڵیانکوتای سەر ماڵەکەی عوسمان بەگ. ماڵەکەی پاسەوانی هەبوو. پاسەوانەکە، تفەنگچییەکی ئەلبانیایی بوو. لە پێشدا ئەویان کوشت. عوسمان بەگ لەگەڵ براکەی رایان کردبووە شارۆچکە. پارێزکەرە چەرکەزییەکەشیان بردبوو. گەڕانەوە، بەڵام چاخێرحالی لەکۆڵ عوسمان بەگ نابێتەوە.

## ******* پلخو *******

دوای ئەو رووداوە چاخیرحالی چۆوە ماڵەکەی خۆی و لای خێزانەکەی. کەس عەقڵی بەوە نەدەشکا، سەرەڕای ئەو هەمووە تەنگ پێ هەڵچنین و راونانە، چاخیرحالی لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتبێ. شەیتانیش ئەوەی بە زەینیدا نەدەهات.

پشوودان و حەسانەوەیان زۆری نەخایاند. دونیایەکیان کار هەبوو. زۆر کێشە هەبوون دەبوو چارەسەری بکەن و لە هەمووشیان گرنگتر پارە بوو. چەند دەوڵەمەندێکیان تالان کرد و پارەی پێویستیان پەیدا کرد.

کە ئەفە بڕیارێکی دەدا، دەبوو جێبەجێی بکا. هیچ هێزێکی نەیدەتوانی بڕیاری پێ بگۆڕێ. ئەفە شتی لەبیر نەدەچۆوە.

- حاجی، جا ئێستا ئیتر نۆرەی عوسمان بەگ هاتووە. لەبری پردەکەی چەمە سپی، دەبێ سێ هەزار سکەی زێڕ بدا.

لە نزیك ئارپاز بوون.

بەر لەوەی بچنە نێو ئارپازەوە، چەند تفەنگچییەکیان لە رێگا جۆراوجۆرەکاندا کردە ئێشکگر. ئەوجارەیان وەك جارەکانی پێشوو نەبوو. لەگەڵ حاجی مستەفا کەوتنە رێ و چوونە ماڵەکەی عوسمان بەگ. ئەو رۆژە لە ئارپاز بازاڕی حەتووانە بوو. لە دەرگایان دا و لەو ژنەی دەرگای لێ کردبوونەوە، پرسییان، عوسمان بەگ لە کوێیە؟ ژنەکە لە پێشدا گوتی لە چایخانەیە، بەڵام دوایی هەوڵی دا رێیان لێ ون بکا. زانیبووی ئەو دوو پیاوە، بنیادەمی ئاسایی نین. هەر بۆیە قسەکەی گۆڕی. زمانی تەتەڵەی کرد، بەڵام تازە لەدەمی دەرچووبوو.

## ******* پاخر *******

چاخیرجالی وەك بای شەماڵ ڕۆیشت. وەك هەورەتریشقەیەك لـە چـایخانەکە وەژوور کەوت و گرماندی:

کەس نەبزوێ.

جا کێ دەیوێرا ببزوێ؟

عوسمان بەگ ئامازەی بە پارێزکەرە چەرکەزەکە کرد، بەڵام حـاجی مستەفا لەسەر هەست بوو. لە بن پیلی کوتـا و تفەنگەکـەی لـێ ئەسـتاند و دەسـت و پێی بەست.

- عوسمان بەگ، پردەکەی "چەمە سپی"؟

ـ کـارێکی زۆر گەورەیـە ئەفـە. حکوومـەتیش پردێکـی ئـاوای پـێ دروست ناکرێتەوە. وەڵڵاهی توانیبایەم بەخوای دروستم دەکردەوە ئەفە...

- گوندی تکایان لێ کردی. منیش داوام لێ کـردی، بـەڵام تـۆ گوێـت نـەدایێ. هەستە ئێستا، دەبێ لەگەڵم بێی.

عوسمـان بـەگیان وەپـێش خۆیـان دا و ڕۆیشـتن. سەرانســەری بازاڕەکـەی ئارپازیـان کـرد. ئـەو عوسمـان بەگـەی چـەند سـاڵان ئاغـا بـوو، برجێکـی پاسەوانیی قایمی هەبوو، ئێستا کەوتبووە بەر دەستی چاخیرجالی. با هەموو ئارپاز بەوە بزاننەوە، عوسمان بزانێتەوە، کام برجی قایم دەتوانێ خۆ لە بەر چاخیرجالی ڕاگرێ؟

عوسمان بەگ لە پێشـەوە و ئـەوانیش بەدویـدا، لـە ئارپـاز هاتنـە دەرێ. لـە سـەرووی ئارپـازەوە، لـە بەرزاییەکانـەوە دەنگـی تەقەیـەك هـات. ئـەو فیشەکەیان بە مێشکی پارێزکەرە چەرکەزییەکە دابـوو. تـەرمی پارێزکـەریان شەوێ هێنایەوە گوند.

## ******* یاخی *******

ئێمە چاخیرجالیمان کوشت.

"بیرەوەرییەکانی سەرهەنگ روشدی کۆباش"

ساڵی ١٨٩٩ بوو، کە کۆلێژی سەربازیم تەواو کرد. دوایی گەلێ مەئمورییەت و بەرپرسیارییەتیم بەئەستۆ گرت و ناردیانمە ناوچەی جۆراوجۆر. ساڵی ١٩٠٦ لەگەڵ سەربازەکانمدا هاتمە "دیزجە". نەقیب بووم.

ئەو کات مەملەکەت پڕ بوو لە یاخی. کەس نەیدەتوانی بە سلامەتی بە چادە و چیاکاندا تێپەڕێ. یاخییەکان بە ئازادی دەگەڕان و تاڵان و بڕۆیان دەکرد. لە زۆر جێ، وای لێ هاتبوو، دەتگوت حکوومەت هەر نەماوە. زۆر شوێنان و تەنانەت هەندێ ناوچەی زۆر گەورەش، مەملەکەت بە دەست یاخییەك و تفەنگچییەکانییەوە بوو. لەو ناوچانەدا هەموو شتێك بە دەست یاخییەکانەوە بوو. یاخی شەڕ و هەڵلای خەڵکیان دەکوژاندەوە. هەر کەس سکالایەکی هەبوایە، دەچووە لای یاخییەکان.

لە نێوەدا دەستەیەك یاخی هەبوون، پتر لە هەموان حکوومەتی نیگەران کردبوو. ئەو دەستەیەی وا حکوومەتی سووك و چرووك کردبوو. ئەوانەش لە ناوچەی "ئێژە" بوون. سەرکردەی ئەو چەکدارانە پیاوێك بوو بەناوی چاخیرجالی. ناوبانگی چاخیرجالی بە هەموو وڵاتدا بڵاو ببۆوە. وەك بەسەرهاتێکی خۆش و شیرین کەوتبووە سەر زار و زمانان. لە هەر قوژنەیەکی وڵاتدا ئەفسانەیەکیان بۆ کار و چالاکییەکانی ئەو هەڵبەستبوو و بە نەقڵ دەیانگێڕاوە.

***

## ******* پاخر ******

جا کێ دەتوانێ وەدووی چاخیرحالی بکەوێ؟ هەر کەس وا بکا، زۆری پێناچێ سزاکەی دەبینێ.

دەستەیەکی چل کەسی، جەندەرمەی ئەلبانیایی دەچن چاخیرجالی بگرن. لە وسەردەمیدا ئەو پیاوانە بۆ ئازایەتی بەناوبانگ بوون. چەکدار و تەیار بوون و زۆریش بەخۆیان دەنازین. دڵنیا بوون دەتوانن چاخیرحالی بگرن. تۆزێکیش چییە گومانیان نەبوو. تەواو دڵنیا بوون.

ئەوانە سواری شەمەندەفەر دەبن. یەکەم شوێنی مەبەستیان، ئۆدەمیشە. قەول وایە لە ئۆدەمیش بنکەیەك دابنێن و دەست بکەن بە راوەدوونانی. پیاوەکانی چاخیرجالی پێشتر ئاگاداریان کردبۆوە کە دەستەیەکی چل کەسی جەندرمە، لە ئەزمیرەوە سواری شەمەندەفەر بوون و دێنە ئۆدەمیش بیگرن. جەندرمە ئاگایان لە مەحموودی بێ زەواد نییە. دەگەنە ئۆدەمیش. لە یەکێك لە چایخانە هەرە گەورەکانی ئۆدەمیشدا دادەنیشن و ئەمر دەکەن قاوە و نێرگەلەیان بۆ بێنن. ئەوەندە لەخۆرازی دەبن، کەس ناوێرێ لێیان بچێتە پێشێ. تفەنگە نوێ و خۆشدەستەکانیان لەسەر کۆشیان داناوە و بەخۆیان هەڵدەڵێن و قسە بە چاخیرجالی دەڵێن:

ـ ئەو چاخیرجالییە دەڵێن، ئەفە نییە خۆ... چەتەیەکی سووکە و...

ـ کەوڵی دەکەین و کەوڵەکەی...

ـ بەڵێ کەوڵی دەکەین و کای لە پێستی دەئاخنین و لەو مەیدانە هەڵیدەواسین.

ـ جەندرمەی وایە لێی تۆقیون.

ـ بەڵام خۆ ئێمە لەو جەندرمانە نین... ئێمە...

## ******* پاشخر *******

- بچێته بن عەرزیشەوە...

- هەر دەیگرین.

- ڕاوەستە با ڕۆژ بێتەوە... جا...

قریوە و دەنگەدەنگەکەیان قاوەخانەکەی پڕ کردبوو. بەدەم هەڕوگیف و خۆهەڵکێشانەوە، بە شان و باڵی خۆیاندا هەڵدەڵێن. لە پڕ دەرگای قاوەخانەکە دەکرێتەوە و کابرایەکی بەژن ڕێکی ڕەش ئەسمەری مامناوەندی وەژوور دەکەوێ. کابرا جلوبەرگی پێش خزمەتانی لەبەر دایە. لە پێشدا سڵاو دەکا و لەپڕ دەنەڕێنێ:

- کەس نەبزوێ. من چاخێرجالیم.

لە ژوورەکەی پشتەوەشڕا قاوەچییەکە ڕووی تفەنگی تێ کردوون. دیارە ئەو کابرایەش قاوەچی نییە. یەکێك دەبێ لە پیاوەکانی چاخێرجالی، کە ڕۆژی پێشوو هێناویانە و لە جێی قاوەچییەکەیان داناوە.

یەکێکە لە هاوڕێ هەرە ئازاکانی.

- برادەرینە، ئێوە تەشریفتان هێناوە چاخێرحالی بگرن؟ بە دەمانچەیەکەوە بەنێویاندا دەسووڕێتەوە.

- من خۆم چاخێرجالیم. ئەوە هاتووم. ئەگەر فەرمایشێکتان هەیە فەرموون. ئەوە کەوڵی خۆمم هێناوە. فەرموون کای تێکەن. مەیدانەکەی ئۆدەمیشیش ئەوەتا لەوێیە. بیبەن و لەوێ بەداریدا بکەن.

کەس متەقی لێوە نایە. هەر دەڵێی هەموو بوونەتە بەرد. ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕاوە. هەندێکیان لە ترسان دەلەرزن.

## ******* یاخی *******

- باشە بۆچی بوونەتە بەرد. چارەڕەشینە؟ دەی ببزوون بزانم. زوو بن ببزوون. چما ئێوە نەهاتوون چاخێرجالی بگرن؟ ئەوەتا هاتوومەتە بەر دەمتان. نەمویست ئەزییەتتان بدەم. لە کوێ بینراوە یاخییەك خۆی بێتە لای ئەو کەسەی راوی دەنێ؟ قەت شتی واتان بیستووە؟ لەبەر ئەو کارەتان دیارە میدالیاشتان دەدەنێ. زوو بن بمگرن دەی. خۆ ئەوەتا لە خزمەتتاندام. دەی هەستن بمگرن دەی.

ئەفە گاڵتە بە هەمووان دەکا و پێدەکەنێ.

- چما من دڵم دێ ئێوە ئەزیەت بدەم و بتانکێشمە ئەو کەژ و چیایە و ماندووتان بکەم؟ ئێوە زۆر ئازا و رەشیدن. چما دەکرێ ئێوە زەحمەت بدرێن؟ ئێوە خەڵکێکی بەڕێزن. چما پیاوەتییە ئێوە ئازار بدرێن؟ ئێوە سۆمای چاوی عوسمانین.

لەپڕ نەڕاندی:

- هۆی ژن حیزینە... وەسیەتەکەتان بکەن. یانی دەتانویست پێستی سەرم هەڵکەنن و کای تێ بئاخنن وایە؟ جا باشە ئەو هەمووە کایە لە کوێ دێنن؟ ئەی مەڕ و ماڵاتی ئەو خەڵکە چی بخۆن؟ دەی وەڵام بدەنەوە.

ئەفە بەرەو دەرگای قاوەخانەکە دەچێ:

- دیارە ئەو پیاوە نین. هیچتان پێ ناکرێ، بەڵام من مەردی مەیدانم و کاری خۆم دەکەم.

چاخێرجالی هەرای کرد و کوڕیژگەیەك هاتە ژوورێ.

ئەفە:

- وەرە کوڕم. وەرە و ئەو برادەرانە سزا بدە. چیت پێ خۆشە بیکە.

## ******* یاخی *******

کوڕه به مقەستێك و توورەکەیەکەوە دێت. دێتە پێشێ و یەك بە یەك گوڵێنگی کڵاوەکانیان هەڵدەپاچێ و لە توورەکەکەیان دەهات. جەندرمە چاویان زەق بووەتەوە. کوڕە هەر بەردەوامە و یەك بە یەك گوڵێنگی تەپلەی هەر چل کەسیان لێ دەکاتەوە و لە توورەکەکەی دەخا و لەسەر خۆ دەچێتە دەرەوە.

چاخیرجالی:

ـ ئەگەر حەزتان لێ بوو، دیسان دەکرێ بەدوومدا بێنەوە.

ئەوەیان پێ دەڵێ و دەچێتە دەرێ.

جا تاقمە چل کەسییەکەی ئێمە هێشتا رۆژ نەبووەتەوە دەکەونە رێ. ئیتر بۆ ساتێکیش چییە روویان نابێ لە ئۆدەمیش بمێننەوە. سواری شەمەندەفەر دەبن و دەگەڕێنەوە ئەزمیر.

کامیل پاشا، والیی ئەزمیر زوو دەزانێ ئەو جەندرمانەی دونیایەك هیوای پێیان بوو، ئەو جەندرمانەی بە هەزار هەرپوگیف و خۆبادانەوە چووبوونە ئۆدەمیش، ئێستا لە ئەزمیرن.

ـ چ بوو؟ دەنگ و باس؟

کەس وەڵامی ناداتەوە.

پاشا دیسان دەپرسێ:

ـ بۆ کەس قسە ناکا؟ بۆ بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە؟

یەکێکیان وەڵام دەداتەوە:

ـ نەماندۆزییەوە.

## ******* یاخی *******

چەند رۆژ دواتر، دیارییەکی لە چاخیرجالییەوە بەدەست دەگا. پاشا کە پرێسکەکە دەکاتەوە، چاوی بە گوڵینگەکان دەکەوێ.

***

چاخیرجالی لە شاخ هاتووەتە خوارێ. هاتنەخوارەوەی ئەفەکان لە شاخ، واتە بەر لێبوردن بکەون و لە گوندەکەی خۆیاندا بحاوێنەوە. ئەفەکانی ناوچەی ئێژە هەرکام چەند جاران بەر لێبوردنێ کەوتبوون و هاتبوونەخوارێ، بەڵام چاخیرجالی جیاوازە. ئەو یاخییە پانزە ساڵە، هەر جارێکی دەیەوێ بێتە خوارێ، لە پێشدا مەرجی خۆی دادەنێ و هەموو جارێکیش حکوومەت ناچار دەکا مل بۆ ویست و داخوازییەکانی دانوێنێ و مەرجەکانی قەبووڵ بکا. چەکەکانیان دانانێن و تفەنگچییەکانی بەرەڵڵا ناکا. هیچ پیاوێکی دەوڵەتیش بۆی نییە هاتوچۆی ناوچەی بن دەسەڵاتی چاخیرجالی بکا. هەر کام لە پیاوانی دەوڵەت، جا جەندرمە، سەرباز بێت یان پۆلیس، بەبێ ئیزنی ئەفە بۆی نییە بچێتە ئەو ناوچەیە... هەر جارێکیش دێتە خوارێ، دەکرێتە سەردار و فەرمانڕەوای دەشتێ و خۆی و پیاوەکانیشی مووچە لە دەوڵەت وەردەگرن.

چاخیرجالی دیسان هاتووەتەوە خوارێ. کامیل پاشا، والیی ئەزمیر بۆ سەردانێکی ناوچەی ئۆدەمیش دێتە ئەوێ. چاخیرجالی ئەفە ئاگادار دەکرێتەوە. تفەنگچییەکانی هەڵدەگرێ. لە کایاکۆی دەچێتە دەرێ و بەپیلییەوە دەچێ. کامیل پاشا هیچ حەزی لێ نییە چاوی بە چاخیرجالی بکەوێ، بەڵام چاریش نییە. ئەگەر بەهەندی نەگرێ و تووڕە بێ و دیسان روو بکاتەوە شاخ، تووشی سەرئێشەیان دەکا. خۆ چاخیرجالی کابرایەکی

## ******* پلخر *******

ئاسایی نییە. بەڵایەکی ئاسمانییە. ناکرێ بەهەندی نەگری. ناچارە چاوی پێی بکەوێ و لەگەڵیشی رووخۆش بێ.

کامیل پاشا میوانی یەکێك لە دەرەبەگەکانی ئۆدەمیشە. چاخیرجالییشیان بانگهێشت کردووە. خانووەکە لە نێوەڕاستی باخێکی گەورەدا هەڵکەوتووە. باخەکە پڕە لە درەختی میوە. رۆژ دەبێتەوە. دوای نانی بەیانی پاشا دەیەوێ تۆزێ لەگەڵ چاخیرجالی قسە بکا.

- فەرموو پاشا.

- ئەفە بیستوومە لەو دەوروبەرانە کەس بۆ ئەنگێوەیی ناگاتە تۆ.

چاخیرجالی بزەیەکی دێتێ.

- زۆریان پێوەناوە پاشا. من زۆر زۆریش ئەنگێوە نیم.

- تەنانەت دەڵێن، ئەنگێوەی وەك تۆ هێشتا لە دایك نەبووە. دەڵێن تۆ لێوەشاوەترین تفەنگچیی مێژووی.

- عەرزم کردی، زێدەوەسفە پاشا، بەڵام هەرچۆنێك بێ، لەو چەند ساڵەدا کە بە شاخەوە بووین، هەندێ شت فێر بووین.

- حەزم لێیە دەست و تفەنگت ببینم ئەفە.

- چۆنت پێ خۆشە با وابێ پاشا.

جا بانگی کوڕی خاوەن ماڵەکە دەکا:

- ئاغازادە، خاولییەکی خاوێن هەڵگرە و لە بن ئەو دار هەرمێیە راوەستە.

پاشا:

بە تفەنگی گەورە نا ئەفە، دەبێ بە دەمانچە بیئەنگێوی.

چاخیرجالی دەمانچەکەی هەڵدەکێشێ:

## ******* پاشا *******

ـ باشه پاشا. به دەمانچه لێی دەدەم. چما جیاوازیی هەیه؟ چەك، چەكە.

گەنجی خانەخوێ، خاولییەك هەڵدەگرێ و لە بن لكێك رادەوەستێ. سێ هەرمێ لە تەنیشت یەكەوە بە لكێكی دارەكەوەن.

چاخیرجالی:

ـ ئەو هەرمێیە هیی تۆیە پاشا.

وا دەڵێ و تەقە دەكا. یەكەم هەرمێ بەردەبێتەوە سەر خاولییەكە.

ـ دووەمیشیان بۆ ئەو گەنجە.

هەرمێی دووەمیش بەردەبێتەوە.

سێرەی لە سێهەمیش دەگرێ.

ـ ئەوەش بۆ من پاشا.

سێهەمیشیان بەردەداتەوە.

كوڕی خانەخوێ رەنگی بە روخسارییەوە نەماوە. پاشاش ئەوەندەی پێ سەیرە، وەختە شاخی لێ بڕوێ. هەرمێ هەڵدەگرن و بە خۆشییەوە دەیانخۆن.

ـ ئەو كارە، وەك راوێك وایە پاشا.

ـ وایە ئەفە.

پاشا بیر دەكاتەوە. كەوابوو ئەو تاریفاتەی لە ئەفەی دەكەن، راستن و زۆریان نەگوتووە.

ـ ئەفە.

ـ فەرموو پاشا.

****** باخی *******

ـ شتێکی دیکەشم لێ بیستووی. دەڵێن تۆ سکەیەك "دراوێکی ئاسن" دەدەیە دەست منداڵێك و ئەو هەڵی داوێ و بەر لەوەی بکەوێتە عەرزی، لێی دەدی. ئەوە راستە؟

ـ لە سایەی سەری تۆوە پاشا.

ـ دەمەوێ بە چاوی خۆم بیبینم.

دێنە نێو باخی. سکەیەك دەدەن دەست هەر ئەو کورەی خاولییەکەی راگرتبوو.

ـ هەڵی دە.

کورە سکەکە هەڵدەداوێ. رێك لەو کاتەدا دەنگی تەقەیەك دێ و سکە بزر دەبێ.

هەمووان واقیان وڕ دەمێنێ.

پاشا:

ـ هەر بەراستی ئەو مەردئازایەتییەت حەڵاڵ بێ ئەفە.

ـ مەمنوونم پاشا. تەمەندرێژ بی.

***

چاخیرجالی دیسان چووتەوە شاخ. رۆژێکیان لەگەڵ سێ کەس لە تفەنگچییەکانی بە چیای بێش بارماقدا دەگەڕێ. چاوی بە رەشماڵێکی رەوەندان دەکەوێ. بەرەبەری خۆرئاوابوونە. رۆژێك پێتر شەڕێکی خوێناویی کردووە و ئێستا زۆر شەکەت و ماندووە. پەردە لادەدەن. خێوەتەکەی لە بێدەنگیی مەرگدا نوقم بووە. ئاخر لە دەوروپشتی رەشماڵان هەمیشە چەند

## ******* پاخر *******

سەرێك مەڕ و بزن و سەگ دەبینرێن، بەڵام لێرە زیندەوەری لێ نییە.

چاخیرجالی بانگ دەکا:

- خاوەن ماڵ... ماڵێ...

کەس وەڵام ناداتەوە.

- میوانین و حەبیبی خودا... ئەرێ ماڵێ...

یەکێك لە تفەنگچییەکان دەچێتە نێو خێوەتەکەوە بەڵام خێرا دێتە دەرێ.

- ئەفەم. پیرەژنێك و پیرەپیاوێك لە خێوەتکەدان. زۆر شڕ و شپرزەن. دەکرووزێنەوە و دەگرین.

ئەفە فەرمان دەدا:

- پیرە پیاوەکە بێننە دەرێ بزانم.

دەیهێننە دەرێ.

- ئەوە بۆ وای؟ چیتان لێ قەوماوە؟

پیرە دەکرووزێتەوە:

- مەپرسە ئەفە... هیچ لێم مەپرسە ئەفە.

- قسە بکە پیرە.

پیرە بەکوڵ دەگری و دەڵێ:

- مەپرسە... مەپرسە ئەفە.

چاخیرجالی دەهری دەبێ.

- دەی خێرا بکە قسەیەك بکە دەی. بەشکم شتێکمان لەدەست بێ.

- پیرە هەر دەڵێ:

- مەپرسە، مەپرسە.

## ******* یاخوا *******

چاخیرجالی لێی دەچێتە پێشێ و دەستی بەسەردا دێنێ و دڵنەوایی دەکات:

ـ لەوانەیە پێت ناخۆش بێ هاتووینەتە رەشماڵەکەت. دەی باشە بۆ ناڕەحەتی؟ هەر ئێستا دەڕۆین. ئەوە پێناخۆشبوونی ناوێ. یانی ئێوە ئاوا میوان رادەگرن؟

ئەو قسەیە پیرەپیاوەکە راچڵەکاند:

ـ گوتم واز بێنە ئەفە. ئەو چاخیرجالییە نامەردە دوو سەعات لەوەپێش هەڵیکوتایە سەر خێوەتەکەمان. مەڕ و ماڵاتەکەی بردم. دارو نەداری بەتاڵان بردم. یاخوا بە گوللەی گەرمەوە بێ. دەی باشە ئەگەر ئەفەیە، با هەر ماڵ و سامانەکەمان بەرێ. خۆ ئەگەر هەر ماڵەکەی بردبایەم، دەمگوت هەقێتی. نۆشی گیانی بێ، بەڵام لە تۆ دەپرسم ئەفە گیان، ئاخۆ لە قامووسی ئەفایەتیدا هەبووە ناموسی خەڵکی هەتك بکەن؟ هەتا ئێستا شتی وا هەبووە؟ ئەو بێناموسە، ئەو بێدینە، ئەو چاخیرجالییە مەلعوونە کچەکەشمی هەڵگرت و بردی. بردی بەزۆری دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکا و ناموسی بەرێ. تۆ خوا ئەوە لە دابونەریتی ئەفایەتیدایە؟ ئێستاش تۆ دەتەوێ یارمەتییەکم بدەی؟ بەڵام لە هەمبەر نامەردێکی وەك چاخیرجالیدا چیت پێ دەکرێ؟

چاخیرجالی ئاگری لە چاوی دەرپەڕی:

ئەو چاخیرجالییە یەکێکی چۆن بوو، پیرەپیاو؟

ـ بڕوانە، ئاوا. یەکی زەبەلاح، دەتگوت دێوەزمەیە. یاخوا دوا بڕاو بێ. یاخوا بە گوللەی گەرمەوە بێ.

ـ لە کام لاوە رۆیشتن.

## ****** پاخر *******

پیره دەستی راداشت بەرەو ئەو لایەی پێیدا رۆیبوون. چاخیرجالی دەکەوێتە رێ.

- حاجی مستەفا!

فەرموو ئەفەم.

- دەبێ لەو دەوروبەرانە بن.

- هەر وایە ئەفەی من.

- تۆ پێت وایە ئەو چاخیرجالییە کێیە؟

- چەتەیەکە، ئەفە گیان.

- دوژمنە حاجی مستەفا. ئەو کابرایە دوژمنێکی گەورەیە حاجی. جەندرمە دوژمن نین حاجی. کەس دوژمن نییە. گەورەترین دوژمنی ئێمە ئەو جۆرە کەسانەن. ئەوانەن حاجی مستەفا.

- راستە ئەفە گیان.

- بێت ئەو نامەردە نەگرم، هەر حەیام دەچێ حاجی. حاجی مستەفا سەیری دەوروبەری دەکا و لە پشت نزیکترین گرد، ئاگرێك دەبینێ.

- دەبێ لەوێ بن.

- کەوابوو با برۆین حاجی.

چاخیرجالی و هەڤاڵەکانی بەرەو ئاگرەکە دەڕۆن. لە دەوری ئاگرێکی گەورە، نۆ پیاو کۆ بوونەتەوە. مەڕەکانیش لەولاوەترن. کچە داماوەکەش لەلایەکەوە دانیشتووە. چەتەکان خەریکن ئەزیەتی دەکەن. دەیانەوێ ناچاری بکەن سەمایان بۆ بکا. دەیانەوێ دەستی بۆ بەرن.

چاخیرجالی بە دەنگێك، کە عەرز و ئاسمانی پێوە دەلەرزێ، دەنەڕێنێ:

******* پاخو *******

- مەبزوون. چەکەکانتان دانێن.

پیاوەکان دەترسن. لە ترسان سەریان لێ دەشێوێ. تفەنگەکانیان فڕێ دەدەن و هەڵدەستن.

- دەمانچە و چەقۆکانیشتان.

فڕێیان دەدەن.

- بڕۆ پێشێ حاجی.

حاجی دەچێتە پێشێ و چەکەکانیان کۆ دەکاتەوە.

تۆ پیاوەکە توند لێك شەتەك دەدەن.

لەو کاتەدا کچە بە گریانەوە دێتە پێشەوە و دەستی ئەفە دەگرێ.

- تۆ برام بە ئەفە.

ئەفە:

- زوو بە وەڕێ بکەوە با بچینەوە رەشماڵەکەتان. دایك و بابت ئاگریان لە جەرگی بەربووە. چاوەڕێتن.

- لەسەرەت گەڕێم ئەفە. برامی ئەفە... گەورەمی ئەفە. رزگارت کردم. ناموسمت پاراست. یاخوا لە سەرت گەڕێم ئەفە...

ئەفە کچە هەڵدەستێنێ.

دێنەوە رەشماڵەکە.

پیرەپیاوە و پیرەژنە لەخۆشییان شاگەشکە بوون. دەستی ئەفە ماچ دەکەن و لەخۆشییان دەگرین.

ئەفە ئەمر دەکا بە تفەنگچییەکانی:

******* پاخر *******

- هەر لە بەردەرگای ئەو رەشماڵە، لەو عەرزە رێکە، ئاگرێك بکەنەوە...

ئاگرێکی گەورەی هێندەی خەرمانێك... ئەو نۆ پیاوە زۆر خۆشیان رابواردووە. جا ئێستا نۆرەی ئێمەیە. وا نییە حاجی؟

- وایە ئەفە گیان.

سەعاتێك نابا، ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە.

خێرابە حاجی. کارەکەت بکە.

حاجی تێگەیوە ئەمجارە ئەفە بێ ئەندازە تووڕەیە. دوو کەس لە ئەلبانیاییەکان دەکاتەوە. ئەوانی دیکە دیسان لە دارەکە دەبەستێتەوە. ئەو دوانە دێنێتە لای ئەفە.

- ئێمە خراپەمان کرد ئەفە، تۆ مەیکە.

- کوڕە هەی دایك حیز... چاخیرجالی تۆی؟

- نەخێر ئەفە.

- ئەی کامتان چاخیرجالیین؟

- هیچ کاممان ئەفە.

چاخیرجالی لە پیرەپیاوە دەپرسێ:

- کامەیان چاخیرجالیە؟

- ئەوەیان ئەفە گیان.

چاخیرجالییە درۆیینەکە، گەنجێکی چوارشانەیە. دەڵێی کێوێکی گۆشتە.

- رایمەگرە حاجی.

## ******* یلخو *******

هەر دوو پیاوەکە لە دارێك دەبەستنەوە و دەیانخەنە سەر کڵی ئاگرەکە. دەسووتێن. دەبنە کۆڵوو. بۆنێکی ناخۆش هەڵدەستێ. بۆنی گۆشتی سووتاو. بۆنی رۆنی بنیادەم.

چاخیرجالی وەك بتێکی بەردین راوەستاوە.

دووی دیکەش بێنە حاجی.

حاجی دەیانبەستێتەوە.

ـ نەکەی ئەفە. ئێمە هیچمان نەکردووە. ئەو بە زۆرەملێ هێنایني و ناچاری کردین.

لەو کاتەدا دەنگێك لە نێو خێوەتەکەوە گوتی:

ـ نەخێر ئەفە. درۆیان دەکەن. یاخییە ئەسڵیەکان ئەوانەن.

بێ پسانەوە قسان دەکا... ئەوەیا وای کرد، ئەویتر فلانە کاری کرد... و تاوانی یەك بە یەکیان دەڵێ.

دووان دووان دەیانبەستنەوە و لە ئاگرەکەیان داوێن. هەر سێ کەسیان ماونەتەوە. دووانیان تەواو سەریان لێ شێواوە. ناتوانن بیزوون. کەسیسێهەمیان بە قەلافەتێکی هیوادارانەوە سەیری چاخیرجالی دەکا و بە لەبزێکی تێکەلاو بە هیوا و گومانەوە دەڵێ:

ـ بڕوانە ئەفە، کە یەکێك لە دار دەدەن، ئاخرین داخوازییەکەی بۆ بەجێ دێنن. لانیکەم ئیزن بدە دوایین قسەم بکەم. بەنۆکەرت بم ئەفە. بە قوربانت بم.

ئەفە:

ـ دەی بڵێ بزانم. ئاخرین ئارەزووت چییە؟

## ******* یاخی *******

ـ خەنجەرەکەم بدەنەوە.

ئەفە خەنجەرەکەی دەداتەوە. یاخییەکە ئامبازی برادەرەکەی خۆی دەبیّ و دەیئەنجنیّ. ئەوجار تەرمەکەی بەکۆڵی خۆی دا دەدا و دەچێتە نێو ئاگرەکەوە.

سێهەمیان، کە دەڵێی بەدەم خەوەوە دەڕوا، وڕ و کاس، بە لارەلار دەچێتە نێو بڵێسەکانەوە.

چیایەك لە ڕۆن و خۆڵەمێشی بنیادەم کەڵەکە دەبێت و بۆنی گۆشت و ڕۆنی سووتاو هەموو وڵات پڕ دەکا. ئەفە دێتە لای پیرەپیاوەکە:

ـ من چاخیرجالیم مامە گیان. تکا دەکەم لێمان زویر مەبە. ئەزیەتمان کردی. رازیەی کچت خۆشکی منە. بە کوڕی خۆتم دابنیّ. بە کوڕی خۆتم قەبووڵ دەکەی؟

ـ خودا بتپارێزیّ کوڕم.

زۆر دواتر، چاخیرجالی کچەی بە مێرد دا و جیاز و پێداویستیی بۆ کڕی. دیاریی گرانبایی بۆ دابین کرد. خۆشی لە زەماوەندەکەیدا بەشدار بوو.

***

ئێمە لە "دوزجیّ" و "سیواس" و "ئەرزەڕۆم" و "ئەستەمبوڵ" ئەو شتانەمان لە سەر چاخیرجالی دەبیستەوە. سەربردەی ئازایەتی و جوامێرییەکانی لە هەموو مەملەکەتدا بڵاو ببۆوە و زار بە زار دەگەڕا.

**

## ****** پاخو *******

له سالّی ۱۹۰٦ـەوە هەتا ۱۹۲۰ له دۆزجێ مامـەوە. لێـرە بـوو پلـەی نـەقیبیم وەرگرت و "ئیشکودرا"یان وەك شوێنی خزمەتکردنم دیاری کـرد. بـۆ ئـەوەی بچمە ئیشکودرا، له پێشدا هاتمە ئەستەمبولّ.

له ئەستەمبولّ تووشی برادەرێکی خۆم بووم، که پۆلیس بوو:

ـ کاکـه روشـدی، سـەرهەنگ رەجـایی خەریکـه بـه دووتـدا دەگـەڕێ. خێـرا پەیوەندییەکی پێوە بکه.

هەر ئەو رۆژە خۆم گەیاندە رەجایی بەگ. ئەو کات خـەریك بـوون رێکخـراوی نـوێی پۆلیسـیان پێـك دێنـا و سـەرهەنگ رەجـایی بـەگ، یـەکێك بـوو لـه دارێژەرانی ئـەو رێکخسـتنه. ئـەو خـەریك بـوو ئـازاترین و بـه ئـەزموونترین و باشترین ئەفسەرەکانی هەڵدەبژارد.

ـ ئەوە له کوێی روشدی بەگ؟ من له ئاسمانێت لێ دەگەڕام. فەرمانم کردبـوو بتهێننه لای من. دەمانەوێ بێیته نێو رێکخستنی پۆلیسەوە. دەڵێی چی؟

بەر لەوەی چاوەڕێی وەڵامی من بێ، گوتی:

ـ حەزت لێیه له کوێ خزمەت بکەی؟

دەرفەتیشی نەدەدا من قسه بکەم.

ـ ئێمە زۆرمان پێویستی پێته. زوو وەڵام بدەوە. کوێت له هەموو جێیەك پـێ خۆشترە.

جێی مشتومڕ نەبوو. وەڵامم داوە:

ـ هەر دۆزجێ.

سێ رۆژ دواتر رەجایی بەگ توانیی له ئیشکودرا وەرمگرێتەوە و بمنێرێتـەوە بنکەی پۆلیسی دۆزجێ. لەوێش بمکاته فەرماندەی بەشەکه.

## ****** يلخو ******

ئێمە پێشتر قەول وابوو لە دۆزجێوە بچینە ئیشكۆدرا. هەر بۆیە ماڵاواییمان لە دۆست و برادەرانمان كردبوو، بەڵام دوای سێ ڕۆژان گەڕاینەوە.

ئەو سەرهەنگ رەجایی بەگە لەبەر دوو شت ئەوا پێداگربوو كە بمخاتە بنكەی پۆلیس. ئەو كاتەی لە دۆزجە بووم، بەرەنگاری زۆربەی یاخییەكان ببوومەوە و زۆریشیانم لەناو بردبوو. جگە لەوەش یەكێك لە گەورەترین سەركەوتنەكانم ئەوە بوو: لە رووداوەكەی ٣١ی مارتدا ئەو راپەڕیوانەم قۆڵبەست كردبوو، كە دەیانویست لە ئەستەمبوڵەوە خۆیان بگەیەننە ئەنەدۆل.

رووداوەكە ئاوا بوو:

رووداوی ٣١ی مارت قەومابوو. كۆمەڵێك لە پارێزەرانی "عەبدولحەمید" راپەڕیبوون و لە رێگای وشكانی و دەریاوە بەرەو ئەنەدۆل كەوتبوونە رێ. جا دۆزجەش یەكەمین شوێنێك بوو لە شوێنانەی لە بەردەم هێرشی ئەواندا بوو.

ئەو كات "سمایل رەمزی بەگ" فەرماندەی لیوای دۆزجە بوو. دەمێك بوو پێكەوە برادەر بووین. ئەویش وەك خۆم لایەنگری دەسەڵاتی مەشرووتە(مەرجدار) بوو.

سمایل بەگ شڵەژابوو:

ـ پارێزەرەكانی كۆشك دەیانەوێ بێرەدا خۆیان بگەیەننە ئەنەدۆل. خۆ ئێمەش هێزێكی وامان نییە پێشیان بگرین. تۆ باش شارەزای ئەم دەوروبەرەی روشدی بەگ. مشوورێكی لێ بخۆ، دەبێ كارێكی وا بكەین نەتوانن بچنە ئەنەدۆل.

زۆرمان بیر كردەوە و گەڵاڵەكەمان دارشت.

## ****** یاخی ******

گوتم:

با ئەو کەسە خۆبەخشانەی لێرەن، بیاننێرینە کەنارەکان و بەرپرسانی ئێرەش بکەینە فەرماندەیان. منیش بە تاقمەکەی خۆمەوە دەچمە "ئاقچا قۆجا" و ئەوانەی لە رێگەی دەریاوە دێن، لەوێ ئەوان دەگرم.

وامان دانا هەروا بکەین.

من بەرەو ئاقچا قۆجا رۆیشتم و خەڵکە خۆبەخشەکەی ئەوێم چەکدار کرد. چەکوچۆڵم بەسەر هەموو گەمییەوانەکانیشدا دابەش کرد. تەنانەت تفەنگم دا بە شەپوورچییەکانیش. ئەوە زۆر زۆر پێویست بوو. چونکە وای دەکرد، هێزەکانمان لە ژمارەی خۆیان پتر دیار بن.

کە بەرەو ئاقچا قۆجا دەرۆیشتم، پەیامێکم نارد بۆ گوندی "کوباشلار"ی سەر بە "قەرەسوو". ئەو گوندە ئێستا ناوی "سالم لی"یە. پەیامەکەم بۆ عوسمانی برام بوو.

پەیامەکە ئەوە بوو:

- بە دەستەیەك چەکدارەوە وەرێ کەوت(؟). دەبێ بە شەو و رۆژ رێگە ببڕێ و رانەوەستی و خێرا خۆت بگەیەنیتە من. کاروبارەکان زۆر پیس شێواون. ژیانی هەموومان، ژیانی هەموو میللەت لە مەترسیدایە. "

عوسمان کابرایەکی رەشید و ئەنگێوەیەکی بێوێنە بوو. لە هەموو ناوچەکەدا بەو تایبەتمەندییانەوە ناسرابوو و ناوبانگی دەرکردبوو. لە بەشەکانی دیکەی بیرەوەرییەکانیشمدا دەبینن کە لە هەموو کاروبارەکانمدا و لە راوەدوونانی هەر کام لە یاخییەکاندا، عوسمان گەورەترین هاورێم بوو.

******* پاشخ *******

دواتر تەلەگرافم بۆ فەرماندەی فەوجی "ئەرۆغڵی" و فەرماندەی فەوجی "کۆجالی"یش نارد. لەوانیشم راسپارد، کە زانیاریی دروست و وردمان بەدەست هێناوە و دەریدەخەن، ئەو سەربازانەی لە "ییلدیز" راپەڕیون دەیانەوێ خۆیان بگەیەننە ئەنەدۆل و ئەوێ بشێوێنن. هەر بۆیەش دەیانەوێ بێرەدا تێپەڕن. جا داوام لەو دوو فەرماندەیەش کرد بێنە پاڵمانەوە. هەر دووکیشیان ئەم وەڵامەیان ناردەوە:

ـ" لێرە چەکداری خۆبەخش بە کەس کۆ ناکرێتەوە و ناکرێ پێشی ئاژاوەچییەکان بگری. چاوەڕوانیمان لەتۆیە، بە زیرەکیی خۆت مشووریکی لێ بخۆی و پێشیان بگری. ئێوە رێگەی دەریایان لێ بگرن. ئێمەش لێرە ئەوی لەدەستمان بێ دەیکەین"

کارەکە خەریك بوو دەگەیشتە جێی باریك و ناسك. ئەگەر عوسمان بتوانێ خۆی بگەیەنێ... . هەموو هیوام بە عوسمان بوو.

عوسمان گەیشتێ. سەد کەسێکی چەکداری لەگەڵ بوون. هەر هەمووشیان لە کەسە هەرە باشەکان هەڵبژێرابوون. بە رێگای نێوان ساکاریا و ئاقچاقۆجادا کەوتینە رێ.

سەربازەکان دەستەدەستە و پۆل پۆل هاتن. لە پێشدا بەتەمەنەکانمان نارد ئامۆژگارییان بکەن. خۆشم پەیوەندیم بە فەرماندەیەکیانەوە کرد. تەلەگرافخانەشم لەسەر هەست راگرتبوو بۆ ئەوەی لە کاتی زۆر پێویستدا بتوانین پەیوەندی بە شوێنە جۆراوجۆرەکانەوە بکەین.

ناوەرۆکی یەکەم تەلەگرافمان ئاوا بوو:

## ******* پلخو *******

"ئاگادارتان دەکەینەوە، ئەو سەربازانەی بەرەو ئەنەدۆل بەڕێکاوەن، هەر هەموو ئیزن دەدرێن بڕۆنەوە. ئەوانە بۆیان هەیە هەر بە چەکوچۆڵەکەی خۆیانەوە بچنەوە زێدەکەیان. "

تەلەگرافەکە لە زمانی جەنەراڵی سوپاوە بوو. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکان هەڵخەڵەتێن. لە جێدا، سەرباز مزگێنییەکی هێندەی ئیزن پێدران و ناردنەوەی بۆ ماڵەوە، پێخۆش نییە. ئێمەش دەمانزانی ئەوە خاڵی لاوازی سەربازانە و تەلەگرافەکەشمان بۆ ورووژاندن و دنەدانی سەربازەکان لێ دا.

بەو تەلەگرافە هۆردووی راپەڕیوەکانمان شێواند. ئێمەش کەلکمان لەو بشێوییە وەرگرت و بە پەلامارێکی سەنگ و سووککراودا هەر هەموویانمان قۆڵبەست کرد. چەکمان کردن و سواری گەمیمان کردن و ناردمانن بۆ "ئەرگولی".

سەربازەکانی دیکەش، پەیتا پەیتا هاتن. لەبەر سەرباز جێی هیچ نەدەبۆوە. خۆڕاگرتن ئەستەم بوو. بەو حاڵەشەوە توانیمان هەر تاقمە سەربازێکی دەگەنێ، چەکیان بکەین و قۆڵبەستیان بکەین.

دەسگیرکراوەکان زۆر زۆر بوون. بۆیە ناچار بووین، تەلەگرافێك بۆ فەرماندەی هێنان و راگواستنێ بنێرین و داوای یارمەتیی لێ بکەین. فەرماندەی هۆردووی هێنان و راگواستن "مەقسوود شەوکەت پاشا"، پاپۆڕشکێنی "تاشوز"ی ناردە یارمەتیمان. تا ئەو هات، زۆربەی سەربازەکانمان سواری گەمی کردبوو و ناردبوومانن ئەرگولی. ئەوانی دیکەشمان سواری پاپۆڕشکێنی "تاشۆز" کرد و بەرێی ئەستەمبۆلمان کردن.

## ******* یاخی *******

دیاره بەشێکیان پێشتر رایان کردبوو ئەوانەی ئێمە گرتبوومانن، زیاتر لە ١٣٠٠ کەس بوون. چەکوچۆڵی ئەو سەربازانەشم نارد بۆ بەشەکەی خۆمان لە دۆزجێ.

***

ئێمە هاتین بەڵام ئیشمان زۆر زۆر بوو. دۆزجێ لە تەنیشت ئەستەمبوڵەوە بوو، بەڵام چیاکانی پڕ پڕ بوون لە یاخی. کەس نەیدەوێرا بە جادە و رێگاوبانەکاندا هاموشۆ بکا. حکوومەتی ناوەندییش بێ دەستەڵات و دەستەوستان بوو. دەتگوت هەر نییە. یاخییەکان بە ئاشکرا گاڵتەیان بە حکوومەت دەکرد. یاخی هەر یەك و دوو دەستە و تاقم نەبوون. ژمارەیان لە پانزە و بیستیش تێدەپەڕین. هەر کامەشیان ببوونە فەرمانڕەوا و گونڕەشی بەشێك لە مەملەکەت.

دەبێ چ بکەین؟

هێشتا دانەمەزراوین، یاخییان راو دەنێم. مەملەکەت بێ خاوەنە و یاخییش بەیدەست نابن. ئەوە زۆر ناخۆشە. لە ئەستەمبوڵیشەوە ئەوە تەلەگراف دوای تەلەگراف دێ. حەسانەوەم نییە. لە هەر جێیەك تێگیران و تێکهەڵچوون هەیە، من لەوێم. من و جەندرمەکانم دەسبەجێ دەگەینێ. دێم، هێرش دەبەم، شەڕ دەکەم، بەڵام ئەو هەمووە شەڕ و راونان و پاشەکشەیە هیچی لێ ناکەوێتەوە. هیچ یاخییەکمان پێ ناگیرێ. یاخییەکان دەست بۆ هەر شتێك دەبەن، بە دەستیانەوە دێ.

دوو مانگە بوومەتە فەرماندەی بنکەی پۆلیسی دۆزجێ. لە هەموو ئەو ماوەیەدا بۆ ساتێکیش نەسرەوتووم. دەکەومە شوێن یاخییەك، راوی دەنێم و

## ******* یاخی ******

تەنگی پێ هەڵدەچنم و ڕێك لەو کاتەدا کە هیوام بە گرتنێتی، لەپڕ سەیر دەکەم ون بووە. جاری وایە دەبێتە شەڕێك کەوچکی تێناگەڕێ، یاخییەکان ئاگرباران دەکەین، بەڵام کە شەودادێ، یاخی بازنەی گەمارۆ دەشکێنێ و ڕادەکا.

لە داخان خەریکە شێت دەبم. ئەی چ بکەین؟

دەست لە ڕاوەدوونان هەڵدەگرم و دادەنیشم بیر دەکەمەوە. باشە بۆ هیچمان بەدەستەوە نایە؟ ئێمە بۆ ناتوانین یاخییەکان بگرین؟ لە لایەکەوە چەند یاخییەکی بەرەڵلا و لاولاشەوە، حکوومەتێك بە هەموو هەیبەتی خۆیەوە... ئەی بۆچی دەستەوستان ماوینەوە؟

ئەزموونی ئەو دوومانگەم تێی گەیاندووم کە یاخییەکان بەتەنێ نین. هەموو خەڵکە هەژارەکەی و ژمارەیەکیش لە دەرەبەگەکان پشتی ئەو یاخییانە دەگرن... بۆ ئەوەی نەتوانین یاخییەکان بگرین، ناونیشانی هەڵەمان دەدەنێ و بە سەهوومان دەبەن. لە ماڵی خۆیاندا دەیانشارنەوە. دەرەبەگەکان چەکوچۆڵیان بۆ دابین دەکەن... لە پێشدا دەبێ حەشارگەکانیان ئاشکرا بکەین. دەزگایەکی سیخوڕی، ڕێك وەك سیستەمی یاخییەکان ڕێك بخەین. جگە لەوەش، نابێ پشت بە جەندرمان ببەستم و هیوام پێیان بێ. دەبێ لە نێو خەڵکەکەشدا، کەسانی خۆبەخش کۆ بکەمەوە. پێویستیم بە کاتە. پێویستمە بە جوانی بیر بکەمەوە و بەرنامەیەکی ڕێك و وردی بۆ دارێژم.

لەو کاتەدا، یەکێك لە یاخییە هەرە مەترسیدارەکانی چیاکانی دۆزجێ، کابرایەکە بە ناوی "سمایلە ڕەش". پتر لە پازدە تفەنگچیی هەیە. مەودایەکی پان و بەرینی خستووەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لەمێژە چیاکانی

## ******* پلخو *******

پاوان کردووه و زۆر بێبەزەییانە دەجووڵێتەوە. چەتەیی دەکا. ماڵان تاڵان دەکا و هەموو ڕێگەکانی ناوچەکە پاوانی سمایلە ڕەشن. بەبێ ئیزنی ئەو باڵندەش ناتوانێ بەسەر ئەو ڕێیانەدا بفڕێ. هەرچی جەندرمەی کەوتوونە شوێنی، بەشی هەرە زۆری لە بۆسە خستوون و کوشتوونی.

زۆربەی جەندرمە لە ترسی ئەو دەستیان لە کار کێشاوەتەوە. زۆربەی فەرماندەکان لە ئاستی ئەو دەستەوستان و دەرکراون.

جا باوەڕێکی پڕوپووچیش کەوتووەتە نێو خەڵکەوە: وەڵڵا هیچ فیشەکێك سمایلە ڕەش نابڕێ. کەس ناتوانێ بیگرێ.

تێگەیشتم ئاوا دەستم لە هیچ گیر نابێ. بە ڕواڵەت وازم لێ هێنا. وەك هەر نەبم. سمایلە ڕەش شوێنێك تاڵان دەکا. من ئاگادار دەکەنەوە، بەڵام من هیچ ناکەم. کەوابوو ئەو چاوقایمتر و بێ ترستر دەبێ. چیی نەماوە بێتە پۆلیسخانەی دۆزجێ و بە من بڵێ:

- ئافەرین فەرماندە. تۆ پیاوێکی تێگەیشتووی. هیچ کارت بە من نییە.

لەو سەروبەندەدا پەیتاپەیتا لە بنکەی پۆلیسی ئەستەمبوڵەوە تەلەگرافم بۆ دەهات. داوایان لێ دەکردم، دەسبەجێ سمایلەڕەش بگرم و ڕادەستیانی بکەم. ئاگاداریش کرابوومەوە کە زۆربەی خەڵکی دوزجێ تەلەگرافیان ناردووە بۆ پایتەخت و سکاڵایان لێ کردووم کە بۆچی کارم بە سمایلە ڕەش نییە و هەوڵ نادەم بیگرم.

سمایلە ڕەشیش پێی وابوو لێ دەترسم. میش ئەو دەنگۆیەم بڵاو دەکردەوە و وام دەنواند ترسنۆکم.

## ******* پاخو *******

دوای مانگێک ئاگادار کرامەوە، کە سمایلە رەش هەموو شەوێ دێتەوە ماڵەکەی خۆی. ئیتر لەهیچ نەدەسڵەمییەوە. دەهاتەوە و لە گوندەکەی خۆی تەمرینی تفەنگ هاویشتنی دەکرد. تەنانەت خەڵکی گوندیشی فێری تەقەکردنێ دەکرد. چەتەیی دەکرد، ماڵانی تالان دەکرد و بە سەربەستی و ئازادی دەگەڕا و دەخولایەوە.

ئەو کابرایەی چەندی چەند ساڵان یاخیگەرێتیی کردبوو و ئەزموونی کۆ کردبۆوە، سەیرکە ئێستا چەندە کرچ و کاڵ و خاو بووە. چۆن باوەڕی کردووە کە لێی دەترسم؟ هەر بەراستی سەیر بوو. چۆن بڕوا دەکات وازم لێ هێناوە و وەدووی ناکەوم؟

من کابرایەکی ساویلکە نیم خۆم هەڵخەڵەتێنم. ئەوەی ئەوی ئاوا چاوقایم و بێ ترس کردووە، هەر هەڵسوکەوتی من نییە. ئەو گورگە پڕ مەترسییەی کوێستانان نابێ هێندەی خەیاڵی خاو بێ. ئەو پشتی هەر بەخۆی گەرم نییە. لێم سوورە یەک یان چەند پشتیوانێکی گەورەی هەیە. جگە لەوەش، هەقیشی بوو لە من نەترسێ. ئەو پیاوەی چەند جاران ریزی جەندرمانی تێک شکاندووە و پیاوانی حکوومەتی دەستەوستان کردووە، تۆ بڵێی من و بە چەند جەندرمەیەکەوە هەر بە پیاویش بزانێ؟

لەو کاتەدا عوسمانی برام پەیدا بوو. بەبێ ئاگادارکردنەوەم هاتبوو. هەموو پیاوەکانیشی ئامادە و لەسەر پێ بوون.

پرسیم:

- تەواوە عوسمان؟ ئامادەی؟

- تەواو.

## ******* یاخی *******

هەر ئەو رۆژە هەواڵێکی تازە هات.

سمایلە رەش لە ماڵەکەی خۆیەتی. ماڵی یەکێك لە دەوڵەمەندە هەرگەورەکانی تاڵان کردووە و سەروەت و سامانێکی زۆری بەدەست هێناوە. تازە گەیوەتەوە و ماندووە.

عوسمان پیاوەکانی ئامادە دەکا. منیش جەندرمەکانم لە شارۆچکەوە بانگ دەکەم. دەبێ لە پێشدا شوێنەونکەیەك بکەین. دەنگۆ دادەخەین کە وەشوێن یەکێك لە یاخییەکانی تر دەکەوین. وای دادەنێین بە رێگایەکدا دەڕۆین بۆ ئەوەی سەر لە دوژمن بشێوێنین و واشمان داڕشتووە من و عوسمان شەوێ لە دارستانەکەدا یەك بگرینەوە.

ئەو رۆژەم جوان لەبیرە. کە لە شارۆچکە وەدەر کەوتین، بوو بە گۆپاڵبارانێك، وەك گۆزەی سەروژێر دەهاتە خوارێ بەو بارانەدا بە غاردان خۆمان گەیاندە دارستان. عوسمان و پیاوەکانی چاوەڕێمان بوون. لەوێ یەکمان گرتەوە.

عوسمان:

- چ پێویستییەکمان بەو فرت و فێڵ و تەگبیرە هەبوو روشدی؟ هەر کام لە پیاوەکانی من بەتەنێ سمایلە رەشێکن.

راستی دەکردز(؟) پیاوی زۆر ئازا و بوێری هەبوو. نۆ کەسیان، لەوانە بوون، کە چەند ساڵان یاخیگەرییان کردبوو و دوایی تۆبەیان کردبوو. ئەوانی دیکەش قاچاخچی بوون. ئەوانەی لەو کاتدا ژیاون، باش دەزانن چاچاخچیی تووتن چەندە زیرەك و لێوەشاوە بوون.

وەڵامم داوە:

## ******* یاخی *******

ــ تــەگبیر و فرتــوفێڵی شــەڕێ شــتێکی زۆر باشــە عوسمــان. دوژمنەکــەت مێروولەیەکیش بێ، دیسان هەر دەبێ...

بەو شەوە تاریکە وەڕێ کەوتین. بارانەکە هێشتا بە رێژنە دەباری. بەرەبەری بەیانی بوو گەیشتینە گوندەکە سمایلە رەش.

فەرمانم دا:

ـ عوسمـان تـۆ و پیاوەکانـت بـەلای سـەروودا بـڕۆن. مـن و هاوڕێیانیشـم لـە خوارەوە بۆی دەچین. خەنیمەکەمان ئێستا خرپ لێی خەوتووە.

تاوێك دواتـر ئـەو ماڵـەمان گـەمارۆ دا، کـە لـە بـەری رۆژهـەڵاتی گوندەکـەوە هەڵکـەوتبوو. هـەتا نیـوەڕۆ لەگـەڵ سمایلـە رەش شـەڕمان کـرد. بەرەبـەری نیـوەڕۆ بـوو، سمایـل زانیـی دەرچـوونی مەحاڵـە. وای بـەباش زانـی دەسـت بەرداتەوە. خۆی و تفەنگچییەکانی خۆیـان بەدەسـتەوە دا. کەلەپچـەمان لـە دەستیان کرد و بەرەو دۆزجێ کەوتینە رێ.

سمایلە رەش:

ـ لەپڕ و بێ ئاگاداركردنەوە هێرشت كرد بەگ. لە ناخافڵ قەتیست کردم. خۆ ئەگەر هەندێ دەنگۆ نەبوایە، ئەوەندە خاو و کرچ و کاڵ نەدەبووم و...

ـ فەرقێکی نەدەکرد سمایلە رەش. هەرچۆنێکی بوایە هەر دەمگرتی.

بەبێ ئەوەی دڵۆپە خوێنێك لە لووتی جەندرمەیەکەوە بێ، بەو بەڵایەم لەکۆڵ کردەوە. ئەو سمایلە رەشەی لە بن گوێی عوسمانییەکان یاخیگەریی دەکرد، گرتم و رادەستم کردن. فەرماندەی گشتیی پـۆلیس لـە رادەبـەدەر خۆشـحاڵ بوو. شەپۆلی پیرۆزباییم بەسەردا هات. ئـیتر پایتـەخت تـەواو متمانـەی پـێم بـوو. دوایـی چـوومە سـەر یاخییـەکانی دیکـە و هـەموو ناوچـەکەم لـێ پـاك

کردنەوە. کە توانیم لە شەش مانگدا ئەو هەمووە یاخییە لەناو بەرم، ئیتر حکوومەت هیوای پێم بوو. زۆر جێی باوەڕ و متمانەی بووم. ئیتر لە کوێستانی دۆزجیێ هیچ کێشەیەکم نەما. ئەو کوێستانە لە هەموو ناوچەکانی وڵات بێدەنگتر ببوو. لە حاڵێکدا پێشتر دوو جێی زۆر ئاڵۆز و پڕ ئاژاوەمان هەبوو: یەکێکیان ناوچەی ئێژە و دووەمیشیان ئەو دۆزجێیە.

***

چاخێرجالی زۆر زۆر گەشەی کردبوو. لە شوێنێك کارخانەیەکی دەسووتاند و لە شوێنێکی دیکە سی چل کەسی وێکڕا دەکوشت. حکوومەت بە دەستییەوە دامابوو. هیچی لەگەڵ چاخێرجالی پێ نەدەکرا. کام پیاوی لە هەمووان بە ئەزموونتر و لێوەشاوە بوو، ناردبووە سەری، بەڵام چاخێرجالی هەمووی کوشتبوون. ئەو گاڵتەی بە پیاوانی حکوومەت دەکرد. ئەوەی بەسەر هێزەکانی حکوومەتی دێنا، مەگەر پشیلە بەسەر مشکێکی لاوازی هێنابێ.

لە ئایدین بنکەیەکی فەرماندەییان پێك هێنابوو. چەند گرووپێکی راوەدوونانیان رێك خستبوو، کە ئەرکیان تەنیا ئەوە بوو شوێن چاخێرجالی بکەون. چاخێرحالی لە حکوومەت ببووە کەڵەگا. هەر بۆیە کام کەس لە ئازایەتی و ئەزموونیدا وێنەی نەبوو، ئەوانەیان دەناردە سەری بیگرن، بەڵام هەموو بە شەل و کوتی و بە سەرشۆڕی دەگەڕانەوە.

لەو سەروبەندەدا تەلەگرافێکم لە فەرماندەیی گشتیی پۆلیسی وڵاتەوە بەدەست گەیشت. لە تەلەگرافەکەدا نووسرابوو:

"بە پەلە پێنج جەندرمە هەڵبژێرە و وەرنە فەرماندەیی راوەدوونان لە ئایدین. جگە لەوەش هەر گەیشتنێ، ئاگادارمان بکەنەوە لە گەیشتنەکەتان."

## ******* پاشکۆ *******

دڵم لە شێوە و داڕشتنی وشەکانی ئەو تەلەگرافە ئاوی نەدەخواردەوە. ئەو فەرمانانەی دەریشی کردبوون روون نەبوون. هەر بۆیە ناچار بووم نامەیەك بۆ "واسم پاشا" بنێرم. لەگەڵ ئەو بڕیارەدا ئەم تەلەگرافەم نارد:

"ئەگەر منت بۆ ئەوە بانگ کردووە، وەشوێن چاخیرجالی و دارودەستەکەیم بخەن، پێویستە ئێوەی بەڕێز لەو خاڵانە ئاگادار بکەمەوە:

لە پێشدا، پێم بڵێن ئەرکی من چییە و دەستەڵاتم چەندەیە؟ دوای ئەوەش، من بۆ گرتنی پیاوێك کە پانزەساڵ یاخیگەریی کردووە و قەڵسەی لە حکوومەت گێڕاوە، ناتوان یارمەتی لە جەندرمەی ئەو بنکانە وەرگرم، بەڵکو داواکارم ئیزن و دەسەڵاتی پێویستم بدەنێ بۆ ئەوەی لە نێو خەڵکدا، کۆمەڵێك پیاوی خۆبەخش و گیانلەسەردەست هەڵبژێرم. ئەگینا خۆم ئامادەم بە تاقی تەنێ قۆڵی لێ هەڵدەماڵم بۆ گرتنی ناوبراو. "

نامەیەکیشم بۆ برادەر و هاوپۆلییە کۆنەکەم "حەبیب بەگ" نارد کە لەو کاتدا پەرلەمانتار بوو و هەموو شتێکم بۆ روون کردەوە و داواشم لێ کرد، داخوازییەکانم بگەیەنێتە بەرپرسانی باڵای مەملەکەت.

حەبیب هەر نامەکەی منیش پێ گەیبوو، نامەکەی بردبووە لای راسم پاشای فەرماندەی گشتی پۆلیسەکانی هەموو ولات و باسی بارودۆخی منی لە دۆزجێ و چۆنێتیی گرتنی سمایلە رەشی بۆ کردبوو. راسم پاشاش تێدەگەیەنێ، کە گرتنی سمایلە رەش، کاری چەند جەندرمەیەك نەبووە، بەڵکو پیاوی چەکداری وەك عوسمانی برام و کۆمەڵێك یاخی و کۆنە قاچاخچیشم لەگەڵ بوون و ئەوانە کاریگەریی بێ ئەملاولایان لەسەر سەرکەوتنەکەمان هەبووە. ئەو قسانە دەبنە هۆی ئەوەی راسم پاشا لەگەڵ

******* پلخو *******

حەبیب بەگ بچنە لای خەلیل بەگ، وەزیری ناوخۆ و چەند جاران ئەو کارەی بۆ دووپاتە بکەنەوە.

چەند رۆژ دواتر ئەم تەلەگرافەم بەدەست گەیشت.

"بەم تەلەگرافە، نەقیب "روشدی بەگ" فەرماندەی لیوای جەندرمەکانی دۆزجێ ئاگادار دەکرێتەوە: هەرچەندە پێشتر وامان دانابوو، هەر جەندرمەکانی خۆمان ببردرێن بۆ راوەدوونان و گرتنی چاخیرجالی، بەلام بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرج و پێداویستییەکان، ئەو دەسەلاتە بە ناوبراو دەدرێت لە نێو خەلکی ئاساییشدا چل و پێنج کەس هەلبژێرێ و بۆ ئەو کارە ناویان بنووسێ. مووچەی مانگانەی هەرکام لەوانەش هەشت سەد قرۆشە. پێویستە زۆر زوو کاروبارەکان رایەڕێنن و لە ماوەی سێ رۆژاندا خۆیان بگەیەننە ئەزمیر. هەروەها لە یەکەم دەرفەتدا ئاگادارمان بکەنەوە لە هاتنیان بۆ ئەزمیر و کاروبارەکانیان. "

شمارە:٣٢٧ رێکەوتی ٢٨ی تەموور

وەزیری ناوخۆ ـ خەلیل

(لەبەر ئەوەی تەلەگرافەکە نهێنی بوو، لە پێشدا درابوو بە بەرپرسی لیوا و لە رێگەی ئەوە گەیشتبووە دەست من.)

"جەنابی نەقیب روشدی بەگ، فەرماندەی بەرێزی بنکەی پۆلیسی ناوچەی دۆزجێ"

**هاورێی ئازیز:**

تەلەگرافی ژمارە ٣٢٧ی رێکەوتی ٢٨ی تەمووز، کە وەزارەتی مەزنی ناوخۆ ئەمری فەرمووە و ناردوویەتی، دەوروبەری سەعات ٩ی ئەمڕۆ وەرگیرا. بە

## ******* پاخو *******

پێی ئەوەی تەلەگرافی گۆرین* رەمزی و نهێنی بووە و کلیلی رەمزەکانیش لە بنکە نییە، بۆیە دەقی تەلەگرافەکە لەگەڵ کلیلی رەمزەکان دەنێرین. پێویستە زۆر زوو ناوەرۆکی تەلەگرافەکە جێبەجێ بکرێ و بەپەلە خۆتان بگەیەننە بنکەی فەرماندەیی جەندرمەکان لە ئەرزمیر. پێویستە ئەوەش بڵێین، هەر گەیشتیتە ئەرزمیر، دەسبەجێ لە گەیشتنت و کاروبارەکانت ئاگادارمان بکەیەوە. هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم هاورێی ئازیز.

سەعا ٣ی رۆژی ٢٩ی تەمووز

**رەمەزان خەفی**

هەر تەلەگرافی دووەمم بەدەست گەیشت، خۆم و عوسمانی برام دەستمان کرد بە دابینکردنی پێداویستییەکان. دەمانزانی چاخیرجالی ئەفە، سمایلە رەش نییە. ئەو نەقڵ و هەقایەتە سامناکانەی لێیان دەگێراوە و ئەو ناوبانگە زۆری دەستەبەری کردبوو، ئەوی لەبەر چاومان کردبووە دێوەزمەیەکی ئەفسانەیی و پاڵەوانێکی حەماسی. لەو کاتەوە کە لە کۆلێژی سەربازی دەمخوێند، هەموو رۆژێ شتی تازەم لێ بیستبوو. ناوبانگی ئەو، سنوورەکانی مەملەکەتەکەمانی بەزاندبوو و دونیای داگرتبوو. چەند لەشکری لەناو بردبوو و چەندین گەمارۆی شکاندبوو. کە لە ییلدیز بووین، سەرەرای ئەوەی سوڵتان عەلبدولحەمید قەدەغەشی کردبوو، دیسانیش باسی قارەمانێتییەکانی چاخیرجالی هەر وا زار بە زار دەگەرا.

بەڵام ئەو ناوبانگە ئەفسانەییە تۆزێکیش چییە منی نەدەترساند. لە هەموو شوێنێك و هەموو کاتێك پیاوەکانم ئامادە دەکرد بەرەنگاری ببنەوە. شەر

*طۆرین: ناوبراو. ناسراو. ئەو شتەی باسی کرا.

## ******* پاخر *******

لەگەڵ قارەمانێکی ئاوا شانازییەکی گەورە بوو، کە دەبوو بە من و هێزەکەم بپردرێ.

متمانەی تەواوم بە عوسمان هەبوو. ئەو پتر غیرەتی وەبەر دەنام. تفەنگچییەکی لێوەشاوە بوو. دەیتوانی لە ئاسمانێ مێشووله بئەنگێوێ. قۆناغی گەنجێتییەکەی لە راودا بەسەر بردبوو. تەمەنێك شاخەوانیی کردبوو و بە شوێن کەڵەکێویدا بە رەوەز و زەردومای رژ و ئەستەم هەڵگەڕابوو. گەنجێکی تۆکمە بوو. لە ژیانمدا کەسم نەدیتبوو ئەوەندە برۆك و بە جووڵە بێ. ماوەیەکیش قاچاخچێتیی تووتن و یاخیگەرێتیی کردبوو.

لە ماوەی چەند رۆژێکدا تاقمێکمان بۆ راوەدوونانی چاخیرجالی پێك هێنا. هیچ کام لە پیاوەکانی ئەو دەستە چل و پێنج کەسییە، لە تفەنگچییەکانی چاخیرجالی کەمتر نەبوون. هەموومان ئەوپەڕی متمانەمان بە یەکتری بوو. ئەوەی یارمەتیی دابووین بۆ هەڵبژاردنەکە و یارمەتیی دابووین بۆوەی بتوانین دەستەیەکی تەواو لە نێوان لێوەشاوەترین کەسەکاندا گوڵبژێر بکەین، کابرایە بوو بە ناوی "حاجی دۆك کامیل". ئەو کابرایە، پیاوێکی بە ئەزموون و زۆریش بەتین و گوڕ بوو. تەمەنی لە نێوان چل و پێنج تا پەنجا ساڵ دەبوو و خۆشی لە هەق لانەدەین ئازایەکی بێوێنە بوو. "حاجی دۆك کامیل" بەتەمەنترین کەسی گرووپەکەمان بوو.

لە چەند هێرشێکدا بەشدار ببوو و لە هێرشێکیشدا فیشەکێکی بە لاقی کەوتبوو. هەر بۆیە لاقی دەشەلی. لەوانەیە گەنجی ئەمڕۆ نەزانن، لەو کاتدا دەستەیەك هەبوون بە ناوی رێکخستنی "رەژی". ئەمڕۆ ئەو رێکخستنە ناوی نراوە دایرەی پاوانەکان. ئەو کات حاجی دۆك سەرپاسەوانی رەژی بوو.

## ******* پاخو *******

ڕەشیدترین و چاونەترسترین پیاوی ئەو کات، ئەوانە بوون، کە قاچاخچێتیی تووتنیان دەکرد و بۆ شەڕ لەگەڵ قاچاخچیی تووتن، کەسی وا پێویست بوو، لە قاچاخچییەکان ئازاتر و ڕەشیدتر بن. ئەو ئازا و بوێرانەش پاسەوانەکان بوون. دەی دیارە بەرپرسی پاسەوانان کارێکی سانا نەبوو...

سەرپاسەوان دەبوو پیاوێکی لە رادەبەدەر بە ئەزموون و ئازا بێ. دیارە حاجی دۆك کۆنە قاچاخچییەك بوو... دوای ئەوەی ببووە بەرپرسی پاسەوانەکان، جووقەواری لە قاچاخچییەکانی ئەو ناوچەیە بڕیبوو.

"کۆزلی کەلی محەمەد بەگ"یش هاتبووە گەڵ گرووپەکەمان. قەت چاوەڕوانیمان نەدەکرد. ئەویش غیرەتی وەبەر نایەن. ئەو کات "محەمەد بەگ" لە "مانیا" دەژیا. براکانی لە بازاڕی جزیرە بوون و ئەویش هاتبوو سەریان لێ بدا. کە لە ناوچەی ئێژە بوو، ماوەیەك وەشوێن چاخێرجالی کەوتبوو.

لە "مانیا" کابرایەك هەبوو بە ناوی "حەسەن بەگ"، کە محەمەد دەشتەوانی ئەو بوو. ئەو کات سی و پێنج ساڵانە بوو. ئێمەش پێویستمان بە یەکێك بوو، ئێژە وەك بەری دەستی شارەزا بێ. زۆرمان پێ خۆش بوو کە زانیمان محەمەد بەگ، بن هەموو بەرد و لاپاڵ و دەوەنێکی ئەو ناوچەیە، وەك بەری دەستی شارەزایە.

جگە لەوانەش، کەسانی وەك "ئانزاوور ئەحمەد"، "عەلی گاور"، "ئەلیاس پاڵەوان"، "قۆجە مەمەد" و "جافر شامیل"یش لە دەستەکەماندا بوون.

عەلی گاور قاچاخچییەك بوو. پاسەوانەکان هەر نەیاندەوێرا توخنی بکەون. ناوبانگی ئازایەتی و زیرەکییەکەی لە بۆلۆوە هەتا ئەنکەرە و لە ئەنکەرەوە

## ******* یاخی *******

تا سیواسی داگرتبوو. له تێکهەڵچوون و شەڕە تفەنگەکاندا، زۆر پاسەوانی کوشتبوون، بەڵام دواتر خۆیشی جلوبەرگی پاسەوانانی لەبەر کردبوو. پێیان دەگوت "گاور"، چونکە بەسەر کەسەوە نەدەچوو.

"ئانزاوور ئەحمەد" بە کابرایەکی کەللە ڕەق ناسرابوو و لەبەر ئەوەی قسەمان لێك هەڵدەبەزییەوە، له "سالح لی" لێمان دابڕا.

ئەلیاس پاڵەوان یەکێك بوو لە یاخییە بەناوبانگەکانی کێوپارەی دۆزجێ. تازەش تۆبەی کردبوو و لە چیا هاتبووە خوارێ. بیست ساڵی ڕەبەق یاخیگەریی کردبوو و لەو سەردەمەدا تەمەنی چل ساڵان بوو.

گەنجی وەك "جافر شامیل و قۆجە مەمەد"یشمان لەگەڵ بوون، کە تەمەنیان هەر بیست و پێنج ساڵ دەبوو. ئەوانی دیکەش زۆربەیان یان قاچاخچی بوون، یان ئەو کۆنە یاخییانەی بەر لێبوردن کەوتبوون. ژمارەیەکیشیان خزم و کەسی خۆم بوون.

ئەوانە لە دۆزجێ کۆ بوونەوە. بە لە هەموو شتێك باسی کەسایەتی و ئازایەتییەکانی چاخیرجالیم بۆ کردن و پێم گوتن ئەو مەئموورییەتە زۆر مەترسیدارە. تێم گەیاندن، کە ڕاوەدوونانی چاخیرجالی سەدا پەنجا و بگرە سەداسەدیش مەرگی بە دواوەیە. گوتم، لەوانەیە چاخیرجالی هەموومان بکوژێ.

گوتم:

- ئەوانەی دەترسن، ئەوانەی دڵیان بە ژیانەوەیە، هەر لێرەوە با بڕۆن و بچنەوە ماڵی خۆیان.

بەڵام لەو چل و پێنج کەسە، یەك کەسیش نەڕۆیشت.

## ******* پاخر *******

گوتیان:

- ئێمه چاخێرجالی باش دەناسین و شانازییەکی گەورەیە بە دەستی ئەو بکوژرێین.

ئەوکات پیاوی وا هەبوو، بە شوێن شەرەف و شانازییەوە بوون. ئەوانە حەزیان لە کاری مەترسیدار و پڕ لە شانازی بوو.

گروپەکەم دایە دەست حاجی دۆك کامیل و محەمەد بەگ و عوسمان و پێم گوتن:

- ئێوە بە لای سەرووی "ئافیۆن"دا بچنە ئەزمیر و لەوێ چاوەڕێم بن. من دەبێ بچمەوە ئەستەمبوڵ. لە "سالّح لی" یەکتر دەبینینەوە.

حەبیب ئەگی پارلەمانتار لە "قانلی جا" دەژیا. بەبێ کات بەفیڕۆدان، چوومە ماڵەکەی و لەوێ چاوم پێی کەوت. ئەو حەبیب بەگە، هەر ئەوەیە وا رێگەچارەی مەسەلەکەی بۆ عەبدولحەمید روون کردبۆوە و تێی گەیاندبوو. سەرهەنگی تۆپخانە و بەرپرسی "یەکگرتووخوازەکان" بوو.

هەر من دیت، گوتی:

- چاوەڕوانت نەبووم. خەریك بوو بیرم لەوە دەکردەوە، کە بڵێی ئێستا روشدی بەگ لە ئەزمیر تووشی چ بەلایەك بووبێ. باشە، دەی بڵێ بزانم چیت دەوێ؟

گوتم:

- ناتوانم هەر وا سووك و سانا بڕۆم. دیارە خۆت دەزانی من کابرایەکم، کە دەستم دایە کارێك، ناچارم تا ئاخرییەکەی بەرم. مەحاڵە لەخۆوە کارێك

بکەم. هەر وەك لە نامەکەدا عەرزم کردووی، داوا دەکەم دەستم ئاوەڵا بکرێ.

- چۆن؟... بۆ وێنە لە چیدا؟

- ئەوەی من دەمەوێ دەستم لێی ئاوەڵا بێ و سەرکەوتنیشم تەواو بەو شتانەوە بەستراوەتەوە:

یەکەم: هەتا چاخیرجالی یەکلا نەکەمەوە، کەس فەرمانم بەسەردا لێ نەدا.

دووەم: تەنیا پەیوەندی بە یەك شوێنەوە دەکەم. ئەویش هەر والیی ئەزمیر.

سێهەم: لە ئاسنەڕێیەکەی ئەزمیر، لە هەر وێستگەیەك، چیمان ویست، دابین بکرێ.

چوارەم: دەسبەجێ، ئەمر و ئەرکی پێ ئەسپێردراوی هەموو ئەو دەستە سەرباز و جەندرمانەی لە ناوچەی ئەزمیر نێردراون چاخیرجالی بگرن، هەڵوەشێتەوە و ئەو ئەرکە تەنیا بخرێتە ئەستۆی خۆم و پیاوەکانم.

پێنجەم: ئیزن بدرێت، یەکێك لە خزمەکانی خۆم بەناوی نەقیب شوکری بەگ، کە یەکێکە لە ئەفسەرەکانی بنکەی جەندرمە و من تەواو تمانەم پێیەتی، لەگەڵمان بێ...

من ئەوانەم گوت و حەبیب نووسینی. کە لە نووسین بۆوە، گوتی:

- هەستە با بتبەمە لای "تەلعەت پاشا. "

لەگەڵ حەبیب بەگ، چوومە ئیدارەی تەلعەت پاشا و لە نووسینگەی کارەکەیدا چاومان پێی کەوت. پاشا وەریگرتین.

حەبیب منی ناساند و گوتی:

## ******* یاخی *******

- پاشا، ئەوە، ئەو روشدی بەگەیە، کە پێشتر باسیم کردووە. ئێستا دەیەوێ بچێتە ئەزمیر بۆ گرتنی چاخیرجالی، بەلآم بۆ ئەو کارە داوا دەکات، حکوومەت لە هەموو شتێ دەستی ئاوەلآ بکات.

پاشا زۆر لە چاخیرجالی توورە بوو. لە دەستی وەزالە هاتبوو. پێی قەبوول نەدەکرا، هێزە چەکدارەکانی ئیمپراتۆرێکی گەورە و بەشکۆ، هیچی لەگەل یاخییەکدا پێ نەکرێ.

دوای هەندێ گلەیی و گازندە، رووی لە من کرد و گوتی:

- زۆرم شت لە بارەی تۆوە بیستووە روشدی بەگ. دەلێن، زۆر لێوەشاوەی بۆ راوەدوونان و گرتنی سەربزێوەکان. ئێستا فەرموو بزانم دەتەوێ دەستت بۆچی ئاوەلآ بێ؟

کە پاشا ئەو قسانەی کرد، حەبیب بەگ دەستی لە گیرفانی نا و دەفتەری یادداشتەکەی دەرهێنا و یەك بە یەك داخوازییەکانی منی بۆ خوێندەوە.

پاشا هەستا. فرمێسکی لەچاویدا قەتیس مابوو. لە باوەشی گرتم. نێوچاوانی ماچ کردم و گوتی:

- پارووی زۆر گەورەت هەلگرتووە. هەتا ئەمرۆ هیچ فەرماندە و مەئمووریك داوای ئەو دەسەلآتەی نەکردووە. هەر لە ئێستاوە وابزانە نیوەی شتەکانت چارەسەر بوون. تەنانەت بەلێن بێ، حکوومەتیش ناچار دەکەم، هەموو داخوازییەکانت بەجێ بێنێ و پێیان قایل بێ. هەر لە ئێستاوە پیرۆزباییت پێ دەلێم.

پاشا وەجۆش هاتبوو. لەسەری رۆیشت:

- سەرم لەو چاخیرجالییە سوور ماوە. ئەوە دەبێ کابرایەکی چۆن بێ؟

## ******* یاخی *******

دوایی بۆ نانی نیوەڕۆ بردینییەوە ماڵەکەی خۆی. لە سەر سفرەش هەر باسی چاخیرجالیی دەکرد:

- پیاوی وەك سەعید پاشا باشاری نەکرد. حکوومەت بۆ ئەوەی ئەم بەڵایە لەکۆڵ بکاتەوە، ناچار بوو داوای کرد سەعید پاشا لە سالانیکەوە بێ. سەعید پاشایەك، کە ناوبانگی ئازایەتییەکەی هەموو دونیای تەنیبۆوە. جا ئەو هەمووە سەربازەشی لەبەر دەستی دابوو. سەعید پاشا ساڵێکی رەبەق هەوڵی دا، بەڵام هیچی پێ نەکرا. ئاخرییەکەشی دەست لەگونان درێژتر هاتەوە و دەستی لە کار کێشایەوە.

تەلعەت پاشا، باسی ئەو بەزین و شکستانەی کرد، کە چاخیرجالی تووشی هێزەکانی عوسمانیی کردبوون و گوتی:

- کارێکی ئەستەم و دژوارت لە پێشە روشدی بەگ. کارێك، کە ئەفسەرێکی ئازای وەك سەعید پاشا پێی رانەپەڕی.

کە لە ماڵەکەی پاشا هاتینە دەرێ، حەبیب بەگ رووی لە من کرد و گوتی:

- لەوانەشە سەرنەکەوی روشدی، ئەی ئەو دەم چ بکەین؟ ئەگەر تۆش بشکێی، پاشا شێت دەبێ. ئێستا هەموو هیوای بەتۆیە.

وەڵامم داوە:

- جوان گوێ بدەیە حەبیب بەگ. هەر لێرە مەردانە بەڵێنت دەدەمێ. ئەگەر سەرنەکەوتم، واز دێنم لە سوپا و لەگەڵ هەر پێنج براکەم خۆم وەشوێن چاخیرجالی دەکەوم. یانی وەك ئەو یاخی دەبم و دەچمە شاخ. جا یان چاخیرجالی ئێمە دەکوژێ، یان ئێمە ئەو دەگرین. من مەرگم پێ باشترە لەوەی لەبەر چاخیرجالی ببەزم.

# ******* یاخی *******

حەبیب بەگ پرسیی:

ـ بەڵێنەکەت پیاوانەیە روشدی؟

دیسان بە سەرسووڕمانەوە پرسی:

ـ یانی بەڵێنەکەت دەبەیە سەر؟

ـ بەڵێنی شەرەف دەدەم حەبیب بەگ.

ـ ئیشەڵا سەر دەکەوی. کە سەرکەوتی، ئیتر ناچار نی، کاری دیکە بکەی.

ئەوجار پێکەنی و گوتی:

پیاوی دەوڵەت و یاخیگەری؟

لێك هەڵبڕاین. من شوکری بەگم هەڵگرت و هەر ئەو رۆژە بەرەو ئەزمیر کەوتمە رێ. ئەو هاوڕێیانەی لە دۆزجیێوە رۆیشتبوون، لە سالح لی چاوەڕێم بوون. لە سالح لی یەکمان گرتەوە.

هاوڕێکانمم برد و هەر ئەو رۆژە بەرەو ئەزمیر کەوتینە رێ. لەوێ چووینە لای "نازم پاشا" والیی ئەزمیر. ئەو نازم پاشایە بەناوبانگەیە وا لە پۆستی وەزارەتی ناوخۆی "عەبدولحەمید"ی لە ئەستۆ بوو و دواتر لەبەر ئەوەی نەیتوانیبوو، ئاژاوەکەی چاخیرجالی ببڕێنێتەوە، لە وەزارەتیان خست، هەر ئەو ژانەش کاری لە مێشکی ئێسقانی دەکرد.

دەیگوت:

ـ دەیگوت ئەو دەمەی وەزیر ناوخۆ بووم، هەر خودا دەزانێ چ دەردێکم دی لە دەست ئەو یاخییانە. هەر ئەو بوو سەرشۆڕی لای پاشای کردم. ئەو بووە هۆی ئەوەی پۆستی وەزارەتەکەم لەدەست بدەم. دڵنیام هەر لە سۆنگەی ئەویشەوە، ئەو پلەی پارێزگارییەشم لەدەست دەدەم. ئەو کابرایە کاری بە

******* یاخی *******

حکوومەت نییە. هەر دوژمنی منە. بووەتە بەلای ئەو گیانە داماوەی من. خودا ئەو پیاوەی دروست کردووە، ببێتە بەلای سەری من. نازانم قوڕی کوێ بەسەرمدا بکەم. دەستەوستانی کردووم. ئەوە شەیتانیش نەبێ، برای شەیتانە. ئەو پیاوە، ئاوایە. بیهێنە بەر چاوت روشدی بەگ، فەرماندەیەکی لێوەشاوەی وەك "مەحموود موختار پاشا" بەخۆی و پێنج سەد کەس لە پیاوە هەرە ئازاکانی، لە شیوەداردا گەمارۆی دەدەن، ئەو زۆڵە گەمارۆکە دەشکێنێ و قوتار دەبێ و زەبرێکی گورچووبڕیش لە هۆردووە گەورەکەی مەحموود پاشا دەدا. ئەوە شەیتانێکی ئاوایە. ئێستاش هەموو هیوامان بە ئێوەیە. ئێوە ئاخرین هیوامانن. دەزانی دەڵێم چی؟ دەزانی بەشوێن کێوەی؟

- تێگەیشتم پاشا. منیش وەك هەمووان چاخیرجالی دەناسم و هەوڵ دەدەم باشتریش بیناسم. یەکەم کاریشم هەر ئەوە دەبێت بزانم کابرایەکی چۆنە. لەوانەیە ناچار بم ساڵێك پتر لێرە بمێنمەوە، بەڵام هەتا ورد ورد نەیناسم دەست بۆ هیچ شتێ نابەم. هەڵەی هەرە گەورەمان ئەوە بووە، بەبێ ئەوەی بە وردی بیناسین، وەشوێنی کەوتووین. دەبێ باش باش بیناسین. دەبێ بزانم چ دەخوا، چۆن دەنوێ، جلوبەرگەکانی چۆنن، چۆن قسان دەکا، بیر لە چی دەکاتەوە، کورتی ببڕمەوە دەبێ ورد ورد هەموو کەلێن و قوژبنەکانی ژیانی بناسم. من نەهاتووم ماوەیەك وەدووی بکەوم و دوایی دەسبەتاڵ بگەڕێمەوە. ئەو ئەرکە، بۆ من وەك مەرگ و ژیان وایە. یان دەبێ بیگرم، یان بەدەستی وی بکوژرێم. من هاتووم ئیتر نەهێڵم میللەتێکی گەورە زەلیل و داماوی بەردەستی یاخییەك بێ.

## ******* پاخر *******

پاشا سپاسی کردم و گوتی:

ـ روشدی بەگ، ئەگەر وات بڕیار داوە، کاتت هەیە هەندێ شت لەسەر چاخیرجالی لە منْ فێر بی. چەند ڕۆژێك لێرە بمێنەوە و میوانی من بە، بۆ ئەوەی باسی بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەوت بۆ بکەم. پێم وایە، منیش هەندێ شتی لە بارەیەوە دەزانم.

- بەچاوان پاشا. دەمێنمەوە. زۆر سوپاسی ڕێز و خۆشەویستیت دەکەم. چۆنی تۆ بخوازی.

دوو ڕۆژ لە ئەزمیر مامەوە و میوانی پاشا بووم. پاشا هەندێ شتی لە بارەی چاخیرجالییەوە پێ گوتم، کە ئەقلّ نەیدەبڕی. دەبێ سەرلەنوێ دەست پێ بکەمەوە. دەبێ چیی دیکە لەبارەیەوە فێر بم؟ بێ ئەملاو ئەولا هەموو کەسێك کەمایەسیەکی هەیە. من گەیشتبوومە تەمەنێك، ئەو شتانە بزانم. هیچ کەس کاملّ و بێ کەموکورتی نییە. دیارە چاخیرجالی کابرایەکی مەزن بوو. تایبەت بوو و وا بە سووك و ساناییش نەدەکرا بیناسی و بزانی کەمایەسییەکەی چییە. دەبوو جوان لە ژیانی ورد بمەوە و تەنانەت لە سەردەمی منداڵییشی. دەبێ فرتوفێڵەکانی بزانی. گرنگترین مەسەلەی ئێمەش ئەوەیە: چاخیرجالی کێیە؟ تاقە شتێکی دەبێ بیزانین، هەر ئەو مەسەلەیەیە و ئەوەش کارێکی ئەستەمە.

لە ئەزمیرەوە چوومە ئۆدەمیش و بنکەکەی خۆمم دامەزراند. سێ مانگ لەوێ مامەوە. لەو سێ مانگەدا هیچ خۆم لە چاخیرجالی نەگەیاند* و هیچ وەشوێنی نەکەوتم. چاخیرجالی دەهری دەبوو. لێی رادەسپاردم:

---

*خۆتێگەیاندن: خۆ لێدان.

## ******* پاشکۆ *******

"ئەگەر فەرماندەی تاقمی راوەدوونانە، با بۆم بێ. من ئەوە لە فلانە شوێنم. ئەی بۆ نایە؟ ئەو لەسەرێتی بێ."

من هەر گوێشم نەدەدایێ. چاخیرجالی لە پەناگوێمەوە پیاو دەکوژێ، مالان تالان دەکا و دەست لە هیچ ناپارێزێ، بەلام من وەك مێشێکیشم لێ میوان نەبێ. هەر هەولێ دەدەم وردە وردە لە خەلکەکە نزیك ببمەوە و کۆمەلێك زانیاری لە بارەی چاخیرجالییەوە، لە خەلك و بەتایبەتی لە دەرەبەگەکان وەرگرم. وا دەجوولێمەوە، وەك بلێی نەك بۆ راوەدوونانی نەهاتووم، بگرە هەر حەزم لە مێژووی ژیانی چاخیرجالییە. وەك بلێی ئاشقی ژیان و بەسەرهاتی ئەوم. خەلك و دەرەبەگەکان بۆ ماوەیەك هەر نازانن من بۆچی ئەوانەم پێ خۆشە. پێیان سەیرە.

بە یارمەتیی شوکری بەگ، بچووکترین شەڕ و پالەوانێتی و تووڕەیی و بزۆزی و نەخۆشی و خووخدەکانی چاخیرجالی یادداشت دەکەم و هەموو شەوێ ئەو یادداشتانە لە دەفتەرێکدا دەنووسمەوە.

هەموو ئەو زانیارییانەم لە تفەنگچییەکانی پێشووی چاخیرجالی و لە گوندی و خزم و کەس و مامۆستاکانی و ئەو دەرەبەگانەی دۆستایەتیی ئەویان کردووە و ئەو جەندرمانەی راویان ناوە و لە دوژمنەکانی، وەردەگرت.

لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا زۆربەی تایبەتمەندییەکانی ژیانی چاخیرجالیم بۆ روون بۆوە و تێی گەیشتم.

لێرەوە سەربردە و رووداوەکانی ئەو کۆتایی دێت. لێرە بەولاوە، دێمە سەر ئەو شتانەی لە نێوانماندا هاوبەشن.

## ****** پاخو *******

زۆربەی حەشارگەکانیمان ناسیوە و لەگەڵ خووخدەی ئاشنا بووین. ئەو دەمەی خەریکی ئەو کارانە بووین، ئەو بە ئاشکرا دەهات و دەچوو و زۆر بێ ترس دەهاتەوە ماڵەکەی و بەبێ خەمی لە ماڵەکەیدا دەژیا. ئێمەی بەهیچ دانەدەنا. یانی ئێمە ئاگامان لە کار و کردەوەی نەبوو؟ خۆی وای دادەنا. منیش هەر ئەوەم دەویست. دەمەویست چاخیرجالی هەر بە بنیادەمیشم دانەنێ.

گرنگترین شت بۆ ئێمە، بەتایبەتی بۆ عوسمانی برام ئەوە بوو، رواڵەت و قەلافەتی چاخیرجالی بناسێ. چ جلوبەرگێك لەبەر دەکا؟ لە رواڵەتدا چ جیاوازییەکی لە یاخییەکانی دیکە هەبوو؟ وەك بیستوومان، جلوبەرگی ئەفە لەگەڵ تفەنگچییەکانی پێشوو، تۆزێ کورتتر و پانتۆڵەکەی وەك پانتۆڵی "رۆملۆ"ەکان گنج گنج بوو. پەستەکەکەی، لە هیی چیایەکان بوو. پەستەکێکی سادەی رەشی لەبەر دەکرد... کڵاوەکەشی زۆر سادە بوو. من هێشتاش پێم سەیرە. ئەفەیەکی زیرەك و بەهۆش و گۆشی وەك چاخیرجالی، چۆن جلوبەرگێکی لەبەر دەکرد، کە لە نێو خەڵکەکەدا جوان بناسرێتەوە؟ چۆن هیچ بنەمایەکی نهێنی پارێزیی رەچاو نەدەکرد؟ باشە نەیدەزانی هەمووان چاویان لەسەرێتی؟ خۆ گوتم، هەتا ئێستاش سەرم لێی سوور ماوە. کە بەگوێرەی پێویست لێم کۆڵییەوە و جوان ناسیم، تازە تێگەیشتم گرتنەکەی زۆریش ئاسان نییە. ئەوەشم لێ روون بۆوە، کە چاخیرجالی هەرگیز حەزی لە یاخیگەری نەبووە. ئەگەر بە لێخۆشبوون قایل بوایە، دەمتوانی لەبەر خاتری ئەو تا کۆشك، هەتا لای تەلعەت پاشا بچم و هەمووان رازی بکەم لێی خۆش بن. بەو بەڵگانەی بە دەستمەوە بوون، زۆر بە ئاسانی

## ******* یاخی *******

دەمتوانی تەلعەت پاشا قایل بکەم، کە ئەفە زگماك یاخی نییە. تەلعەت پاشا کابرایەکی دادپەروەر بوو. لەو شتانە تێدەگەیشت. پاشا خەڵك خۆشەویست بوو.

بۆ ئەوەی دادپەروەرانە جووڵابێمەوە و ئەفە لە مەبەست و بیر و بۆچوونی خۆم تێ بگەیەنم، "ئێراز خاتوون"ی هاوسەریم بانگ کردە بنکە. ئێراز هات. پێم گوت:

ـ خاتوون، سڵاوی من بگەیەنە ئەفە. پێی بڵێ ئەمن دوژمنت نیم. ئەو پیاوێکی رەشیدە. جوامێرە. قەت حەزی لە یاخیگەری نەبووە و حەزیشی لێ نییە. ئەگەر بەڵێن بدا لە چیا بێتە خوارێ، من دەچمە ئەستەمبوڵ و ئەو، وەك چۆنە ئاوا، بە بەرپرسانی حوکمەت دەناسێنم. ئەگەر قەبووڵیشی نەکا، هەر لە ئێستاوە پێی دەڵێم، هەرچۆنێکی بێ، زیندوو یان مردوو دەیگرم. من وەك نێردراوەکانی پێشوو نیم. نەهاتووم چەند رۆژێك وەدووی کەوم و دوایی بە دەست بەتاڵی بڕۆمەوە. من و هاورێکانم هاتووین بۆ ململانێی مەرگ و ژیان. باش دەزانین خەنیمەکەمان کێیە، هەر بۆیە خۆمان بۆ مەرگ ئامادە کردووە.

دواییش ئێراز خاتوونم تێگەیاند، کە چۆن چەند مانگە لێی دەکۆڵمەوە و هەموو شتێك لە رەگی قوونی ئەفە گەیشتووم. بۆم روون کردەوە، کە پیاوەکانیشم لە چ قوماشێکن و چییان لە دەست دێ.

ـ ئێراز خاتوون، هەستە و بچۆ لای ئەفە. پێی بڵێ بە لێبوردنەکە رازی بێ. من هەر لێرە بەڵێنت دەدەمێ، ئەگەر حوکمەت ئەزیەتی بکا، منیش تفەنگ

## ******* پاشخ *******

هەڵدەگرم و وەك تفەنگچییەكی خۆی، دەچمە شاخ. ئەو كات ئیتر هیچ كاممان نایەینە خوارێ. بەڵێنی دەدەمێ. هەستە و بچۆ بە ئەفەت بڵێ.
ئیراز خاتوون بیری كردەوە و تاوێك لە جێی خۆی نەبزووت.
- بیر لە چی دەكەیەوە ئیراز خاتوون؟
چاوی پڕ ببوون لە فرمێسك. وەڵامی دامەوە:
- هەتا ئەمڕۆ زۆر پیاوی دەوڵەت هاتوونە ئێرە، بەڵام هیچكامیان وەك تۆ نەبوون. هیچ كام ڕێزیان لە من نەگرتووە. هەمووشیان كەم تا زۆر ئەزیەتیان داوم. لە تۆ دەترسم. ئەمڕۆ هەموو قسەكانت بە وردی بۆ ئەفەم دەگێڕمەوە. پێی دەڵێم، تۆ دەچیتە لای تەلعەت پاشاش.
- ڕووت سپی بێ ئیراز خاتوون. ئیشەڵڵا بە لێبوردنەكە قایل دەبێ و دێتە خوارێ.
ئیرازخاتوون هەموو پەیامەكانی منی بە كابرایەكدا بە ناوی حوسێن، گەیاندبووە ئەفە.
بە حوسێنی گوتبوو، بە ئەفەی بڵێ:
- "ئەفە گیان، ئەو پیاوەی هاتووە، هیچ لە فەرماندەكانی پێشوو ناچێ. هیچ ئازاری نەدام. سووكایەتیی پێ نەكردم. زۆریشی ڕێز گرتم. تكا دەكەم بۆ هەمیشە لە چیا وەرە خوارێ. ماوەیەكە خەونی زۆر ناخۆشت پێوە دەبینم. بەردەوام خەونی ئاڵۆز و دۆڵپا دەبینم. "
ئەفە، كە گوێی لەو هەواڵانە دەبێ، لە فكرەوە دەچێ. چ بكا؟ ئاخۆ شاخ بەجێ بێڵێ و بێتە خوارێ؟ بە دڵنیاییەوە ڕووداوەكانی ساڵانی پێشووی دێتەوە بیر. چونكە بە تفەنگچییەكانی دەڵێ:

******* پاخر *******

ـ ئەمنیش خەونێکی سامناکم دیتووە. لە خەومدا لە دەشتێکی پان و بەریندا ون بووم. لە پڕ کۆگای لم دەوریان گرتم. دەتگوت دەشتی یەمەنە. وەڕێ دەکەوم، بەڵام نازانم چەندە ڕۆیشتووم. وەك ئەو سەربازانەی چوونەتە یەمەن و ون بوون. ماندوو و شەکەتم و برستم لێ براوە. لە پڕ دەبینم چەند قووڵکە و بیر لە بەردەممن. هاوار دەکەم. ئاو. بەرەو بیرەکان رادەکەم، بەڵام هەموو وشکن. دەمەوێ سەر بە هەموو بیرەکاندا بکەم. دەیانژمێرم. چل و چوار دانەیان دەژمێرم و لە پڕ دەکەومە نێو چلوپێنجەمین بیر و دەخنکێم. پێم وایە دەکەوینە تەنگانەوە. تۆ دەڵێی چی حاجی؟ تۆ پێت باشە چیا بەجێ بێڵی؟

حاجی تووڕە دەبێ:

ـ یانی ئێمە هەموو کارەکانمان کردووە؟ ئیتر لەو شاخانە کارێکی دی نەماوە بیکەین؟ دەی باشە چ پەلەتە؟ لێگەڕێ با "مارتینی"ـیە ژەنگ گرتووەکانمان دەنگ و هەڵلایەك بنێنەوە. ئەو کات جا دەردەکەوێ کێ لە چلوپێنجەمین بیردا دەخنکێ؟ دەی دەڵێی چی ئەفە؟

ئەفە وەك پڵنگێکی مەغروور وایە. ناتوانێ ترس و نیگەرانیی خۆی بشارێتەوە. وەڵام دەداتەوە:

ـ باشە حاجی.

حاجی روو دەکاتە نێردراوەکەی ئێراز و دەڵێ:

ـ سڵاوی ئێمە بەرەوە بۆ ئێرازخاتوون و پێی بڵێ، ئەفەمان گوتی:" من باش دەزانم چ دەکەم. خۆ لەو کارانە هەڵنەقورتێنێ. "

## ******* یلخو *******

حوسێن دەگەڕێتەوە و ئەوەی دیویێتی و بیستوویەتی، هەمووی بۆ ئیراز دەگێڕێتەوە. خەونەکەی ئەفەشی بۆ دەگێڕێتەوە.

یانی، چاخێرجالی نایەوێ لێبوردنەکە قەبووڵ بکا. خۆشم هەر پێم وابوو. ئەو پیاوە هەر جارێکی چیای بەجێ هێشتووە، زوڵم و ناهەقیی لە پیاوانی حوکمەت دیتووە.

دەبوو خۆی بۆ تەیار بکەم. ئێستا ئیتر دەبێ بەرەنگاری چاخێرجالی ببمەوە. لەوەتەی سەربردەی ژیانی چاخێرجالیم لێ روون بۆتەوە. بەردەوام لە ناخمەوە دەنگێك بانگم دەکا:"واز لە چاخێرجالی بێنە و بڕۆ. حەیفە ئەو پیاوە نەمێنێ. " بەڵام دەسبەجێ دەکەومەوە بیر بەڵێنەکەم. تازە بشگەڕێمەوە، هاوڕێکانم ناگەڕێنەوە. جگە لەوەش، چاخێرجالی پڵنگێکی برینداره و پەنای بردووەتە بەر شاخ. تووشی هەر کەس بێ، دەیکوژێ. ئەو کابرایە لە پێناوی زیندوومانەوەدا، بۆ ئەوەی سەعاتێك و بگرە چرکەیەك پتر بژیێ، لە هیچ شتێ ناپرینگێتەوە. کاری وا دەکا، ئەقڵ نایبڕێ. "

منیش کەسێکی ساویلکە نەبووم. لە راستیدا ئەو حاڵەتەی چاخێرجالی نیگەرانی دەکردم، بەڵام لە لایەکیشەوە گەنج بووم. غروورم هەبوو و هەر بۆ پاراستنی ئەو غروورەشم بووبێ، ئامادە بووم خۆ بە هەموو مەترسییەکدا بدەم.

ماوەیەکی زۆر بوو دانیشتبووم و بیرم لە ئاکامی کارەکە دەکردەوە، کە لە پڕ یەکێك لە سیخوڕەکانم هات:

## ******* پاشکۆ *******

چەند سەعاتێك لەوە پێش چاخێرجالی هەڵیکوتایە سەر ناوچەی ئارپاز. عوسمان بەگ و پارێزەرەکەی حاجی سمایلی هەڵگرت و بەرەو چیا کەوتە ڕێ. هێشتا نەگەیشتبوونە چیا، حاجی سمایلی کوشت.

سێزدەی مانگی (کاسم)* بوو. سەعات نۆی شەوێ کەوتینە ڕێ و بەرەبەری بەیانی گەیشتینە نازیللی. ئەو کات قایمەقامی نازیللی کابرایەك بوو بەناوی حەیدەر بەگ. هەر ئەو حەیدەر بەگەکی دواتر بوو بە والیی ئەستەمبوڵ. ئەو حەیدەر بەگە کۆمەڵێك وتاری بە ناوی "چۆن چاخێرجالیم گرت" نووسیبوو و بۆ ڕۆژنامەکانی ناردبوو.

چاوم بە حەیدەربەگ کەوت و پیم گوت:

١. هەتا شەڕەکە نەبڕێتەوە، هیچکام لە مەئموورەکانی شار، بۆیان نییە تاقە یەك وشەش لە بارەی ئەو شەڕەوە بۆ هیچ کوێ بنێرن.

٢. تەنیا بۆیان هەیە ئەو شتانە رابگەیەنن، کە من نووسیبێتم و ئیمزای خۆمی پێوە بێ.

٣. لەوانەیە هەندێ کەس بێنە لات و بڵێن کۆمەڵێك زانیارییان لەسەر چاخێرجالی پێیە. تەنانەت لەوانەیە کەسانێك بێنە لات، خزم و کەسی خۆت یان بەرپرسانی شار بن. ئەوانە، هەر کەس بن، بیانگرە و بیاننێرە لای ئێمە.

٤. ئەگەر یەکێك هات و گوتی من ناردوومە، بێت و نامەی منی پێ نەبێ، قۆڵبەستی بکە.

## ******* پاخر *******

دوای ئەو راسپاردانە، بەرەو شوێنەکەی عوسمانی بەگی ئارپاز کەوتینە رێ. لەوێ دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە. دیارە پێویست بوو بچمە ئارپاز. چووم و لەوێ مامەوە.

لەو کاتەدا دوو کەس بە ناوەکانی مەجید و یاقوب هاتنە لام. ئەوانە برازای حاجی سمایل بوون. هەر ئەو حاجییەی چاخیرجالی کوشتبووی. ئەو دووانە بۆ متمانە دەبوون. گەنج و چاونەترس بوون. دەکرا هەواڵی راستیان پێ بێ.

یاقووب:

ـ مامميان لە شیوێکدا، لە سەر رێی کارینجالی کوشتووە، بەلام ئەوە فێڵە. چاخیرجالی ئەو تەڵە و داوانە دەنێتەوە. لە شوێنێك گێچەڵێك دەنێتەوە بۆ ئەوەی هەمووان بیر لەوێ بکەنەوە، بەلام خۆی لە شوێنێکی دیکەیە. بە رواڵەت وای نواندووە ئەوە لە چیای کارینجالییە، بەلام ئەگەر راستیت دەوێ ئێستا لە چیای "دایکان"ـە.

ـ دەی ئەگەر وایە، ئێستا ئێوە بڕۆن و جلوبەرگی جەندرمان لەبەر بکەن.

لەگەڵ نەقیب شوکری بەگ و حاجی دۆك کامیل و عوسمانی برام لە ژوورێکدا کۆ بووینەوە. تەگبیر و رامان کرد و بڕیاری پێویستمان دا.

ئەگەر چاخیرجالی چووبێتە دایکە چیا، وا باشترە بچینە کارینجالی، چونکە لەو دەوروبەرانە داروبەرد سیخوڕی چاخیرجالین. بە دڵنیاییەوە ئاگاداری دەکەنەوە کە ئێمە چووینەتە کارینجالی. هەر بۆیە ئەو بەبێ خەمی لە دایکە چیا پاڵی لێ دەداتەوە. کاتێ برێك بەرەو کارینجالی رۆیشتین، لەوێوە لەپڕ سەری ئەسپەکانمان وەردەسووڕێنین و بەرەو لای دایکان بای دەدەینەوە.

******* یاخو *******

سیخوڕەکان وا زوو ناتوانن رەوگەی ئێمەی پــێ رابگەیـەنن. ئێمـە وامـان بـیر دەکردەوە و هەر واش دەرچوو.

یاقووب:

- لە "دایکە چیا" کابرایەك هەیە بەناوی ئەحمەد ئاغا. ماڵەکەی ئەو، یەکێکە لە ئەمینترین حەشارگەکانی چاخیرجالی. ئەگـەر چـاخیرجالی لـەوێش نـەبێ، ئەو جێیەکەی هەر دەزانێ. دەزانێ، بـەڵام بشـیکوژی، هـیچ نـادرکێنێ. هـەر بۆیە من پێم وایە چاخیرجالی بێ ئەملاولا لە دایکە چیاە.

بنار و داوێنی چیای کارینجالی پڕ بوو لە رەشماڵ. ئێمە ئەسپەکانمان بـەرەو دایکە چیا لینگ دەدەین.

عوسمان لە پڕ ئەسپەکەی ڕاگرت:

- شوکری، لەو رەشماڵانەی سەرەوەدا جموجۆڵێکی زۆر هەیـە. دەبـێ شـتێك لەگۆڕێ بێ. تۆ دەڵێی چی؟

- پێنج کەس بەرە و راستەوڕێ بچۆ ئەوێ.

عوسمان رۆیشت. ئێمەش بەدوویدا رۆیشتین. سێ رەشماڵی شپرێومان دیـت. باروبنە و نوێن و بانیان خڕ کردبۆوە و لەسەر یەکیان دانابوو. هەر هـەمووش بە گەورە و بچووکەوە خەریك بوون. کە ئێمەیان دی، دەست و پێیان تێکـەڵ هات. سەیرێکی ئێمەیان دەکرد و چاویان دەچۆوە سەر نوێن و بانەکانیان.

- بە رواڵەت هیچ شتێکی گوماناوی بەدی ناکرێ، بەڵام ئەی ئەو جموجۆڵە بـۆ چییە؟

عوسمان:

- چی دەبێ با ببێ، دەبێ ئەوانە بپشکنم.

## ******* پاخر *******

لە ئەسپەکەی دابەزی و دەستی کرد بە پشکنین. پیاوێکی چەکدار لە بن یەکێك لە نوێنەکان هاتە دەرێ. عوسمان هاتە لای من و بە زمانی ئابازایی گوتی:

- تۆ چۆن بیر دەکەیەوە بکەوە، بەڵام ئەو کابرایە

- کەیفی خۆتە تۆ چۆن بیر دەکەیەوە، بەڵام ئەو کابرایە لە پیاوێکی باش ناچێ. چما نەتدی لە کوێ هاتە دەرێ؟ بێ و نەبێ ئەو نوێن و بان و باروبنەیەیان لەبەر ئەو پیاوە کۆ کردووەتەوە.

بە هەمووانم گوتبوو، لە کاتی ئاوادا بە زمانی ئابازایی قسە بکەن.

گوتم:

- راست دەکەی. جا ئێستا دەبێ لەو کابرایە بکۆڵینەوە.

بانگی کابرام کرد. گەنجێکی کەڵەگەت و لاواز بوو. دیار بوو پیاوێکی باشە.

- ها کورم. تۆ کێی؟ دەڵێی دەتناسم. لەوانەیە لەگەڵ یەکێکی دی لێم تێك چووبی.

- من حوسێنم. کوڕەکەی فاتمە سوڵتان.

- پێشتر تۆم لە کوێ دیتووە؟ ئاشنا دیاری. بابت کێیە؟

- برایم. پێشتر جەندرمە بوو.

- ئەها. برایمەکەی خۆمان. باب پیاوێکی باش بوو. پێکەوە زۆر دۆست بووین. دەی بڵێ بزانم حوسێن. چاخیرجالی لەکوێیە؟

- نازانم.

## ******* پلخر *******

- گویّ بدەیە حوسێن. لە سەر بابت تۆ ئەزیەت ناکەین. هەر پێشت نالێن پشتی چاویشت برۆیە. جا ئێستا راستییەکەمان پیّ بلّیّ، چاخیرجالی لە دایکە چیایە یان لە کارینجالی؟

- ئەها، چاخیرجالی؟ لە دایکەچیایە.

- زۆر باشە حوسێن. بابت پیاوێکی راستەقینە بوو. بڕوا بە قسەکەت دەکەم. پێکەوە دەچینە دایکە چیا و ئەویّ دەگەڕێین. وەپێش کەوە.

لە سیّ لاوە دایکە چیامان گەمارۆ داوە. هەتا لوتکەکەیمان کێومالّ کرد، بەلاّم تووشی کەس نەبووین.

ئەگەر راستیت دەویّ، بڕوام بە قسەی حوسیچن نەکردبوو. سەرەڕای ئەوەش دایکەچیام کێومالّ کرد. دەبوو سەر لە چاخیرجالی تێك بدەم. لە لایەکی دیکەشەوە، دەبوو تەواو دلّنیا بم، کە ئەو لە کارینجالییە.

چاخیرجالی نەیدەتوانی من لە داو بخا. من دەمزانی چ دەکا. سەنگەرەکانیم باش هەلّنابوو، هەر بۆیەش کاتێك لەویّ نزیك دەبووینەوە، پیاوەکانم بلاّو دەکردەوە و کە مەترسی نەدەما، دیسان لێك کۆ دەبووینەوە.

شەش سەعاتی تەواو چیاکە گەڕاین. دوایی سەیری دەموچاوی حوسێنم کرد. سەری داخست و گوتی:

ــ دەبوو لەو لووتکەیە بیّ، بەلاّم لەویّ نییە. من چووزانم. ئاخر ئەو چاخیرجالیی پیّ دەلّێن. بە روالّەت دێتە دایکە چیا، بەلاّم دەفڕیّ بۆ کارینجالی. ئەو پێی دەلّێن چاخیرجالی.

گوتم:

******* یاخو ******

ـ گوێ بدەیە حوسێن. تۆ کوڕی باشترین برادەری منی. هیچ کەسیش جێی چاخیرجالی نەزانێ، ئاغای رەوەندەکان، ئەحمەد ئاغا دەزانێ. وایە؟ ئەویش لە چیای کارینجالییە. وا نییە؟

ـ لە کارینجالییە.

ـ تۆ ئەو باش دەناسی. وایە؟ دوێنێ باسی بابتی بۆ کردم. تۆشی زۆر خۆش دەوێ. وایە؟

ـ وایە. زۆری خۆش دەوێم.

تەواوە. ئەنگاوتبووم.

دەبوو ئەحمەد ئاغا بدۆزینەوە. سواری ئەسپ بووین. حوسێن رێی نیشان دەداین.

دەمانزانی بە تێهەڵدان و ئەشکەنجە هیچمان بۆ ناچێتە سەر و ناتوانین کەس وا لێ بکەین چاخیرجالیمان بۆ ئاشکرا بکا. دەبوو رێیەکی دی بگرینە بەر.

بە زمانی ئابازایی گوتم:

ـ ئەو هەتیوە زامنی سەرکەوتنمانە. کلیلی زمانی ئەحمەد ئاغاش هەر ئەو کوڕەیە.

شوکری بەگ:

ـ راست دەکەی.

رکێفمان لە ئەسپان دا. پرسیبووم ئەحمەد ئاغا کابرایەکی چۆنە؟ ئەخلا و سەروبیچمی چۆنە؟ گەیشتینە ئۆباش. دابەزین. خۆی لە ماڵەوە نەبوو. لە دوومان نارد. حوسێنمان لەگەڵ دوو پاسەوان لە رێیە دانابوو.

ئاغا هات. کابرایەکی وردیلەی رووخۆش بوو.

## ******* یاخو *******

- فەرموون. فەرموون برادەرینە. زۆر بەخێر بێن. خێروبەرەکەتتان هێنا. دەمزانی هاتوونەتە ئەو دەوروبەرانە. لە دڵم چەقیبوو بەسەرمان دەکەنەوە. بەخۆم دەگوت، بێ و نەبێ ئەو برادەرانە گەورەمان دەکەن و دێنەماڵمان. چونکە هەر پیاوێکی حوکمەت بینێرێتە ئەملایە، چەند رۆژێك لەو هۆدە هەژارانەیەی ئێمەدا میوان دەبێ. زۆر بەخێر بێن.

- خوات لێ رازی بێ ئاغا، بەڵام پرسیارێکمان هەیە.

بەسەرسوورمانەوە پرسی:

- چ پرسیارێك برادەرینە؟

- شوێنەکەی چاخیرجالیمان پێ دەڵێی. دەمانبەیە سەر شوێنەکەی و کارێك دەکەی بەرەنگاری ببینەوە.

- من نازانم چاخیرجالی لە کوێیە. جا برادەرینە من چووزانم ئێستا ئەو لە کوێیە؟ خۆ شەیتانیش نازانێ لە کوێیە، چ بگا بە من؟

بڕوانە ئاغا، من لە خۆوە نەهاتوومە ئێرە. لە پێشدا فێری هەموو شتێك بووم جا لە(؟) وەڕێ کەوتووم. کەس لە چنگم قوتار نابێ. لێت نادەم. ئەشکەنجەت ناکەم. جا ئێستا پێم بڵێ بزانم چاخیرجالی لە کوێیە؟ باشە ئێمە چیمان پێ دەکرێ لەگەڵ ئەو؟ هەر ئەوەندەیە لەگەڵی بەشەڕ دێین. چاخیرجالی کابرایەکە، بە سەدان نێردراوی حوکمەتی بەزاندووە و بۆی دەرچووە. هیچ ترسێکی ناوێ، هەر دەمانەوێ شانسی خۆمان تاقی بکەینەوە.

- من هیچ ئاگام لێی نییە بەگ.

******* یلخو *******

- ئێمە کارمان بەتۆ نییە ئاغا. ئەگەر بیسەلمێنم تۆ شوێنەکەی دەزانی، ئەی ئەودەم چ دەکەی؟ ئەگەر کلیلی حەشارگەی چاخیرجالیت نیشان بدەم، ئەودەم دەڵێی چی؟

- هیچ ناڵێم.

- ئەو کات ئاغا... ئەو کات لێت نادەم. هەر پێشت ناڵێم پشتی چاوت برۆیە. ناهێڵم تاڵە موویەکیشت لەسەری کەم بێتەوە. تێگەیشتی ئاغا؟ هەر ئەوەندەیە، لێرە گوللەبارانت دەکەم. ئەگەر کلیلی حەشارگەکەی ببینی و دیسان حاشای لێ بکەی، ئەو کات ئاغا...

دیسان بە زمانی ئابازایی فەرمانم دا:

- پچن هەتیوەکەی فاتمە سوڵتان بێنن. وای بێننە ژووریَ، چاویان لە چاوی یەکتری نەئاڵقێ. هەر چاوێکی لێ هەڵتەکێنێ، ریسەکەمان لێ دەبێتەوە خوری. هەموو شتێکمان لێ تێك دەچێ.

هێنایان. حوسێنیان هێنا. کام پیاومان لە هەمووان کەڵەگەتتر بوو، لە نێوان حوسێن و ئاغادا راوەستا و نەیهێشت چاویان بە چاوی یەکتر بکەوێ.

- ئەو کورە دەناسی ئاغا؟

ئاغا:

- ئیزن بدە جوان سەیری بکەم.

- سەیرکردنی ناوێ ئاغا. کورەکەی برایمی خۆمانە. خۆ ناسیتەوە؟

ـــ ناسیمەوە بەگ. کورەکەی برایمی ئێوە و فاتمە سوڵتانی خۆمان. حوسێن...

بە زمانی ئابازایی گوتم.

## ******* پاشکۆ *******

ـ پێشانی بدەن.

حوسێنیان پێشان ئاغا دا. ئاغا سەری داخست و دەستی کرد بەقسەکردن لە بەرخۆیەوە:

ـ یانی هەتیوەکەی فاتمە سوڵتانیش، ها؟ لەخۆوە نەیانگوتووە بنیادەم شیری خاوی خواردووە. ناکرێ پشت بە کەس بسپێری. شیری خاوی خواردووە.

ـ رەنگی بە روویەوە نەمابوو. دەستی دەلەرزین.

ـ قاوەیەك و جگەرەیەك... لێگەڕێن برێك بێمەوە سەرخۆ...

دەسبەجێ ئەمرم کرد قاوەیەك دروست بکەن. هێنایان. ئاغا قاوەکەی هەڵقوڕاند و جگەرەیەکی کێشا. تۆزێك رەنگی هاتەوە سەرخۆ.

لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد:

ـ بنیادەم... ئاخ... بنیادەم... شیری خاو... هەتیوی فاتمە سوڵتان... کەس نازانێ... متمانە. .

ئەوجار سەری هەڵێنا. چاوی پڕ بوون لە فرمێسك. بە لەبزێکی بەزیوانەوە گوتی:

ـ حەسەن، با سولەیمان و ئاغا مراد بێنە لام. زوو بێن.

زۆری نەخایاند هاتن.

ئەحمەد ئاغا سەیری یەك یەکیانی کرد و بە مرادئاغا پیرەی گوت:

ـ ئەو پیاوەی ئێستا لەگەڵت هات و لە لای راستتەوە راوەستاوە کێیە؟ بەو برادەرانە بڵێ.

ـ دەی دیارە. حەسەنی کوڕی ئەحمەد ئاغایە.

******* یلخو *******

- ئەی ئەوەی دی؟

مراد ئاغا ئاوڕێکی لە ئێمە داوە. شڵەژابوو.

وەڵامی داوە:

- ئەوەش سولەیمانە. برازای ئەحمەد ئاغا.

ئەحمەد ئاغا بە مرادی گوت:

- مراد ئاغا، کارمان بە تۆ نەما. دەبێ شوێنی کوڕەکان پێشان ئەو برادەرانە بدەی. وەڕێ بکەوە.

مراد ئاغا کەوتە ڕێ.

ئەحمەدئاغا دەیەویست، بۆمان بسەلمێنێ کەسێکی نیازپاك و بێ کرێژە.

ڕووی لە حەسەن کرد و گوتی:

- کوڕم، من هەرچی لە بارەی چاخێرجالییەوە دەمزانی، هەمووم بەو برادەرانە گوت. ئێوەش هیچیان لێ مەشارنەوە. برادەران خۆشیان هەموو شتێك لە ئێمە باشتر دەزانن. دەی بڵێ بزانم، چووتە کوێ؟

گەنجەکە بێدەنگ بوو. تاوێك دڕدۆنگ بوو.

ئەحمەد ئاغا گۆڕاندی:

- دەی زوو بە بڵێ.

- چووینە لای چاخێرجالی باوکە.

- دەی ئەفە پرسیاری چیی لێ کردن؟

- پرسیاری پارە و دراوەکە.

- کامە پارە؟

## ******* یاخی *******

ـ ئەو پارەیەی دەبوو لە عوسمان بەگ بستێنرێ. هەر ئەو عوسمان بەگەی رفاندوویەتی و بردوویەتە شاخ. دەبوو کوڕەکە عوسمان بەگ پوولەکە بێنێ. منیش چووم و دیتم. دواییش چوومە لای ئەفە و ئاگادارم کردەوە کە کوڕەکەی عوسمان بەگ نیوەی دراوەکەی ئامادە کردووە و نیوەکەی دیکەشی تا بەیانی ئامادە دەکا.

ـ چیی دیکەی پرسی؟

ـ هیچی دیکە. هەر پیاوەکانی شوێنی جەندرمەکانیان لێ پرسیم.

من دەرفەتی وەڵامدانەوەم نەبوو، چونکە چاخیرجالی خۆی وەڵامی دامەوە: "دەبێ جەندرمەکان لە کوێ بن؟" ئەوەی گوت و پێکەنی. ئەوجار گوتی: "لە هەر شوێنێك خواردنی زۆری لێ بێ، جەندرمەش لەوێن. لە هەر شوێنێ مەڕێك سەر ببڕدرێ، جەندرمەش قوت دەبنەوە. ئەوانە نایەن ئەو جەستە ناسك و نازدارەیان لە کێو و چاخان بخەنە زەحمەتەوە. هەر دەزانن بە ڕێگە تەختانییەکاندا ئەسپ تاو دەن. لەو چیایانەدا کە باڵندەش نافڕێ، جەندرمە چ دەکا؟" کە ئەفە ئەو قسانەی کرد، من گەڕامەوە.

هەل و دەرفەتە لەبارەکە هەڵکەوتبوو. بە پیاوەکانم گوت ئامادە بن.

ئەحمەد ئاغا کە ئەوەی دی، گوتی:

ـ ئێستا ناکرێ بڕۆن. شەوە. ڕێگە ڕژد و ئەستەم و دوورە. خۆ ناتوانن بە ئەسپیش بچن. ئەگەر لە شەوێشدا بگەنە ئەوێ، چاخیرجالی زۆر سووك و سادە دەتوانێ لە داوتان بخا.

******* یاخی *******

ــ هەر ئەمشەو دەکەوینە رێ. متمانەت بە من هەبێ. هەر ئەوەندە چاوساغێکمان بدەیە، کە جوان شارەزای ئەوێ بێ. دەمەوێ ئەو هەلەم لەکیس نەچێ، کە هەڵکەوتووە رووبەرووی ببمەوە.

- وەرە حەسەن. لەگەڵ برادەران کەوە.

ئاغا دەیویست وا بنوێنێ، کە هیچ لە من ناترسێ.

پێم وابوو، ئەوانە نامانبەنە سەر شوێن و حەشارگەکەی چاخێرجالی.

ئەوجار رووی لە سولەیمان کرد و گوتی:

- تۆش بچۆ.

ــ ئەو دوو کەسە دەستکیستان* دەبن برادەرینە. ئەگەر شوێنەکەی چاخێرجالییان پێ نەگوتن، دەکرێ هەردووکیان گوللەباران بکەن.

گوتم:

تکایەکی دیکەشم لێت هەیە ئەحمەد ئاغا. بەو دوانە بڵێ بە لارێیەکدا بمانبەن.

- باشە. هەر وا دەکەن.

دیسان گوتم:

ــ ئاغا، پێت وایە هەر ئێستا چاخێرجالی هەواڵی وەرێکەوتنەکەی ئێمەی بیستبێ؟ بۆ وێنە لە رێی سیخورێکەوە؟

- لەوانەشە.

- نەخێر ئاغا، شتی وا نابێ. ئەگەر تۆ ئاگاداری نەکەیەوە، کەسی دیکە هەواڵی بۆ نابا. تێگەیشتی ئاغا؟ ئێمە هەر تۆ دەناسین.

---

* دەستکیس: بەو کەسانە دەگوترێ، کە شارەزای رێگا و بانی شوێنێکن و لە تاریکایی شەوێدا دەکەونە پێش ناشارەزای ئەو شوێنە بۆ ئەوەی زەبرێك بوەشێنن.

## ******* یاخو *******

بەو تاریکییە وەڕێ کەوتین. هێشتا سەرەتای شەوێ بوو. باران نم نم دەباری. ڕێگەکە بەردەڵێن و ڕژد بوو.

شەش سەعاتی تەواو بە بەر باراندا ڕێگەمان بڕی. باش بوو هەر هەموومان شاخەوانی شارەزا و کوڕی زەرد و ڕەوەزان بووین. دەشت و شاخمان پێ وەك یەك بوو. تەنانەت دەکرێ بڵێم، لە دەشتیش خۆشتر بوو. لەوانەبوو لە دەشتی ڕێك و بێ هەوراز و نشیو بترسین، بەڵام لە چیا بێ ترس و خەم بووین.

منداڵی قەفقازین. هەر هەموومان بە منداڵی لە چیا و کەژان گەورە بووین. سەعاتی سێی بەیانی بوو، گەیشتینە گردەکە. لە بناری گردەکە ڕاوەستاین. پیاوەکانم کردە سێ دەستە. فەرماندەیی دەستەیەکیانم بە شوکری بەگ و دەستەی دووەمم بە عوسمانی برام ئەسپارد. خۆشم فەرماندەیی دەستەی سێهەمم وەئەستۆ گرت. وامان دانا باکووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژئاوا هەڵنێین و بیانخەینە ژێر چاوەدێرییەوە.

لای باشووریش لە ژێر چاوەدێریی عوسماندا بێ. وردە وردە چووینە پێشێ. چووینە پێشێ و ئەو گردەمان گەمارۆ دا کە حەشارگەی چاخیرجالی بوو. زەرد و ما و ڕەوەزێکی پڕ مەترسی بوو. وستەمان لێوە نەدەهات. سەعات ببووە سێ و نیوی نیوەشەوێ. دەمانزانی چاخیرجالی بزانێ گەمارۆ دراوە، تاریکی دەکاتە قەڵغان و دەردەچێ.

هەموو ئەو گردۆلکانەمان گرت کە دەیانڕوانییە حەشارگەکەی چاخیرجالی. دەبێ تا ڕۆژ دەبێتەوە، کۆتایی پێ بێنین. حەشارگەکەی چاخیرجالی وەك بەری دەستمان لەبەر چاومانە. بۆیەش توانیمان ئاوا بەسەر ئەو گردانەدا زاڵ بین، چونکە چاخیرجالی ئێشکگری دانەنابوو.

## ******* یاخی *******

دیاره لەو گردانەدا، سەنگەر بۆ ئیشکگران دروست کراوە، بەڵام لە بەر جەندرمانیان دروست نەکردوون، بەڵکو بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخییە خەنیمەکان لێ دراون. چونکە چاخیرجالی باش دەزانێ هیچ جەندرمەیەك قوونی ئەوەی نییە خۆی بگەیەنێتە ئێرە. راستیشی دەکرد. هەتا ئەو کات هیچ سەربازێك پێی نەگەیشتبووە ئەو گردانە. لەوەتەی چاخیرجالی، ببووە چاخیرجالی، شتی وا رووی نەدابوو.

بۆیەش ئەمجارە کەسی نەکردبووە ئێشکگر، چونکە هەموو یاخییەکانی ناوچەکە تێداچوون یان لە چیا چوبوونە خوارێ و لەوێ جگە لەخۆی یاخیی دیکەی لێ نەبوو.

چاوەڕێ دەبین. دەبێ راوەستین تا رۆژ دەبێتەوە. لەو کاتەدا تروسکەی رووناکییەکی کز لە حەشارگەی یاخییەکانەوە بەدی دەکرا. دەبێ ئاگری جگەرەیەك بێ. زەمان راوەستاوە. لە لای رۆژهەڵاتەوە تەنانەت تروسکەیەکیش نایە. بارانەکەش هێشتا خۆشی نەکردووەتەوە. لە سەرخۆ هەناسە هەڵدەکێشین. بێت و سریوەیەکمان بێ، تەنانەت دەنگی هەناسەشمان ببیستن، دەزانن گەمارۆ دراون. دەزانن و خۆیان قوتار دەکەن و ئەگەر بەرەنگاریشمان ببنەوە، وامان بەگژدا دێن، کە بمانشکێنن. چونکە ئەو چیا و کێوە وەك بەری دەستیان شارەزان. ئەگەر بزانن لێرەین... بێت و رۆژ بێتوە... ئەو کات زۆر سووك و سادە دەتوانین لەناویان بەرین.

ئەو شوێنەی چاخیرجالی و پیاوەکانی تێیدا مات بوون، ناوی "قیزقایاسی"یە. قیزقایاسی وەك منارەیەکی بەرز سەری لە ئاسمانێ دەسوێ. دەکرێ بڵێین کەوتووەتە یەکێك لە بەرزاییە هەرە بەرزەکان. ئەو منارەیە ئەشکەوتێکی لەبن

## ******* پلخو *******

دایە و چاخیرجالی لەوێ مات بووە. دواتر کە چووم و سەیرم کرد، دیتم چاخیرجالی لە بن قیزقایاسی پەناگەیەکی زۆر قایمی دروست کردووە.

بەڵام شوێنەکە چەندی قایم و پتەویش بێ، دیسان هەر ناتوانین لە یەکەم کات و ساتەکاندا لە چاخیرجالی و پیاوەکانی بدەین. پیاوەکانی من هەمووان تفەنگچیی یەکە یەکەن. تەنانەت دەتوانن مێرووڵەش بنگێون.

بەڵام، ئەوەی لێی دەترسام بەسەرم هات.

چیی نەمابوو بۆ سیوادی بەیانی. ئەوە بێدەنگییەکی خەست باڵی بەسەر هەموو وڵاتدا کێشاوە. لە پڕ دەنگی پژمینێك دێ. ئەی قورمان بەسەر. ئەوە کێ بوو کۆخی؟ خودای بەگژدا بچێ. زۆر زۆر نزیك بووین. دەنگی کۆخینەکە، وای کرد، یاخییەکان بزانن گەمارۆ دراون. دەستیان کرد بە راکەراك. گوێمان لە ترپەی پێیان دەبێ. خۆ ناکرێ تەقەش بکەی... ئامانجەکەت نەبینی چۆن تفەنگی پێوە دەنێی؟... ئەی چ بکەین؟ ئەفە خەریکە را دەکا.

ئابازار و چەرکەزەکان، زۆر بەرز و سامناك دەنەڕێنن. بۆ دنەدان و هاندانی ئەفە، دەستمان کرد بە نەڕاندن. ئەوە فێڵە شەڕێکی قەفقازی بوو:

- تۆ هێشتا لەخەوێدا بووی کە گەمارۆمان داوی. ڕێگەی دەربازبوونت نییە. ئەگەر پیاوی و ناترسی رامەکە. ئەگەر پیاوی وەرە پێش.

بەڵام چاخیرجالی پیاوێکی زیرەکە. بەو قسانە هەڵناخەڵەتێ. هەوڵ دەدا خۆی دەرباز بکا. ئێمە لە پشت سەریەوەین. زانیویێتی دەستی لێ هەڵناگرین. دەزانێ هەر رۆژ بێتەوە، دەبێتە شەڕێکی بێ ئامان. ئەو دەڕوا و ئێمەش وەشوێنی دەکەوین.

## ******* یلخو *******

ئەمنیش دەمەویٚ نەهێڵم لەوە پتر لێمان دوور بکەوێتەوە. دەمەویٚ ناچاری بکەم بەرەنگارمان بێتەوە. ئەگەرچی باش دەزانم لەو تاریکاییەدا، شەڕ و بەرەنگاربوونەوە کارێکی خۆڕاییە.

دوو سەعاتێك دەبوو وەشوێنی کەوتبووین، کە زانیمان چاخیرجالی دوو پیاوی خۆی داناوە رێمان پیٚ بگرن. خۆی و هەڤاڵەکانی دیکەشی لە رەوەز و زەردومایەکی بەرزدا سەنگەریان گرتووە. جا بۆ ئەوەی وامان لیٚ بکەن، لەبری پەلامار بەرگری لەخۆمان بکەین، رەهێڵەی فیشەکیان بەسەردا باراندین.

ئێمە بەوەش شوکرانەبژێر بووین. لێگەڕیٚ با مل بۆ شەڕەکە راکێشیٚ، دوایی گرنگ نییە چ دەقەومیٚ. تەنانەت هەمووشمان بکوژیٚ، باشترە لەوەی بە دەستی بەتالٚ بگەڕێینەوە.

لەو شەڕە لەنەکاوەدا، یازدە برینـدار و شەهیدێکمان دا. دەمزانی ئاوا بڕوا، هەموومان تێدا دەچین. کەوتبووینە بەر چنگوڕی گورگ. دەبوو شوێنێکی لەبار بۆ خۆمان بدۆزینەوە. هەموو دەوروبەرەکە گەڕاین و سیٚ شوێنی باشمان دۆزییەوە. لە پەلامارێکی دارێژراودا، ئەو سیٚ شوێنەمان گرت. لەو کاتەدا، باکووری رۆژئاوای شوێنەکەی چاخیرجالی بە دەست شوکری بەگەوە و باکووری رۆژهەلاٚت بە دەست حاجی دۆك کامیل و باشووری رۆژئاواش بە دەست من و عوسمانەوە بوو. لە لای باشووریشەوە، هەڵدێرێکی هەزار بە هەزاری لیٚ بوو. شەڕەکە بەردەوام بوو. تازە رۆژ ببۆوە. من بیرم لە کۆتایی کارەکە دەکردەوە. ئەگەر چاخیرجالی بتوانیٚ لەو گەمارۆیە خۆی دەرباز بکا، هەموومان دەکەوینە مەترسییەوە. جا ئەوجار لە شوێنێکی دی، داوێکمان بۆ دەنێتەوە و هەموومان دەخاتە تەڵەوە. چونکە ئەم کەژ و کێوانە هیی ئەون.

## ****** یاخی ******

ئەو تاقە فەرمانڕەوای ئەو چیایانەیە. هەموو گوندییەکانی ناوچەش گوێ لە مستی ئەون. ئیتر رووباری خوێن دەخاتە رێ. لەمەودوا، چاخیرجالی خاوەنی زۆربەی حەشارگەکان و زۆربەی ئەوانەش دەکوژێ، کە متمانەی پێیان بووە. نابێ بهێڵین بە زیندوویی دەربچێ. یان هەموومان دەکوژرێین، یان ناهێڵین رزگاری بێ.

لەو کاتەدا دەبوو، مشوورێك بخۆین. رێك سێ سەعات بو، لە سەروخوارەوە تەقە بوو. چاخیرجالی پازدە ساڵان لەو چیایانەدا یاخیگەرێتیی کردبوو. ئەو بیری لە هەموو ئەگەرەکان کردبۆوە و لە هەموو توانا و ئیمکاناتەکانیش سودی وەردەگرت. دەیزانی لەوانەیە رۆژێك بکەوێتە تەنگانەوە. هەر بۆیە لە چەند شوێنان سەنگەر و مەتەرێزی پتەو و لەشکاننەهاتووی بۆخۆی دروست کردبوو. ئەمرۆش پەنای بردبووە بەر یەکێك لەوانە و شەڕی لەگەڵ دەکردین. هەر بۆیە، سەرەڕای ئەوەی لە سێ لاوە گەمارۆمان دابوو، دیسان دەرەقەتی نەدەهاتین. لەگەڵ ئەوەدا، کە تەقەی ئەوان لە هیی ئێمە زۆر کەمتر بوو، بەڵام دەیتوانی تەواو بمانخاتە مەترسییەوە. بڕستی لێ بڕیبووین. کاتیش خەریك بوو تێدەپەڕی.

لەو دەمەدا عوسمانی برام هاتە لام و گوتی:

- روشدی، ئەو چاخیرجالییەی تۆ زۆر ئازاتر و بەهێزتر و کۆڵنەدەرترە لەوەی بیرمان لێ کردبۆوە. دەبێ مشوورێکی لێ بخۆین، ئەگینا هەموومان دەکوژێ. دەبێ تەگبیرێکی لێ بکەین. من نەخشەیەکم هەیە. دەبێ یارمەتیم بدەی جێبەجێی بکەم. دەبێ یارمەتیم بدەی، ئەگینا دەکوژرێم. دەڵێی چی؟

- بڵێ بزانم نەخشەکەت چییە ؟

# ******* یاخی *******

عوسمان ئاوا باسی نەخشەکەی خۆی کرد:

تفەنگچییەکانی چاخێرجالی زۆر لە سەر هەستن. ئاگایان لە هەموو لایەکە، بەڵام پێیان وا نییە لە لای باشوورەوە هێرشیان دەکرێتە سەر، چونکە ئەوێ هەڵدێرە. هەر بە زەینیشیاندا نایە، یەکێك بتوانێ بەو رەوەزە رژد و هەڵدێرە هەڵزنێ. ئەو هەڵدێرە قەڵشتێکی هەیە، ئاو دریویێتی. دەکرێ بەو قەڵشتەدا سەر کەوی و لە پشت ئەفەوە قوت بیتەوە. من زۆر بە وردی لێکم داوەتەوە. دەمەوێ لەوێوە سەر کەوم، بەڵام بێت و ئەفە بزانێ، بێ ئەملاوئەولا تێدا دەچم. بە پێشەوانەوە، بێت و نەزانێ، دڵنیام ئەو دەمرێ. ئەفە سێسەد تا چوارسەد مەترێك لە قەڵشتەکەوە دوورە. بەشکم بتوانم لەو مەودا دوورەوە، فیشەکێکی لەسەر دڵی بدەم. خۆ دەزانین چاخێرجالی رواڵەت و جلوبەرگەکانیشی لە پیاوەکانی جوێیە و لە دوورەوە دەناسرێتەوە. هەر لەوێوە سێرەی لێ دەگرم و تەقەی لێ دەکەم، بەڵام دەبێ یارمەتیم بدەی.

چار نەبوو. دەبوو یارمەتیی بدەم. عوسمان ئەو کارەی پێ دەکرا. عوسمان کوڕی چیا و کوێستانێ بوو. دەکرێ بڵێی، شاخەوانی وەك ئەو لێوەشاوە، لە هەموو دونیادا نییە. عوسمان زۆر گورجوگۆڵ بوو. جگە لەوە، لە ئەنگێوەیی و دەستوتفەنگیشدا تاقانەی رۆژگار بوو.

بەڵام عوسمان پێویستی بە یارمەتیی ئێمە بوو. دەبوو پشتیوانیی لێ بکەین. هەر بۆیە پەیامێکم نووسی و ناردم بۆ فەرماندەی تاقمەکانی دیکە، حاجی دۆك کامیل و شوکری بەگ. پەیامەکەم ئەوە بوو:

"دەبێ بەر لەوەی شەودا بێ، عەمەلیاتەکەمان تەواو بکەین. هەر بۆیە ناچارین عوسمان بکەینە قوربانی. عوسمان دەیەوێ لە قەڵشتی هەڵدێرەکەوە وەسەر

******* پاشکۆ *******

بکەوێ و خۆی بگەیەنێتە پشت ئەفە. جا ئەگەر ئەوەی پێ بکرێ، لەوێوە ئەفە بنگێوێ. هەر بۆیە ئێمە ئیتر تەقە ناکەین، بەلام ئێوە لەگەڵ وەرگرتنی پەیامەکە، تەقەکەتان ئەوەندەی دیکە خەستتر بکەنەوە. دیارە هەر ئەوەندە بەس نییە، بۆ ئەوەی پیاوەکانی چاخیرجالی بەعوسمان نەزانن، دەبێ سەرقاڵیان بکەن. بەو جۆرە، کە پێنج کەستان خۆبەخشانە مەرگ هەڵبژێرن. واتە بەبێ ترس و پرینگانەوە هرووژم بەرن بۆ چاخیرجالی و وا بنوێنن کە دەیانەوێ خۆ بگەیەننە چاخیرجالی. "

دەمێك نەبوو پەیامەکەم ناردبوو، کە تەقەی ئەو دوو تاقمە خەستتر بۆوە. شەڕەکە کەوچکی تێ نەدەگەڕا و لەو کاتەدا تاقمە خۆبەخشە پەلامارەدەرەکەش هرووژمیان برد. چاخیرجالی وازی لە ئێمە هێچنابوو و بەرەنگاری ئەو دوو تاقمە ببۆوە. هەر ئاوڕیشی لە ئێمە نەدەداوە. بەتایبەتی عوسمان هەر تەواو ئازاد ببوو. چاخیرجالی دڕدۆنگ بوو. دەکرا لە شێوەی تەقەکردنەکەیەوە ئەو دڕدۆنگییەی بەدی بکەی. لە هەموو شەڕێکدا، بە چۆنێتیی تەقەکردنی بەرامبەرەکەتڕا دەتوانی بزانی باری دەروونییەکەی چۆنە. ئەوە شەرکەرە پسپۆڕەکان باشی دەزانن و سوودی باش لەو زانستەی خۆیان وەردەگرن. چاخیرجالی نەیدەزانی ئەو هەمووە ئازایەتییە لە چییەوەیە. تا ئەمڕۆ نەیدیتبوو تاقمێکی راوەدوونان ئەوەندە پشتگەرم و پێداگر بێ. چاخیرجالی سەری سووڕ مابوو. لە چۆنێتیی تەقەکردنەکەیەوە سەرم لەوە دەرکرد.

لە تاقمە خۆبەخشەکە، "قۆجا مەمەد" پێکرا. جافر شامیلی برادەری کە لە تەنیشتی بوو، هەرای کرد و بە ئەفەی گوت:

******* پلخو *******

ـ ئەگەر خۆت پێ پیاوە، وەرە دەرێ ئەفە. وەرە دەرێ تا پیاوەتییەکەتت پێشان بدەم.

ئەفەش هەر بەراستی پیاو بوو. رەشید بوو.

لە وەلامی جافر شامیلدا گوتی:

ــ گوێ بدەیە گەنجۆ بزانە دەڵێم چی. تۆ کەسێکی رەشیدی. دیارە قارەمانێکی راستەقینەی. ئەگەر ئازا نەبوایەی، نەتدەوێرا ئەوەندە بێیە پێشێ و بێیتە بەرسێرەی تفەنگی من. خۆ ئەگەر ترسنۆك بوای، کە برادەرەکەت دەپێکرا، رات دەکرد. ناتئەنگێوم، بە ئازایەتییەکەتت دەبەخشم، بەڵام ها ئەوەم لێ وەرگرە و برۆ. هەتا هەی ئەو یادگارییەم لای خۆت هەڵگرە.

کە گوتی "ئەوەم لێ وەرگرە"، فیشەکەکەی، کڵاوی جافرشامیلی هەڵگرت. کڵاوەکە لەولاترەوە کەوت. جافر کڵاوەکەی هەڵگرت و گەڕاوە.

ئەفە پیاوێکی ئاوا بوو.

جافر شامیل لە تاقمەکەماندا لە هەمووان گەنجتر بوو. لە نێوان ئەوانەدا کە چووبوونە شەڕی چاخیرجالی، ئەو هەرە کەم تەمەنەکەیان بوو. لەوانەش، ئەو تاقانە کەسێکە، کە هێشتا زیندووە. ئەو ئێستا لە گوندی "حاجی هیچاچ"ی سەر بە دۆزچێ دەژی و ئەو کڵاوەشی هەر پاراستووە، کە فیشەکەکەی چاخیرجالی کونی کردووە.

عوسمان خەریك بوو لە پشتەوەی سەنگەرەکەی چاخیرجالیڕا، وەسەر دەکەوت. چۆن دەیتوانی بە زەردێکدا هەڵزنێ، کە وەك منارە بەرز و لووس بوو؟ سەیر بوو. دەستی لەکوێ گیر دەکرد؟ پێی لە کوێ توند دەکرد؟

## ****** پلخو *******

عوسمانم لێ دیار نەمابوو. بە بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی بووم. نیو سەعاتێك چاوەڕوانی بووم، سەعاتێك چاوەڕوانیم کێشا، بەڵام عوسمان هیچ سۆراغی نەبوو. بەخۆمم گوت:

ـ ئەی هاوار هەی... براکەم چوو.

وەك شێتان دەستم کرد بە تەقە. لە ژیانمدا تەقەی ئاوا خەستم نەدیتبوو.

دەنگێك لە ناخمەوە پێی دەگوتم، تاوێك راوەستم و دوایی هێرشێکی باش بکەم.

پەلامارێك، کە چارەنووسی شەڕەکە روون بکاتەوە. لەوانەیە بەو پەلامارە بتوانین چاخیرجالی ببەزێنین.

لەو کاتەدا شوکری بەگ هاتە لام و پێی گوتم:

ـ عوسمانت چارەڕەش کرد، روشدی.

چیم پێ دەکرا؟ خۆی حەزی لێ بوو. جگە لەوەش، هەر ئێستا دەبێ پەلامارێکی بەربڵاو دەست پێ بکەین. چووزانین لەو پەلامارەدا خۆشمان ناکوژرێین؟!

شوکری بەگ رۆیشت.

دوای رۆیشتنی شوکری بەگ، سەیری قەڵشتی هەڵدێرەکەم کرد. عوسمان خۆی بەوێوە هەڵواسیبوو.

یەکێکم ناردە لای شوکری بەگ. فەرمانی تەقەم دا. دەبوو بێ پسانەوە تەقە بکەن و ئەگەر پێویست بوو، هێرشیش بکەن.

ئەوان تەقەکەیان خەستتر کردەوە. منیش بێ پسانەوە تەقەم دەکرد. سەیری لای عوسمانم کرد. بە سینگەخشکێ بەرەو لای من دەهات. هات و خۆی

******* پاخر *******

گەیاندە من. لە باوەشمم گرت. دەست و ئانیشك و ئەژنۆی زۆر برینداربـوون. خوێن لە برینی دەچۆڕاوە:

ـ پێم وایە سەرکەوتووم. یەکێکم لێ کوشتن، کە خۆم پێم وابوو چاخێرجالییە. سێ فیشەکم پێوە نا. بەسەر پێوە راوەستابوو. قەلافەتی لە تفەنگچیی ئاسایی نەدەچوو. تەقەی دەکرد و فەرمانیشی دەکرد. سێ فیشەکم پێوە نا. یەکێك لە فیشەکەکانم گورچوبڕ و کاریگەر بوو. پێکرا و کەوت.

دەسبەجێ نەقیب شوکری بەگ و حاجی دۆك کامیلم ئاگادار کردەوە. پێم گوتن چاخێرجالی کوژراوە و تفەنگچییەکانی سەریان لێ شێواوە.

لێم سوور بوو، ئەوەی کوژراوە چاخێرجالییە. سەیر بوو. عوسمانیش دڵنیا نەبوو، بەلام من تەواو دڵنیا بووم. باشە چۆن وا خاترجەم بووم؟

تەقەکەی بەرامبەرمان، لەپڕ توند بوو و لەنەکاو بڕایەوە. ئەوجار لێرە و لەوێ تاق و لۆق تەقەیەکیان دەکرد. دیار بوو تفەنگچییەکان سەریان لێ تێك چووە.

دوای ئەوە دەنگی چەند کەسێك هات. دەنگەکە زۆر بەرز بوو، بەلام زۆر زوو کپ بوو.

تەقە هەر بەردەوامە. ئەوەندەی دە خولەکێك رەهێڵەی ئاگرێکمان بەسەردا دەبارێنن، متمان دەکەن، بەلام ناخایەنێ. جاری وایە، تەقەکە ئەوەندە پچڕ پچڕ و بێ ئامانج دەبێ، کە ئیتر پیاو باوەڕ ناکا ئەوانە تفەنگچییەکانی چاخێرجالی بن. لە هەموو شەڕێکدا لە چۆنێتیی تەقەی بەرامبەرەکەتەوە، دەتوانی بزانی باری دەروونییەکەی چۆنە. ئەو شەڕکەرەی باوەڕ و متمانەی بەخۆی بێ، دەنگی تفەنگەکەی وەك چرکەچرکی کاتژمێر رێکوپێکە.

## ******* پاشو *******

بەلام کاتژمێری تفەنگچییەکانی چاخیرجالی جاریێ کار دەکا و جاریێ رادەوەستێ. زۆر پەرش و بلاوە.

بەو حالەشەوە، ئەو سەعاتە زەبرپێکەوتووە، هەتا سەعات یەکی بەیانی هەر کار دەکا. مەبەستم ئەوەیە، هاوڕێکانی چاخیرجالی تا سەعات یەکی بەیانی بەربەرەکانێیان کرد. ئێمە سێ کەسمان لێ کوژرا و پێنج کەسمان بریندار بوون.

کوژراوەکان هەر ئەوانە بوون خۆیان خۆبەخشانە بەپیر مەرگەوە چووبوون. پێنج پیاومان خۆیان بۆ مردن پالاوت، سێ کەسیان کوژران و دوانیان زیندوو دەرچوون.

کوژراوەکانمان ئەوانە بوون:

١. قۆجا مەمەد، خەڵکی گوندی "نۆرەم"ی سەر بە دۆزجێ.

٢. عەریف عوسمان، خەڵکی گوندی "مەهدی بەگ"ی سەر بە دۆزجێ.

٣. عەریف مەمەد، خەڵکی گوندی "قارا چیچك"ی سەر بە شاری خەندەق.

لە پڕ دەنگی کاتژمێرەکە بڕایەوە. تفەنگچییەکان بزر ببوون. باران وەك گۆزەی سەرەوژێر دەهاتە خوارێ. هەوا زۆر سارد بوو. تا بەیانی لە سەنگەرەکانماندا ماینەوە و چاوەڕێمان کرد. بەیانی زوو، لە هەر چوار لاوە دەستمان کرد بە تەقە و هەر ئاوا بەرەو حەشارگەکەیان چووینە پێشێ. حەشارگە چۆل بوو. تەنیا دوو تەرممان دی. یەکێکیان عوسمان بەگ بوو، هەر ئەوەی لە ناوچەی ئارپازەوە رفێنرابوو و هێنابوویانە چیا. سەیری تەرمی دووەمیشمان کرد، سەری و هەردوو دەستیان بڕیبوو. پێستی

******* پلخو *******

سینگیشیان داماڵیبوو، بەڵام رواڵەتی لە چاخێرجالی نەدەچوو. دەتگوت یەکێکە لە تفەنگچییەکانی. ئەوەش بەسەهووی بردین. ئەگەر ئەو تەرمە چاخێرجالی نییە، ئەی بۆچی سەریان بڕیوە؟ ئەگەر چاخێرجالی نییە، ئەی بۆ کەوڵیان کردووە؟ دەستیان بۆ بڕیوە؟ تا ئێستا کەس نەیدیتووە، سەری تفەنگچییەکی کوژراو ببڕن. باشە ئەو کارەیان بۆ کردووە؟ عوسمان بەگیان بۆ کوشتووە؟ ئەگەر چاخێرجالی نەکوژرابا، ئەو بارمەتەیەیان نەدەکوشت.

چاخێرجالی کاری وای نەدەکرد. بەڵگە زۆر بوون، بیسەلمێنن، کە چاخێرجالی کوژراوە، بەڵام نابێ لەبیرمان بچێ، چاخێرجالی کەسێکی ساویلکە نەبوو. لەوانەبوو هەزار فرت و فێڵ بکا. لەوانەبوو وەك سەعید پاشا بمخەڵەتێنێ و بمکاتە پەندی عالەمێ. وام لێ بکا، لە هیچ کوێ سەرم هەڵنەیێ و لە رووم هەڵنەیێ سەیری هاوڕێکانم بکەم. لەوانەشە فێڵێکی کردبێ. دەیەوێ من تەلەگراف بۆ هەموو لایەك بنێرم و بڵێم چاخێرجالیم کوشتووە و بۆ بەیانی لە جێیەکی نادیار لێم قوت بێتەوە و هەموو نەخشەکانم پووچەڵ بکاتەوە. دەیتوانی جلوبەرگی خۆی لەبەر یەکێك بکا. دەبوو پەلە نەکەم. دەبوو وشیار بم و نەکەومە داوی گزە و فێڵەکانی چاخێرجالییەوە. دەبوو ئەو تەرمە گوماناوییەش لەگەڵ تەرمی هاوڕێکانی خۆم بنێرمە شارۆچکە.

دیار بوو چاخێرجالی دوای ئەوەی پێکرابوو، بە ئاسانی گیانی دەرنەچووبوو. لەو شوێنەی فیشەکەکەی وێکەوتبوو، بە مەودای چل

## ******* پاخو *******

مەترێك، چیی گژ و گیا بوو، لە رەگەوە دەریکێشابوون و پەرش و بلاوی کردبوون. دیار بوو زۆر ئازاری چێشتووە.

تەرمە بێ سەلکەکەمان لەگەڵ ترەمی برادەرە کوژراوەکانمان سواری ئەسپ کردن و هێنامانەوە شارۆچکە.

لە شارۆچکە بە بەرپرسانم گوت، لەوانەیە ئەوە تەرمی چاخیرجالی بێ. هەڵبەت گوتیشم، تەرمەکە سەری پێوە نییە.

نازم پاشا، هەر ئەو هەواڵەی بیستبوو، دەسبەجێ خۆی گەیاندبووە نازیللی و داوای کردبوو، بچن لە ئۆدەمیش، ژنە گەورەکەی چاخیرجالی واتە ئیراز بێنن.

پاشا ئەمری کرد:

- ئەو ژنە بەرن و تەرمەکەی نیشان بدەن.

ئیراز چووە ژوورێ و دوای چەند خولەکێك هاتەوە دەرێ و گوتی:

- ئەمە ئەفەی من نییە.

گوتمان:

- جارێکی دیکەش سەیری بکەوە. بزانە لە هیچ کوێی لەشی نیشانەیەکی تایبەتی پێوە نییە؟

- بۆچی، خاڵێکی هەبوو.

دیسان چۆوە ژوورێ. زۆری نەبرد، هاتەوە دەرێ. ئەمجارە فرمێسك لە چاویدا قەتیس مابوون.

## ******* پاشماوه *******

ژنێکی وەك ئیراز، ژنێك كە راستگۆترین و وەفادارترین و ئازاترین ژنی دونیا بوو، پێت وایە لە سەروچاوی خۆی دەدا و دەگریا؟ نا، هەر وەکوو سەنگی سەبوور راوەستا و متەقی لێوە نەهات.

پرسیم:

- ئەفەی خۆت بوو؟

سەری بە نیشانەی بەڵێ، بەرداوە و بەبێ دەنگی وەدەر کەوت.

بەنازم پاشای والیم گوت:

- پاشا. ئێمە دەبێ هەر ئێستا بڕۆین. چونکە تفەنگچییەکانی ئەفە ورەیان بەر داوە. دەبێ بکەوینە شوێنیان. لەناوبردنی ئەوانە وەك ئاوخواردنەوە وایە. هەر ئێستا دەبێ هەواڵی کوژرانی چاخیرجالی بە هەموو مەملەکەتدا بڵاو بکەینەوە.

پاشا وەڵامی دامەوە:

- راست دەکەی.

تەرمەکەی چاخیرجالییان سەروبن لە مەیدانەکەی نازیللی هەڵواسی.

حاجی دۆك کامیل و عوسمانی برام کە ئەو دیمەنەیان دی، بە زویرییەوە هاتنە لای من و گوتیان:

ــ روشدی بەگ، دیتت چیمان کرد؟ یانی رەشید و جوامێرێکی وەك چاخیرجالی دەبوو ئاوای لەگەڵ بکەن؟ ئەی خۆزگە ئێمە بەدەستی ئەو کوژرابایەن.

ئەوان زۆر بە هەڵواسینەکەی چاخیرجالی تێك چووبوون.

کەوتینە رێ. لە شوێنێك هەموومان پێکەوە کۆ بووینەوە.

## ******* پاشکۆ *******

عوسمان گوتی:

- چاخیرجالی به دهستی یهك نهفهر نهكوژرا. ههر چلوپێنج كهسهكهمان لهو شانازییهدا بهشدارین. لهمهودواش كهس نایدركێنێ، كاممان ئهفهمان كوشت. بهڵێن دهدهن؟

ههمووان بهڵێنیمان پێ دا، كه ئهو نهێنییه لای كهس ئاشكرا نهكهین. تا ئهمڕۆكهیش كهس باسی نهكردووهتهوه.

دوایی چووینه ئۆدهمیش. دوای كوژرانی چاخیرجالی ههموو حهشارگه و سهنگهرهكانی خاپوور كران. پاش بیست ڕۆژ پشكنین و ڕاوهدوونان، زانیمان باقی هاوڕێكانی چاخیرجالی له كایاكۆین. ئهوماڵهمان گهمارۆ دا، كه ئهوانی تێدا كۆ ببوونهوه و دهستمان كرد به تهقه. شهڕهكه زۆری خایاند. ئێواره داهات. نیگهرانی ئهوه بووین تاریكدا بێ و ڕا بكهن. ئیتر نهماندهتوانی دیسان بیانخهینهوه داو.

ههوا خهریكه تاریكدا دێ. ڕا دهكهن. دهبێ تهگبیرێكی لێ بكهین و مشوورێكی بخۆین. بیرم كردهوه و چارهیم دۆزییهوه. ده پانزه دهبه نهفتمان هێنا و ماڵهكانی دراوسێیانمان ئاگر دا. دوای ئهوه هێرشێكی بێ ئامانمان كرده سهریان و ئهو ماڵهشمان ئاگر دا، كه ئهوان سهنگهریان تێدا گرتبوو. تهقه له ههردوولاوه بهردهوام بوو. ئهوان له ماڵه نیوهسووتهكهدا بهربهرهكانێیان دهكرد و زهبریان لێ دهوهشاندین. له هاوڕێكانی ئێمه "چۆق مهمهد" پێكرا و كوژرا.

ئهوان دهستیان دهكردهوه، بهڵام لێمان سوور بوو، ناهێڵین دهرچن، یان دهكوژرێن، یان له ئاگرهكهدا دهسووتێن.

## ******* پاشکۆ *******

لە پڕ یەکێکیان لە ئاگرەکە دەرپەڕییە دەرەوە. دەیەویست را بکا، بەڵام دەرفەتمان نەدا و لێمان دا. بریندار بوو و خۆی بەدەستەوە دا. دوای ئەو، یەکێکی دیکە هاتە دەرێ و ویستی را بکا. ئەویش پێکرا و کەوت، بەڵام خێرا هەستایەوە و بەرەو ئاگرەکە رای کردەوە و خۆی لە ئاگرەکە هاویشتوە و لەوێوە هەرای کرد:

- قەت خۆم نادەمە دەست تۆ عوسمانیی...

بەو شێوەیە هەموو هاوڕێکانی چاخیرجالی لەناو چوون وبڕانەوە. هەر حاجی مستەفا توانیی را بکا و خۆی رزگار بکا.

کاری چاخیرجالیمان یەکلا کردەوە و خۆمان ئامادە کرد بگەڕێینەوە، کە ئەم ڕێزلێنانەم لە لایەن "نازم پاشا" والیی ئەزمیرەوە بەدەست گەیشت:

وەلایەتی ئایدین

ئیدارەی نووسینەکان

ژمارە:

گشتی:

تایبەتی:٦٩٥

بۆ مەئمووری پشکنین و راوەدوونان نەقیب روشدی بەگ

بۆ هەموو گیانفیدایی و ئەو زەحمەتانەی لە پێناوی لەناوبردنی چاخیرجالی و باقی دارودەستکەیدا کێشاوتە و ڕێزت لێ دەنێین و هیوای سەرکەوتنی زیاترت بۆ بە ئاوات دەخوازین. لەگەڵ ئەوەدا تەلەگرافێکیش لە لایەن وەزارەتی ناوخۆوە لەگەڵ ئەم ڕێزلێنانە نێردراوە بۆ پێزانین و سوپاس لە ئێوە و باقی هاوکارەکانت.

## ******* پاخو *******

٢١ی زیلحەجەی ٣٢٩

٢٩ی تشرینی دووەم ٣٢٧

والی: نازم حەسەن تەحسین

دەقی تەلەگرافەکەش ئاوا بوو:

لەم ڕێیەوە، بە بۆنەی گیافیدایی و فیداکارییەکانی نەقیب شوکری و نەفیب روشدی بەگ، کە بۆ لەناوبردنی یاخیی بەناوبانگ چاخیرجالی و تفەنگچییەکانی گیانیان لەسەر دەستیان دانا، ڕێزیان دەگرن و پلەی ئەفسەرییەکەیان بەرز دەکەینەوە و دەینێرینەوە بۆ بنکەی پایەتەخت و لەوێوە پێیان رادەگەیەنرێت. چاوەڕوانیشمان هەیە، ئەفسەرەکانی دیکەش ئاوا لە پێناوی میللەت و مەملەکەتدا تێ بکۆشن و دەرسی وەفاداری بۆ وڵات و فیداکاری لە ڕێگای ئاسایشی مەملەکەت و میللەتدا لەو کەسانەوە فێربن.

***

گۆڕەکەی چاخیرجالی لە دەرەوەی نازیللی، لە دەم ڕێگەکەیە.

گوندییەکان گۆڕەکەی ئەویان لا پیرۆزە و وەك موقبەرەی ئەولیا و پیر و پیاوچاکان دەچنە زیارەتی.

ئەوان باوەڕیان بەوەیە، کە گڵی سەر گۆڕەکەی چاخیرجالی دەرمانی گەلێ دەردانە. گڵەکەی ئەو چارەسەری تۆبەتێ و چەند نەخۆشی و پەتایەکی دیکەشە. گوندییەکان وا دەڵێن.

## ******* پاشی *******

ئـەوە چـەند لەمێـژ سـاڵە چـاخیرجالی کـوژراوە، بـەڵام هێشـتاش کـە گوندییـەکان بـە ڕێگـای تەنیشـت گۆڕەکـەی ئـەودا رادەبـرن، هێشـتا نیـو سەعاتێك ماوە بیگەنیێ، هەرا دەکەن:

"چاخیرجالی ئەفە، چاخیرجالی ئەفە، ئیزن بدە تێپەڕین. بێگانە نین. "



